رۆمان

# ئامەرتات

## نەوزاد مەرگەیی

گەر کەسێك خواستی ئەوەی هەبوو کە لە بەرزیەوە سەیری خەڵك بکات ، ئەوا پێویستە خواستی ئەوەشی هەبێت کە خەڵکی بەردی تێبگرن لە ژێرەوە .

(نەوزاد خالد)

**ناوی کتێب : ئامەرتات**

**بابەت : ڕۆمان**

**نووسینی : نەوزاد خالد صالح( نەوزاد مەرگەیی )**

**تیراژ : ( 500 ) دانە**

**نرخ : ( 4000 ) دینار**

**شوێنی چاپ : چاپخانەی ڕۆژهەلات/هەولێر**

**لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی ( 622 )ی ساڵی 2015ی پێ دراوە**

وەرزی زستان هات و بەفر بارینیش دەستی پێکرد لە دەشت و چیاکاندا ، هەر تاو نا تاوێکیش وەك بارێكی قورس بە لێزمە بەرەو گوێی سوانەکان دەهات و گڵی سەر لێوسوانەکانی رادەمالییە سەر زەوی ، لەنزیك چۆمەکاندا درەختەکانی لەگەڵ بەفر دەبەست و ئاوارەی خەیاڵی دەکردن . لەولاشەوە فرووزەی لاو بە چاوێکی پڕ ئەسریناوی و لەژێر چۆڕاوکەی گوێسوانەی کەلاوەکان وەستابوو ، چاوەڕوانی هاتنەوەی داپیرەی دەکرد تا لە باوەشی بگرێ و هێواش ڕوومەتەکانی ماچ بکات ، باپیرەشی بەگۆچانێکەوە بەرەو ڕووی خەیاڵی لاوی وەستابوو ، کەوتبۆوە ناو دەریای بیرەوەریەکانی ساتی لاوی . لەو کاتەدا پەڕەندەیەك بەسەدایەکی خۆشەوە هاتە بەرچاوەکانی کە ڕووی دەسوڕاند بەرەو لای درەختەکان ، بە خەیاڵی بەهاری پڕ لە گوڵ و گوڵزار سەمای دەکرد ، لەم لا بۆ ئەو لای درەختەکان بازی دەدا تا لەپڕ دوو پێیەکانی سڕبوون ، دنیاش لەگەڵ هاتنە خوارەوەی وردە بەفر وردە وردە بەرەو تاریکی هەنگاوی دەنا ، پاش چەند چرکەیەك تاریکی ڕووی دنیای داپۆشی و داپیرەش دەرکەوت کە بەرەو لای کەلاوەکە دەگەڕایەوە ، هەندێ چیلکە داری لەکۆڵ نابوو بۆ ئاگرکردنەوەی شەو لەبری چرا ڕەشکە بێ نەوتەکەیان ، گۆزەیەکی پڕ لە ئاویشی بەدەستەوە گرتبوو ، فرووزە بە بینینەوەی داپیرەی زۆر شادمان بوو ، خێرا بەرەو ڕووی داپیرەی هەنگاوینا تا زووبگاتە لای و کەمێك لە ماندووبوونی داپیرەی کەم بکاتەوە . فرووزە بەدەم ڕۆیشتنەوە بەردەوام بوو ، لەپڕ ڕێگاکەی هەڵە کرد ، چونکە بەفر ڕێگاکانی داپۆشیبوو ، لەو ڕێگایەی کە گرتبوویە بەر داپیرەی تادەهات دوورتردەکەوتەوە ، ئەوەندە دوورکەوتەوە کە داپیرەی وەك قەلە ڕەشەیەك دەهاتە بەرچاوەکانی ، بەڵام فرووزە بەردەوام بوو لە ڕۆیشتنەکەی خۆی ، بۆیە ڕێگاکەی فرووزە کۆتایی نەهات تا کەڵەشێری سبەی دەنگی گەیشتە چیاکانی دەوروپشتی . کاتێ خۆر لە پشت هەورەکانەوە ڕۆشنایی بە زەوی بەخشی ، بینی کە نە باپیرە و نە داپیرە و نە کەلاوەی لێ وەدیارماوە ، لە جێگای خۆی ئەژنۆکانی شل بوون و کەوت بەزەویدا ، تادەهات بەفریش زیاتر بەگڕووتینەوە دادەباریە سەر پشتی زەوی ، ئەوەندەی نەمابوو بەفر لاشەی سڕبووی داپۆشێ ، هەر چۆنێ بێت هێزێکی دایەوە بەرخۆی و سەیری ئاسمانی کرد کە چۆن کلۆ بەفرەکان دێنە خوارەوە و ڕوومەتی زەوی سڕدەکەن ، نەك کلۆیەك بەڵکو هەزاران کلۆ لە کاتێکدا دەکەوتنە سەر دار و دەوەنەکان ، خەمێکی فرووزە بوو بە سێ خەم ، بێجگە لە بینینەوەی داپیرە بەڵکو

بینینەوەی پاپیرە و کەلاوەش هاتە سەر شانی .

بەو پەڕی توانایەوە هێزێکی تری دایەوە بەرخۆی و هەستایەوە سەر پێیەکانی تا بە دیدەنی خۆزگەکانی شاد ببێتەوە ، لەو کاتەدا پەڵەیەکی ڕەشی هاتە بەرچاو کە وەك تارمایەك جارجارە خۆی نیشان دەدا و لە پڕ خۆی لێ ون دەکرد ، بەمەش سامێك چۆوە ناو هۆشی فرووزە کە تاڵە مووەکانی سەری گرژکردن ، لە دوای فکرکردنەوەیەکی کەم ویستی بچێت بەلای پەڵە ڕەشەکەوە ، چونکە وای فکر لێکردبۆوە کە ڕێنیشاندەری بێت بۆ گەیشتنەوە بە دیدەنی خۆشەویستەکانی ، تا دەڕۆی زیاتر نائومێدی دایدەگرت و پێیەکانیشی لەبەر سەرما و بەفر تەزیبوون و سوور هەڵگەڕابوون .

بەڕێکەوت و ڕێگاکەی کەوتە چیایەك لە چیاکانی دەوروپشتی ، ئەو شوێنەش کە بەفر و سەرما ڕووی داپۆشیبوو ، هەموو ڕێگای چیاکەشی بەستبوو ، تارمایە ڕەشەکەش لەسەر لووتکەی چیاکە خۆی نیشان دەدا و جار جارە سەدایەکی گریانی لێوەدەهات ، فرووزەش زیاتر هێزی دەدایەوە بەرخۆی بۆ سەرکەوتنە سەر چیایەکە ، ئەوەندەی هەوڵدا تا هێزی لێبڕا و کەوت بە زەویدا ، چاوەکانی کەمێك تروسکاییان تێدا مابوو بۆ بینینی لووتکەی چیاکە و تارماییە ڕەشەکە ، تاریکایی ئێوارەش وردە وردە بەرەو ڕوخساری ناوچەکە دەهاتەوە و شنە بایەکی لەدوای خۆی دەهێنا ، هەرچەندە ناوچەکە تاریك دەبوو ، بەڵام سپیەتی بەفرەکەش وەك مۆمێکی گەشاوەی لێهاتبوو بۆ بینینی ئەمبەر و ئەوبەری چیاکان ، ئەژنۆکانی کەوتبوونە لەرزە و برسیەتیش تەنگی پێهەڵچنیبوو ، ناچار بۆ هێورکردنەوەی سکی برسی کەوتە خواردنی گیاوگژی ژێر پارچە سەهۆڵە بەستراوەکان ، ئەم شەویشی وەك شەوی پێشوتر بردەسەر .

کاتێك کە دنیا ڕووناك بۆوە هەستا ئەم ناوچەیەی بەجێهێشت و ڕوویکردە شوێنێکی تری دەوروپشتی چیاکە ، گەیشتە نێوانی دوو چیا ، کە لە نێوانیاندا چۆمێکی بچوك هەبوو ، لەوبەری چۆمەکەوە کەلاوەیەکی بەدیکرد ، وردە وردە لێی نزیك بۆوە ، سەیری ناو کەلاوەکەی کرد . ئافرەتێکی بەساڵاچووی بێهێز لەناو کەلاوەکەدا دۆش دامابوو ، ئافرەتە بەساڵاچووەکە چاوەڕوانی مرۆڤێکی دەکرد تا گوێیەکانی بۆ ڕادێرێ و نهێنی ژیانی خۆی لەلا هەڵڕێژێت ، هەر

**که چاوی به فرووزه کەوت خۆشی کەوتە ناو دڵیەوە و بەخێرایی هەستا و بەرەوپیریەوە چوو ، دەستیگرت و هێنایە ژورەوە ، کەمێك خواردنی هێنایە بەردەم ، فرووزە لەتاو برسیەتی بە خێرایی دەستی درێژکرد و کەوتە خواردنی .**

**فرووزە لە خواردنەکەی بۆوە ، ئەمیش دەستیکرد بە پرسیارکردن لە فرووزە .**

**– ناوت چیە ؟**

**– فرووزە .**

**– ئەی تۆ ؟**

**– ئارەزوو .**

**ئارەزووی بەساڵاچوو ، سەیرێکی دەم و چاوی فرووزەی کرد ، بینی کە ئەمیش وەك ئەو مەینەتیەکانی ژیان تەنگی پێهەڵچنیووە ، بەبێ ئەوەی فرووزە پرسیاری لێبکات ، دەستیکرد بە گێڕانەوەی نهێنی ژیانی خۆی .**

**کاتێ کە منداڵ بووم خێزانەکەم لە بەر پەیداکردنی بژێوی ژیان ڕوویان لەم ناوچەیە کرد ، باوکم ڕۆژانە خەریکی ئاژەڵ ڕاوکردن بوو لە چیاکان ، دایکیشم کارەکانی ماڵەوەی بە ئەنجام دەگەیاند ، منیش لە ماڵەوە یارمەتی دایکم دەدا لە کاری ڕۆژانەدا.**

**– من هیچ کەسێك نابینم .**

**– ڕاستە . تۆ نایانبینی ، بەڵام من دەیانبینم .**

**– چۆن دەیانبینی ؟**

**– برایەکی بچوکم هەبوو ناوی هیوا بوو کە پێی نابۆوە قۆناغی لاویەوە ، ڕۆژانە خەریکی یاری کردن بوو لەناو دەوەنەکاندا ، هەروەها جارجارە دەچوو بۆ ڕووخی چۆمەکە و سەیری سیما ڕەنگاوڕەنگەکانی دەکرد و گوێی لە هاشەی ئاوەکە ڕادەگرت ، پاشان دەگەڕایەوە ماڵەوە و دیمەنی شتەکانی دەخستە ناو هۆشیەوە ، دواتریش دەستی دەکرد بە پرسیارکردن ، بۆ وەڵامی پرسیارەکانیشی ڕوویدەکردە من ، منیش بە هێواشی وەڵامم دەدایەوە ، چونکە زۆر ئارەزووی لە فێربوون بوو تا لە شتەکان تێبگات ، بەردەوام ڕوویدەکردە تەنیایی و هۆشی دەچۆوە ناو دیمەنەکانەوە ، هەندێ جار نائومێدی دایدەگرت و لە سوچێکەوە خەوی لێدەکەوت .**

**بەیانیەك لە وەرزی زستاندا بەفر ڕوومەتی ناوچەکەی سپی کردبوو ، ئاوی چۆمەکەش وا**

**زیادی کردبوو کە هاشەی دەنگی دەگەیشتە بناری چیاکان ، ئەمیش هەستا ، چوو بەرەو ڕووی چۆمەکە ، لەپڕ پێیەکانی هەڵخلیسکا و کەوتە ناو چۆمەکەوە .**

**– چی لێ بەسەرهات ؟**

**– خنکا ، بەڵام بەداخەوە نەمان توانی تەرمەکەی بدۆزینەوە .**

**دوای گێڕانەوەی ئەم بەسەرهاتە ماوەیەك لە قسەکانی وەستا و فرمێسك بە ڕوومەتەکانیدا دەهاتنە خوارەوە وەك تازە ڕووداوەکەی بینیبێت.**

**– ئەی دوای ئەمە ؟**

**– سبەی داهاتوو باوکم لە کەژوکێوەکان گەڕایەوە ، هەر کە هەواڵەکەمان پێدا لەتاو براکەم ئەژنۆکانی شل بوون و لەجێگای خۆی کەوت بەزەویدا ، پاش چەند چرکەیەك هەستا و هەتا هێزی تێدابوو دەستەکانی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و پڕ بە دەنگی هاواری کرد ، بەڵام تا ئێستا نەمزانی چی وت ، تەنیا ئەوەندە نەبێت .**

**– چی وت ؟**

**– ئێمەش مەلەوانێکین و لە هەوادا مەلە دەکەین .**

**لەتاو براکەم ، باوکیشم لە جێگای خۆی گیانی دەرچوو . لەو کاتەوەی کە بێ باوك و برا ماینەوە هەموو خۆشی و شادیەکانمان وەك خەنجەرێکی لێهاتبوو کە هەردەم بە گەروومان دابهێترێت .**

**– دوای ئەمە چ گۆڕانکاریەك لە ژیانتدا ڕوویدا ؟**

**– خوشکێکیشم هەبوو تازە پێیی دەنایە قۆناغی لاویەوە ، ناوی ڕۆژگار بوو ، لە خۆم بچوکتر بوو . ئەمیش پرسیاری زۆری دەکرد ، پرسیاری زۆری لەناو هۆشدا دروستببوو . هەموو پرسیار و گومانەکانی دەربارەی ژیان بوون ، وەك: ئێمە کێین ؟ چۆن دروستبووین ؟ مرۆڤ چیە ؟ ژیان چیە ؟ گەردوون چیە ؟ مردن چیە ؟ لەولاوە منیش وەڵامێکی کورتم دەدایەوە بۆ هەموو ئەو پرسیارانەی کە دەیکرد ، گەر بهاتبایە و وەڵامێکی زۆرم بدابایەوە ئەوا دەبوو هەموو کاتەکانی خۆمم بۆ تەرخان بکردبایە ، هەر بۆیە فکر و هۆشی بەردەوام لە سروشت بوو . بە کۆمەڵێك پرسیاری بێ وەڵام دەگەڕایەوە بۆ سەرەتای دیمەنەکان ، کە وەڵامی پرسیارەکانی بێکۆتایی بوون و هەرگیز کۆتاییان نەدەهات .**

ڕۆژانە بەم شێوەیە خۆی سەرقاڵ دەکرد تا کاتێك خەو بەسەر چاوەکانیدا دەهات ، کاتێك کە بە خەبەر دەهات بگرە هەر لە چۆنیەتی ڕۆیشتنی پێیەکانی خۆشی دەکۆڵیەوە ، کاتێکیش کە بێزار دەبوو ڕووی لە سەرچاوەی کانیاوەکان و نەمامە درەختەکان دەکرد کە بێگومان ئەویش خۆی گومان و پرسیارکردن بوو لە گەشەکردن و چۆنیەتی سەرهەڵدانیان بۆ ئەو ، تا ڕۆژێکیان ئەوەندە پرسیاری کرد لە دایکم تا ئەمیش لێی بێزار بوو .

شەوێکیان هەر بەم شێوەیە دەستی پێکردەوە تا درەنگانی شەو ، تا هێزی لێبڕا و خەو چووە سەر پێڵوی چاوەکانی .

بەیانی ئەو شەوە لە خەو هەستاین تا درەنگانێك بەخەبەر نەهات ، زۆر لەلامان سەیر بوو کە کاتەکەی زۆر درەنگی کردووە و هێشتا لەخەو هەڵنەستاوە .

– بۆچی بێدەنگ بووی ؟

– کاتێ کە دایکم چوو خەبەری بکاتەوە بینی کە گیانی دەرچووە و لاشەی ناسکی جووڵەی لێبڕاوە ، لەو کاتەدا پڕ بەدەنگی هاواری کرد و سێ جار بانگی منی کرد ، ئارەزوو — ئارەزوو — ئارەزوو ، کە چووم بەلایەوە بینیم دایکم دەست و پەنجەکانی سڕبوون ، دەستەکانی لەسەر سینگی خوشکەکەم دانابوون و بەکوڵ دەگریا و فرمێسکەکانی دەم و چاوی خوشکە ڕۆژگار نەدیتەکەمی تەڕکردبوون ، وەك ڕژێنەیەکی باران دابێتی لەسەر کوڵمەکانی .

کە چاوم پێکەوت لەتاو ئازاری دڵم و ڕووخساری خوشکەکەم لەسەر کەڵەکی بەردەم کەلاوەکەمان بەربوومەوە و لە هۆش خۆم چووم ، بەم شێوەیە کۆتایی بەژیانی خووشکەکەشم هات ، هەموو ئەو پرسیارانەی کە دەیکرد دەربارەی ژیان کۆتاییان بە هەناسەی هێنا .

ماوەیەکی کەمی پێچوو پیری و لاوازی ڕووی دایکمی داپۆشی و دوو دەستەکانی کردنە قوربانی دارگۆچانێك و ژیان بەرە بەرە پۆلووی گەشاوەی لەبن پێیەکانی دادەنان ، دواتر دایکیشم بەجێی هێشتم و ماڵ ئاوایی لێکردم .

– هەر لێرەوە ؟

– دوای ئەمە ڕوومکردە دەرەوەی دێهاتەکە و کۆخێکم دروستکرد دوور لە ئاوەدانی ، بێکەسی خۆمم بە یەکجاری و تەنها لە دڵی خۆم و لە چاوەکانی خۆمدا هێشتەوە ، لەو ساتە بەدواوە هەتا گەیشتنم بەم تەمەنە ژیانم لەم کەلاوەیەدا دەبەمەسەر ، کە ڕووناکی چرایەك بوو

هەردەم کەسە لەدەستچووەکانمی دەهێنایەوە خەیاڵم و بە بەرگێکی سپی دەیهێنانەوە لام و بە زەردە خەنەیەکەوە لە بەرامبەرمدا دەیوەستاندن ، ئەوانیش جارجارە لە پڕ چاوەکانی منیان دەبردە لای خۆیان و نەشونمای بەهاریان نیشان دەدام . کاتێك کە سپێدەی بەیان سەری وەدەردەنا چاوەکانم دەچوونەوە ناو ژیانی سپڵە و ئەسرین کوڵمەکانی تەڕ دەکردم ، هەناسەی ژیانیش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەرۆکی دەگرتم و وەکو گورگێکی برسی بەردەرکی کەلاوەکەی لێدەگرتم ، بەلاّم زیاتر هێزم دەدایە بەر خۆم تا ڕووبەڕووی ژیان بووەستمەوە ، لە ڕۆژێکدا کە خۆری بەهار تازە سەری وەدەردەنا ، هەستامە سەر پێیەکانم و سەیرێکی سروشتم کرد تا بەڕووی ئاشنابم و بیکەم بەهاوڕێی خەمی دڵی خۆم ، بەلاّم تا دەهات زیاتر لێم دوور دەکەوتەوە و بە تارماییەکی ڕەشەوە ماڵئاوایی لێدەکردم .

ڕۆژیك هەوڵمدا باخچەیەکی خنجیلانە لەبەردەمی کەلاوەکەدا درووست بکەم ، تاوەکو بۆن و بەرامەی درەختی بەهار لە شەودا ببنە میوانی کەلاوەکەم . لە کاتێکدا سەرقاڵی ڕواندنی نەمامەکان بووم تا ئاشنایان بکەم بە خاکی بەردەمی کەلاوەکەم ، زۆری پێنەچوو لەناو باخچە ساوایەکەدا وەنەوز بەسەر چاوەکانمدا هات ، لە لێلاّیی چاوەکانمدا بینیم درەختەکان ڕوان و دەستیان بە نەشونما کرد ، دواتر چوار گوڵم بەدیکرد ، بۆنی گوڵەکان وردە وردە لە دەرگای ڕووخسارمیان دەدا و بەقاقایەکی پێکەنینەوە بە چواردەورمدا دەهاتن و دەچوون ، هەورێکی ڕەشیش پەلەقاژەی بوو تا زوو بگاتە سەریان و پەڕە ناسکەکانیان هەڵبوەرێنێت ، بەلاّم پێش گەیشتنی هەورەکە گوڵەکان دیار نەمان ، لەگەڵ ڕۆیشتنی ئەوان بۆنە خۆشەکەش نەما و درەختەکانیش بێگەلاّ مانەوە ، دواتر بای باراناوی دەستی پێکرد و کاتەکەی کرد بە هەرایەکی دووژمنانە لەگەڵ درەختەکان ، کە درەختەکانی لە ڕەگەوە هەڵدەکەند و دووژمنانە ڕایدەماڵین ، کە گەڕانەوەیان ئەستەم بوو .

– تۆ ئەمەت چۆن بینی ؟

– پاشان بە خەبەرهاتم و سەیرێکی دەوروپشتی خۆمم کرد هیچ شتێکم لەو جۆرە ڕووداوانە بەدینەکرد ، دواتر سەیرێکی خۆمم کرد بینیم کە هەموو گیانم بە ئاو تەڕ ببوو ، ئەویش ئەو ئاوە بوو کە لە کاتی ماندوو بوونمدا لەشم دەریکردبوو ، هەر لەدوای ئەم ڕوداوەوە دەستم لە هەموو شتێك بەردا و هیواو و ئارەزووەکانم لە خەیاڵی خۆم وەدەرنان بۆ ڕۆژگارم بەجێهێشت ،

چونکە تێگەیشتم کە ژیان بریتییە لە خەون و مردنیش بریتییە لە خەو ، بەڵام هەتا ئێستا کەس لەو خەوە بەخەبەر نەهاتووە ، هەربۆیە پێویست ناکات مرۆڤەکان لووتیان بەرز بێت لە ئاست یەکتردا ، ژیانیش لە لای من بۆتە ناخۆشترین و قێزەونترین کات . ژیان ڕوو بە ڕووی مرۆڤ خۆشەویستی دەنوێنێ ، لە ژێرەوەش ڕوخساری وەك کۆتەرە دارێك پیر دەکات و دەیکات بە پوشویەك و ئاگری نەبڕاوەی دەخاتە بن پێیەکان ، دواتریش بەبێ بەزەیی لەناویدەبات و دەیمرێنێ ، هەربۆیە ژیان پڵینگێکە بەدوای نێچیرە لاوازەکاندا دەگەڕێت و پڕ بەچنگی گەروویان دەگرێت و کۆتاییان پێدەهێنێت .

– ئایا مانای ژیان چیە بەلای تۆوە ؟

– ژیان بەلای منەوە مانای خەونێکی چەند چرکەییە ، مرۆڤەکانیش وەك کۆمەڵێك تەیرن ، کە پۆل پۆل دەڕۆن و ڕوو دەکەنە ناوچەیەك ، ئەو ناوچەیەش پڕی گوڵ وگوڵزار بێت وچواردەوریشی بە دار و دەوەن گیرابێت ، دارەکانیش ئەوەندە بەرز بن کە تیشکی خۆریان لەزەوی دەوروپشتیان شاردبێتەوە ، هەر تەیرەو هێلانەیەك لەسەر دارێکیان بکات و ببنە هاوسێی یەکتر، کاتی دەمەو ئێوارە هەریەکەیان بچێتەوە لانەی خۆی و بۆنی درەختەکان مەستی بکات تا خەو چاوەکانی دەباتەوە ، لەگەڵ سپێدەی بەیانیش هەریەکەیان بە ئاوازێك ناوچەکە بڕازێننەوە ، هەر لەگەڵ گەرم داهاتنی زەویش بەتیشکی خۆر هەریەکەیان لە شەقەی جووتباڵی بدات و بچێت بۆ ناوچەکانی دەوروپشتی ، تێر بە ئارەزووی خۆی سەیری دەشت و چیاکان بکات و گەمە لەگەڵ پەڕەی گوڵەکاندا بکات ، بەڵام خۆزگە .

– خۆزگە چی ؟

– ئەو کاتەی کە دەگەڕایەوە ناو لانەکەی ، هیچ فرمێسکێك نەدەکەوتە سەر دارەکان ، چونکە لەتاو ئازاری ئەو فرمێسکە ژیان کۆتایی پێدێنێت .

خۆزگە هیچ هەنگێك لە سەر پەڕەی گوڵەکان وەنەوزی نەدەدا ، چونکە پەڕەکانی کون دەکات ودواتر لاسکەکەی دەڕزێنێت .

خۆزگە بە تەیرێکیش کە ئیرەیی بەلانەی هاوسێکەی نەدەبرد ، چونکە لە کۆتایدا تەیرێك بەتەنیا دەمێنێتەوە و یاری پێ لەگەڵ هەموو گوڵەکان ناکرێت . ڕووی سوڕاند بەرەو دارە ڕزیوەکانی کەلاوەکە و ماوەیەك بێدەنگ بوو ، دواتر دەستی خستە سەرشانی فرووزە و پێیوت

: گوێیەکانتم بۆ هەڵخە با شتێکت فێرکەم .

– چ شتێك ؟

– ڕۆژێك تەیرێکم بینی کە خۆی جیاکردبۆوە لە تەیرەکانی تر ، دەیوویست لە هەوایەکی بەرزتر بفڕێت و تەیرەکانی تر شەیدای خۆی بکات ، لە هەموو شوێنە بەرزەکانی ناوچەکە دەستی کردبوو بە فڕین و سەدای دندوکی سووری ناوچەکەی پڕکردبوو لە ئاوازی قێزەون ، ڕۆژ دوای ڕۆژ تا دەهات گیانی گەرمتر دەبوو ، لە خۆباییەکەی وایلێکردبوو کە لە کاتی نیشتنەوەشی لە شوێنێکی بڵندتر بنیشێتەوە ، دوور لە تەیرەکانی تر هێلانەیەکی کردبوو ، تاوەکو هیچ تەیرێك نەچێت بەلایەوە ، تەمەنی بەرەو پیری دەڕۆیشت و هێشتا لەسەر ئاکارەکانی خۆی بەردەوام بوو ، بەڵام ئەو پێی وابوو کە ژیان پیر دەبێ نەك ئەو . کاتێك کە بێچووەکانی دندوکیان لێکدەکردەوە لە برسان ، ئەوکاتە وای دەزانی کە بێچووەکانی بەباڵەکانی ئەو سەرسام بوونە و لە بەر جوانی ئەو کەوتوونەتە سەما .

کاتێك کە دەڕۆیشت بەرەو ئاسمان تا تواناکانی خۆی نیشان بدات و لەبەرزیەوە سەیری زەوی بکات ، بێچووەکانی یەك یەك دەمردن و لەسەر هیلانەکە بەردەبوونەوە سەر زەوی ، تا وای لێهات هێلانە بەبێ بێچوو مایەوە .

– ئاکارەکانی تاسەر بوون ؟

– ڕۆژێك ویستی بەرزبێتەوە و ئاکارەکانی پێشووتر ی دووبارە بکاتەوە ، بەڵام باڵەکانی بەر پەلەدارێك کەوتن و کەوت بەزەویدا ، کولەمەرگی سینەی گرت و چاوەکانی پێداخست .

– بۆچی بەوڕۆژە گەیشت ؟ تەنها لەبەر لەخۆباییەکەی بوو ؟

– ژیان مەودا نادات بەهیچ کەسێك کە تاسەر لەخۆشیدا بژ ی ، مەودا نادات بە کەسێکیش کە تاسەر بالأدەست بێت و کۆیلەی بێ پشوو بچەوسێنێتەوە ، هیچ کەسێکیش تاسەر بەکۆیلەیی نامێنێتەوە ، هەرچەندێك لەژیاندابی خونچەیەك نابینی کە دوو گوڵی لێبێتەدەر ، بەڵکو هەریەکەیان لە خونچەیەکەوە سەر دەردێنن و هەریەکەشیان لە کاتێکی دیاریکراودا کۆتایی پێدێت ، لانەی هیچ زیندەوەرێکیش بۆ زیندەوەرێکی تر ناشێت ، مەگەر بە زۆرداری نەبێت .

چاوەکانت بسوڕێنە بەرەو ڕووی چیاکان دەبینی کە هیچ کامیان وەك یەك ناچن ، بەڵکو یەکێکیان بەرزەو یەکێکیان نزمە ، یەکێکیشیان لەناوەڕاستی هەردووکیان وەستاوە و سەیری

**هەردووکیان دەکات ، ئاوی هەموو کانیاوەکانیش وەك یەك زۆرنین هەرچەندە ئاوێکی کەمیشیان لێ دێتەدەر ، بۆیەشە نەهەنگ بۆ کانیاوەکان ناشێت ، بەڵکو دەبێ لەناو زەریاکاندا مەلە بکات ، کەسێکیش کە نەزانێ لەکوێ دەژیت ئەوا ناشزانێت چۆن ژیان بەدەست بێنێت ، ژیانیش کاتێ بەردەوام دەبێت کە مرۆڤ کردارەکانی خۆی وەگەڕبخات ، مرۆڤ وەك مورووی ئاش وایە و ژیانیش بەردەئاشە لەسەری دانراوە ، زۆر زرنگ نەبێت ئەوا لەت لەتی دەکات و لاشەی دەکاتە تۆزی بیابان ، ژیان زەریایەکە هەموو کەس ناتوانێ مەلەی تێدابکات ، ئەوکەسەی بەبێ لێهزرین بچێتە ناوی ئەوا زوو دەخنکێت .**

**– ژیان چ زەریایەکە بەلای تۆوە ؟ چونکە لە کەمێك ئاو بەولاوە هیچی تر نابینم .**

**– مەبەستم پێ لە ژیانە .**

**– کام ژیان ؟**

**– ئەو ژیانەی کە چەندەها کەسی وەك من و تۆی سەرگەردان کردووە و چەندەها کەسی تریشی خۆشبەخت کردووە .**

**– ئادەی من تێناگەم لە مەبەستەکەت !**

**– ژیان ئا بەمشێوەیەیە کە ئێستا ڕەوانەی هۆشتی دەکەم . ئەوانیش بریتیین لە سێ کەس . کەسی یەکەم ئەوەیە کە دەربارەی ژیان کەمێکی بیستوە و دەچێتە ناوی ، ئەوا کەمێك خۆڕادەگرێت و دواتر دەخنکێت .**

**کەسی دووەم کە سەیری دەکات و پاشان دەچێتە ناوی ، ئەوا دەگاتە نیوەی و دەخنکێت .**

**کەسی سێیەم ئەوەیە کە هزرینەکانی خۆی دەربارەی خستۆتە گەڕ و دەربارەی بیستوە و سەیری دەکات ئینجا دەچێتە ناوی ئەوا ئەو کەسە زانایە و لێی دەپەڕێتەوە .**

**گەردوونیش بەهەمان شێوە تەنیا پێك نەهاتووە لەزەوی ، بەڵکو هەسارەی تریش زۆرن و ئێمە تەنیا کەمێکیان دەبینین و ئاماژەیان پێدەکەین ، بەلاّم نازانین ژیان چۆنە لەو هەسارانە ، بەلاّم ڕۆژێ دادێت مرۆڤ زۆربەیان دەپشکنێت . زەویش چەندەها چیای تێدایە ، بەلاّم تەنیا چیاکانی دەوروپشتمان دەبینین ، نازانین چیاکانی تر چۆنن و چەندە بەرزن ، بەلاّم دەتوانین بەدوایاندا بگەڕێین و بەئاسانی بیانبینین ، هەروەها لەسەر ڕووی ئەم زەمینە چەندەها جیاوازی هەیە ، هەندێکیان لەناو زەریادان و تینویانە ، هەندێکیشیان خاوەنی هەزارەها**

**باخچەن و بۆ باخچەیەکی بچوك دەگریەن ، هەندێك دەگرین تا لە دوارۆژدا پێبکەنن و لەبەر سێبەری درەختەکان سەما بکەن ، هەندێك خۆشی و وەنەوز لەناو دەبەن تا یەکسانی بۆ زیندەوەرەکان دروستبکەن ، هەندێکیان وەك نەهەنگ وان و ماسیە وردەکان دەخۆن تاوەکو مانەوەی خۆیان مسۆگەر بکەن و گیانی خۆیان لە لەناوچوون بپارێزن ، لەناو مرۆڤەکاندا کەسانێك  هەن وەك سپیدار هەڵدەچن و درەختە وردیلەکانی چواردەوریان لە بەر سەرماو سێبەری خۆیان دەکوژن و لەگەڵ بەرزی کێوەکان لە پێشبڕکێدان ، لەبەرامبەر ئەو هەموو چینانە ، منداڵێکی بەرگ دڕاو و پێڕووت دەپرسێت : ئایا کەی ئەو ئاکارانە کۆتاییان دێ ؟  ئایا کەی ڕۆژی نوێ بە یەکسانی تیشکی دەداتە پەنجەرەی هەموو ماڵەکان ؟  ئایا کەی دەبێ ڕۆژێك بێ تیشکی ڕۆژ ئەوەندە بەهێز بێ سەروملی درەختە بەرزەکان هەڵبپڕوکێنێ ؟ لەو لاوە منداڵێکی بەنازپەروەردەش پرسیار دەکات : ئایا تاکەی دەبێ فەلەك بەمشێوەیە دەوران بکات و من هەر خۆشبەخت بم لەناویدا ؟**

**– تایبەتمەندی پێڕووت و بەنازپەروەردە جیاوازیان چیە ؟ کە تۆ چەند پرسیارێکی پێڕووتت هێنایە بەرامبەر پرسیارێکی بەنازپەروەردەیەك .**

**– دەبینین ، کە چەندەها پرسیار لەهۆشی پێڕووتێك سەرهەڵدەدەن ، بەلام تەنیا پرسیارێك دێتە ناو هۆشی پووچەڵی بەنازپەروەردەیەکەوە ، چونکە ژیان تەنگی بە پێڕووت هەڵچنیوە و جۆرە مەیەکی بە گەروودا کردووە کە نەتوانێ بە ئامانجەکانی بگات ، تەنانەت هەر بەوەش نەوەستاوە ، بەڵکو هەموو هیوا و  ئارەزوویەکی نەهاتەدی خستۆتە ناو هۆشەوە و خەوی ناو کەلاوەی لێ تاڵ کردووە ، چۆڕاوکەی شەوانەی تك تك بەرداوەتەوە سەر ڕووخساری و هێمنی خەوی لێ سەندۆتەوە ، بەلام بە پێچەوانەوە شانی بۆ بەنازپەروەردە شل کردووە و فەلەك بە هەوەس ئاسای ئەو هەڵدەسوڕێ ، لەبری تاڵی هەنگوینی لەبەردەم داناوە و بەردەوام دەیلاوێنێتەوە ، چەند بەندەشی بۆ خزمەتکردنی داناوە ، تا بیخەنە سەر کەژاوەیەك و هەوارگە بە هەوارگە بیگێڕن ، لەگەڵ ئەوەشدا ئارەزووی هەر نیشتگەیەکی کرد بۆی ئامادەیە و بە پەنجەیەك ئاماژە بۆ ناوچەیەکی سروشت دەکات ، ئەمیش دەستبەجێ دەگەیەنرێتە ئەو سروشتەو بە ئارەزووی خۆی گەمەی لەگەڵدا دەکات ، ئا بەم شێوەیە سروشت مرۆڤەکانی کردوون بە چەند کۆمەڵە و هەریەکەیانی هەڵداوەتە پێدەشتێکەوە ، بە بێ پرسیارکردن**

هەریەکەیان دەدوێنێ و ڕەوانەی ناو ئاکارێکیان دەکات کە خۆیان هیچ سوچێکیان نیە لەو ڕەوانەکردنەدا .

فرووزە بەرەو لایەکی تری چۆلەوانیەکە ڕۆیشت کە نزیك بوو لەو شوێنە . گەیشتە پشتی چیایەك ، لەو شوێنە کەلاوەیەکی تری بەدیکرد .

بینی کەمئەندامێك لە ناو کەلاوەکەدا دەژی و خۆی دوور خستۆتەوە لەناو جڤاك و دوور لە ئاوەدانی ژیان بەسەر دەبات . هەر کە چاوی بە فرووزە کەوت بەبێ سلاّو کردن بانگی فرووزەی کرد ، فرووزەش بەرەو ڕووی هەنگاوینا ، گەیشتە لای و دانیشت .

کەمئەندامەکە ؛ ناوت چیە ؟

– فرووزە .

فرووزە ؛ ناوی تۆ چیە ؟

کەمئەندامەکە ؛ ئافەریدە .

ئافەریدە ؛ بە چاوەکانت دیارە وەك من ژیان بەتەواوی ئەژنۆکانی شکاندووی و بەدوای دۆزینەوەی خۆشەویستەکانت کەوتووی ، بەلاّم کات ئەوەندە مەودای پێنەداوی تا بەو ڕۆژە بگەی .

– تۆی کەم ئەندام ، لەم چۆلەوانیە چی دەکەی ؟

– من لە کاتی گەنجیمدا پەیوەندیم کرد بە سوپایەك کە سەرۆکەکەی لە ماڵەوە نەدەهاتە دەر و ئاگای لە هۆش و سکی سەربازەکان نەبوو ، من ماوەی چەند ساڵێك لەو سەربازگەیەدا کاتم بەسەر برد ، دواتر بەهۆی ئازایەتی و دڵسۆزیمەوە ڕێزم لێنرا ، چونکە من ئەو کاتە گەنجێکی خوێن گەرم بووم و مردن و بریندار بوونم بە خەیاڵدا نەدەهات ، بەهۆی تێپەڕبوونی کات بووم بە سەرکردەی سوپایەك ، لەو ماوەیە کەمەی کە من بووم بە سەرۆکی سوپا ، تووشی ڕوو بەڕوو بوونەوەی هێرشێك بووم کە هەرگیز وام بە خەیاڵدا نەدەهات کە تووشی ئەنجامێك دەبم کە ڕۆژم بەو ڕۆژە دەگات ، چونکە لەو شەڕەدا سوپاکەم هەمووی لەناوچوو ، تەنیا خۆم

**قوتارم بوو .**

**– تۆ بەتەنیا قوتارت بوو ؟**

**– ماوەیەك بێدەنگ بوو ، دواتر لەبەر خۆیەوە قسەی دەکرد . من کەسێکی دڵسۆز نەبووم ، دادپەروەر نەبووم ، هۆش والاَ نەبووم ، ئەگینا سووپاکەم ئاوهای لێبەسەر نەدەهات و بەو ڕۆژە ڕەشە نەدەگەیشتم .**

**دەستی کرد بە گریان و بە هەموو هێزی خۆیەوە هاواریکرد ، لەو هاوارکردنەشدا دەیوت : کەسێك کە سەرکردە بێ پێویستە لەپێش سووپاکەیدا بکوژرێت ، پێویستە لەپێشەوەی براکانی شەڕ بکات و گۆڕەپانی جەنگ جێنەهێڵت ، بەلاَم من ئەوەم نەکرد و لە پشتەوەی سوپاکەم ڕاوەستابووم و سەیری براکانم دەکرد کە چۆن دەکوژران و وەك گەلاَی دار هەڵدەوەرین .**

**– تۆش وەك من دەتەوێت بەو خۆشەویستە ڕۆیشتوانەت ئاشنا ببیتەوە کە لەدەستت داون ؟**

**– بەڵێ .**

**– ڕووت بسوڕێنە و سەیری من بکە ، تا ئاهی خۆمت بۆ باسبکەم و ژیانە تاڵەکەی ڕابردووی خۆمت پێ بناسێنم ، بۆ ئەوەی بۆ داهاتوو سوودی لێوەربگری .**

**لەو کاتەشدا فرووزە زۆر ماندوو و شەکەت بوو ، دەتوت چەند کەسێك بە زۆر هەناسەی پێدەدەن و چەند کەسێکیش لەپشتەوە بە قامچی لێی دەدەن . ئافەریدەش زۆر بە داماوی و خەم و پەژارەوە سەیری دەکرد .**

**ئافەریدەش لەسەرەخۆ پێی دەوت ، هەرکەسێك قسەی بۆ کردی ، تۆ گوێڕایەڵی بە و پەندی لێوەرگرە ، تۆ لە هۆشتدا بیچەسپێنە و لەیادی مەکە ، منیش وەك تۆ بەمنداڵی کەسێك ئەمانەی پێوتم ، بەلاَم بەهۆی لە خۆبایی و کەم ئەزموونیمەوە ئەم وتانەم بەهەند وەرنەگرت و گوێم پێنەدان ، هەر بۆیەش تووشی ئەم ڕۆژە هاتم . ئەگەر کەسێك شتێکی پێوتی ، تۆ دەربارەی بهزرە و دواتر فێربە بەو ڕێچکەیەدا سەفەرەکەت تەواو بکەیت و خۆت بگەیەنیت بە ئەنجام .**

**فرووزە لەو کاتەدا ، وتەیەکی باپێری بەفکر هاتەوە کە هەموو کات پێی دەوت : ڕۆڵەکەم پێش ئەوەی بچیت بۆ ڕاو پێویستە شوێنەکەی لە هۆشتدا دەستنیشان کرابێ و بەرنامەت بۆ دارشتبێ ، نەك بەبێ زانیاری و بێ ئەوەی بزانی ڕاوکردن چۆنە دەستبکەی بە تەقەکردن**

بەرەو ڕووی نێچیرەکەت .

ئافەریدە یەکێکی تر لە وتەکانی خۆی ئاراستەی فرووزە کرد . هەرگیز مەکەوە ژێر کاریگەری ئەو کەسانەی کە بە چاوێکی دووژمنانەوە لە خاکەکەی خۆیان دەڕوانن ، هەموو کات با فکرەت پتەو بێت ، گرنگ نیە دەمریت یان نا ، گرنگ ئەوەیە کە تۆ خزمەت بە هاونیشتمانەکانت بکەی ، ئەو کەسانەی کە خاك پارێزن تەنیا لاشەیان دەمرێت و لەبەر چاو وون دەبن ، بەلاّم ڕەنگ و دەنگیان هەر دەمێنێت لەناو هۆشی جڤاکدا .

– تۆ بەهۆی ئەم جەنگانەی کە تێیاندا بەشداریتکردووە کەم ئەندام بوویت ؟

– بەلێ .

– ڕابردوو چێژ بەخشترە یان داهاتوو ، بە دیدی تۆ ؟

– ئای ژیان چۆن ڕیسوا بووم لەناو کوچە و کۆلاّنەکانتدا ، ئای چۆن لە کۆشکێکەوە بەرەو کەلاوەیەکت هێنام ، خۆزگە ئەو کاتەی کە گەنج بووم لەناو یەکێك لە شەڕەکانی دووژمندا لەبری بریندارببوونم ، دەکوژرام و دەروونم ئاسوودە دەبوو ، ئای چۆن ئەو ڕۆژە بگەڕێنمەوە و ڕەوشتی خۆمی پێ چابکەمەوە ، فرووزە لەم ئاخ و داخەی سەری دەرنەدەکرد .

– من لەم خۆزگە خواستنەت تێناگەم . کە ئیستاش نەکوژراوی ، بۆچی خۆزگەی پێ دەخوازی ؟ بۆچی خۆزگە دەخوازی بۆ گێڕانەوەی ڕەوشت و داوا دەکەی ژیانت لەسەرەتاوە دەستپێبکاتەوە ؟

– ترسنۆکی لەبەرامبەر دووژمن ئەوەندە شەرمەزارت دەکات کە هەتا ماوی ناشرین ببیت لەناو جڤاکەکەتدا ، بەلاّم گەر سڵنەکەیتەوە و لە مردن نەترسیت لە پێناو خاك و زمانەکەتدا ، ئەوا سەربەرزیەکە کە هەرگیز ولاّتەکەت لە فکری ناچێتەوە ، هەروەها ڕۆژگار وا بە زوویی تێپەڕ دەبێت کە هۆشیار نەبیت و نەزانی ژیانی تێدا بکەی ، هەروەها گەر بە هەوەنتە بیدەیتە بەر ، ئەوا ئەویش بە هەوەنتە ڕاتدەگرێ و شەرمەزارت دەکات . ڕەوشت و جوانیت ناهێلێت و لەبەر چاوی جڤاکەکەت بە چەپڵە لێدانەوە دەروونت تێکدەدات ، هەربۆیە ژیان ساتێکە دێت و دەڕوات ، گەر پێی ئاشنا نەبیت جەستەت دەشێوێنێ .

من ئێستا پیری بەرۆکی گرتووم و مەرگیش هەڕەشەم لێدەکات ، بەلاّم ناتوانم لەبەری هەڵبێم ، چونکە لە هەر شوێنێك بم ئەوا هەر پیرم و ناتوانم خۆم بهێنمەوە سەر باری لاوی ، بۆیە شەو

و ڕۆژ فکرم لای ئەو کەسانەیە کە ئێستا لە جێگەی من سوپا هەڵدەسوڕێنن ، ئایا دەبێت ڕۆژگار ئەوانیش وەك من سەرگەردان بکات ؟ یان ئەوان لە من هۆشیار ترن و دەزانن ئاکامی ژیان چۆنە ، بەلاّم من لەوە دڵنیام کە یەکجار شکستهێنانت فێرگەیەکە کە بۆ دووەم جار تووشی نابیتەوە ، بەلاّم .

– بەلاّم چی ؟

– بەلاّم من چەند جار تووشی بووم و نەمزانی کاری پێبکەم ، چونکە ئەویش وەك ئەڵقەیەك دێتە ناو پەنجەت ، گەر پسا ئەوا شوێنی خۆی وون ناکات لە دوای چاککردنەوەشی .

– یانی چۆن ؟

– لە کاتێکدا کەسێك دەبێتە پادشا لە شوێنێك ، ئەوا ڕۆژگاری ئەو شوێنە بەشێوەیەکی تر دەستپێدەکات ، هەموو بەرنامەیەکی پێشوو کۆتایی پێدێت و سەرلەنوێ بەرنامەیەکی تازە لەدایك دەبێت ، هەروەها هەموو لایەنگرێکی کۆن کۆچی پێدەکرێت و لایەنگری تازەش شوێنی دەگرێتەوە ، گشت خەڵکی تووشی سەردەمێکی تازە دەبن ، ئەو سەردەمەش هەنگاونانی باش بێت یاخود خراپ ، بەلاّم کۆیلەیی هەردەمێنێ تا پادشای زاڵم بوونی هەبێت ، دارودەستەی هۆش پووچیش دەمێنێ تا خەڵکی ساوێلکە بوونی هەبێت ، کەسانێکیش لەولاوە بەنیازی ئەوەن کە ڕۆژگار باری کەش و هەوای وڵات بگۆڕێ بۆ کەش و هەوایەکی باشتر ، لەولاشەوە ڕەگەزی مێینە چاوەڕێی ئەوەن کە ڕۆژێك دابێت هاوشانی پیاوان سەیریان بکرێت ، بەلاّم هیچ لەمانە ڕوو نادەن تا ڕێبەری زۆردار لەسەر نیشتگەی بریقەداری پادشایەتی دانیشتبێت ، چونکە هەموو شتێکی وڵات بۆ ئارەزووەکانی ئەو دەوران دەکات و کەسانی ناو جڤاکیش ڕۆژ دوای ڕۆژ لە هەوڵی ئەوەدان کە ئەم بڕوات و یەکێکی تر زوو بێتە جێگەی ، هەموو ئەم ئاکارانەش کاتێك کۆتاییان پێدێت ، کە مرۆڤێکی سادە و داوێن پاك بێتە جێگای ڕێبەرەکان ، ئەم دنیایەش بۆ هەموو کەسێك ئافرێنراوە ، نەك تەنیا کەسانێك کە خۆیان بە هەڵبژێردراوی دنیا دەزانن .

– کەسانی سوود بەخش لەم ناوەدا کێن ؟

– کەسانێك لەم ژیانە سوود وەردەگرن و دەتوانن هۆشیان پڕ بکەن لە ئەزموونی جۆراو جۆر ، کە خۆیان بەدڵ بڕیاری ئەوەیان دابێ ژیان بکەنە ئامانجێك بۆ بەرژەوەندی گشتی ، هەروەها

بەرژەوەندی تایبەتیان خستبێتە ناو گۆمێك كە هەموو كەسێك ڕۆژانە پێی بخاتە ناویەوە ، سرووشتی مرۆڤەكانیش وا ئافرێنراوە كە تەنیا خۆیان بناسن و بوونی خۆیان بۆ مرۆڤەكانی تر دەربخەن ، نەك دەوروبەر و كەسانی تر بۆ خۆیان دەریانبخەن ، سرووشتی جڤاكیش پەیووەندی بە سرووشتی مرۆڤەكانە هەیە ، كە تێیدا لە دایك دەبن و تێیدا نەشونما دەكەن ، دواتریش بەپێی توانا و ئارەزووی خۆیان ئەم هەلەی ڕۆژگار قوتدەدەن و شوێن پێی ناهێڵن ، ئەمەش وایكردووە كە مرۆڤ بڕوا بە هیچ بەرژەوەندیەكی گشتی و تایبەتی نەكات ، چونكە لە هەموو سەردەمێكدا ڕۆژگار مرۆڤەكانی بەم ڕێچكەیەدا هێناوە و نەیهێشتووە لێی لابدەن .

– بە چ ڕێگەیەك ئەم كەشە دەتوانرێت بئافرێنرێت ؟

– دادپەروەری .

– دادپەروەری چۆن چێدەبێت ؟

– دادپەروەری كاتێك چێدەبێت كە مرۆڤ خۆی هەست بكات كە دادپەروەری نیە و پێویستە بئافرێنرێت ، بەتایبەتی لەناو ئەو جڤاكەی كە ڕەگەزی مێینە تێیدا كۆیلەیە و لاوەكانیش تێیدا سەرگەردانن ، بەڵام دادپەروەری بنەمایەكە كە هەموو كاتێك لە ئازادی زیاتر پێویستی بە خوێن ڕشتنە ، بەتایبەتی لەو وڵاتانەی كە بەردەوام خەریكی تیرەگەری و هۆزگەرایەتین ، هەروەها ئەو وڵاتانەی كە جڤاكەكەیان پێك هاتووە لە مرۆڤی لووت بەرز و مرۆڤی كەس خودایی .

– ئەوانە چ پێویستیان بە دادپەروەری هەیە ؟

– ئەوانە پێویستە وانەی دادپەروەری فێربكرێن ، چونكە هەموو كەشێكی باش و خراپ لەلایەن ئەوانەوە ڕوو دەكاتە ناو جڤاك . ژیانیش تەنیا بریتی نیە لە ئازادی ، بەڵكو بنەمای هەرە گەورەی جڤاك بریتییە لە دادپەروەری ، كە هیچ شتێك ناتوانێ بەبێ ئەم بنەمایە شوێنی خۆی بكاتەوە و جێگیربێت ، دادپەروەری كۆتایی بە هەموو كارێكی بەرژەوەندی خواز دەهێنێت ، دوای جێگیر بوونی دادپەروەری ئازادی لە خۆیەوە لەدایك دەبێت و لەناكاو ژیانێكی بەختەوەر بۆ مرۆڤەكان دەئافرێنرێت ، بەتایبەتی ئەو ژیانەی كە پێكدێت لە هەموو بنەمایەكی مرۆڤ بوون ، هیچ جڤاكێك بەبێ دادپەروەری ناتوانێت ڕۆژێك ژیانێكی ئازاد بهێنێتە كایەوە ، ئەمەش مرۆڤەكانن كە ئەو كەشە دەئافرێنن ، نەك ژیان ، چونكە ژیان

مرۆڤەکانی ئازاد کردووە ، بەڵکو ئەوە مرۆڤەکان خۆیانن ئەو ئازادیە لە خۆیان پێشێل دەکەن و ئاراستەکەی بەرەو ئاراستەیەکی نامرۆڤ بوون و نا ژینگەیی دەبەن ، ئەو کاتەش ژیان تێکەڵ دەبێت لەگەڵ جەنگ و ئاشتی و ماف و یەکسانی و ئازادی و دادپەروەری .

– کەواتە ، بنەمای هەر ولاتێکیش بریتییە لە دادپەروەری . ئەی وانیە ؟

– بێگومان گەر دادپەروەری نەبوو . مانای ئەوەیە ولاتێك هەیە ، بەلام ویرانەیە .

– ولات لەلایەن هەموو کەسێکەوە دەچێت بەڕێوە ؟

– نەخێر ، بەڕێوەبردنی ولات بۆ هەموو کەسانێك سزاوار نیە ، چونکە داهاتووی ئەو ولاتە دەکەوێتە بارێکی تایبەتیەوە ، گەر کەسێکی سزاوار و لێهاتوو و بە ئەزموون بوو ، ئەوا داهاتووی ولاتیش بەرەو ئاراستەیەکی کەرپەککار و ژینگە پارێزراوی دەچێت ، هەموو مافێك دەکەوێتە بەردەستی هاولاتیان خۆیان ، هەموو مرۆڤەکان ئەو کاتە دەتوانن بە ئاسانی لە داهاتووی خۆیان بڕوانن ، بەلام گەر ئەم سیفاتانەی تێدا نەبوو ، ئەوا داهاتووی ولات وێران دەکات و شۆڕشی نەفامی و توندوتیژی لە نێوان مرۆڤەکان سەرهەڵدەدات ، ئەمەش لەبەر کەم ئەزموونی و کەم توانایی هۆشیەوە ڕۆژگاریش ولاتەکەی سەرەو ژێر دەکات ، چونکە خودی خۆی ناتوانێ تواناکانی خۆی بناسێ ، نەك تواناکانی جڤاك و هاولاتیان ، ئەمەش مانای مرۆڤ بوون لەناو جڤاکدا ناهێڵێت .

فرووزە ئەم جێگایەشی بەجێهێشت ، نزیکەی دوو شەو و دوو ڕۆژ بە ڕێگاوە بوو ، تا گەیشتە ناوچەیەکی تر ، ئەم ناوچەیە جۆرە کلتوورێکی تایبەت بە خۆیان هەبوو ، هەر کە گەیشتە ئەم شوێنە سەری لە خەڵکی ئەم ناوچەیە دەرنەدەکرد .

خەڵکەکەی جۆرە کلتور و جۆرە ئایینێکیان هەبوو ، کە تائێستا لەم جۆرە کلتوورەی نەبینیبوو ، خەڵکەکەی جۆرە جل و بەرگێکیان لەبەر بوو کە جیاواز بوو لەو ناوچەیەیی کە فرووزە لێیەوە هاتبوو ، جلەکانیان بریتیبوو لە پارچە قوماشێك کە تەنها ئەندامەکانی خۆیان پێ داپۆشیبوو ، نێر و مێ بەهەمان شێوەی یەکتر بوون ، لەڕووی داهێنان و کشتوکاڵەوە تا

ڕادەیەك لە پێشەوەی ولاٌتانی تر بوون ، هەروەها لە ڕووی ئایینەوە چەندەها ئایینی تێدا بوو ، هەندێك لە خەلٌکەکەی بت پەرست بوون ، هەندێك ئاژەلٌ پەرست بوون ، هەندێك ڕووەك پەرست بوون ، هەندێك ئاو پەرست بوون ، هەندێك کانزا پەرست بوون ، هەندێك مردوو پەرست بوون ، هەندێکیش ئەندامەکانی مرۆڤیان دەپەرست .

فرووزە تەواو لەم ناوچەیەدا کەوتبۆوە گومانەوە ، ناچار بوو بچێتە ناو خەلٌکەکە و کەمێك لە کلتور و نەریتە ئایینیەکانیان فێرببێت ، سەرەتا چاوی بە ئافرەتێك کەوت ، خەلٌکی بەو ئافرەتەیان دەوت : ویناو ، هەروەها بەچاوێکی پیرۆزەوە لێی دەڕوانرا لەلایەن خەلٌکیەوە .

فرووزە سلاٌوی لێکرد ، ئەویش وەلاٌمی سلاٌوەکەی فرووزەی دایەوە ، ئەم ئافرەتەی ناوی ویناو بوو زۆر سەیری فرووزەی کرد ، زۆری پێ سەیربوو کە مرۆڤێکی لەم ڕەنگە و لەم شێوەیە لە ولاٌتەکەیدا هەیە ، چونکە فرووزە ڕەنگی پێستی جیاواز بوو لە ڕەنگی پێستی خەلٌکی ئەو ناوچەیە ، بۆیە ویناو ماوەیەك لەبەردەمی فرووزە ڕاوەستا .

فرووزە ؛ ئایا بۆچی خەلٌکی بە تۆ دەلٌێن ویناو ؟

ویناو ؛ هەموو شتێك چاوی هەیە ، هەموو ناویکیش لە بوونی شتێکەوە هاتووە ، ناوی شتەکان پەیووەستە بە بوونی شتەکان ، ویناویش چاوی دلٌە .

ویناو ؛ من ناوی تۆ نازانم .

– فرووزە .

– خۆشحالٌم .

ویناو ؛ تۆ لەکام شارەوە هاتووی ؟

فرووزە ؛ ئاخێکی ئەلٌکێشا . نازانم ، ئاخر من لە کوێوە بزانم ، تەنانەت خۆشم نازانم ناوچەکەم ناوی چیە و کەوتۆتە کوێوە .

– تۆ لەوانەیە هۆشت لەدەست دابێ ، چونکە جل و بەرگ و قسەکردنەکەت جیاوازە لەهی ئێمە ، پاشان فرووزەی بردە مالٌی خۆی ، لەوێ ویستی خۆراکی پێبدات ، تا کەمێك هۆشی بێتەوە سەرخۆی ، جۆرە خواردنێکی لەبەردەم فرووزە دانا ، کە پێکهاتبوو لە ماری برژا و سەگی سورەوەکراوە ، فرووزە نەیتوانی هیچ کام لەم خواردنانە بخوات .

فرووزە لە پاپیر وداپیرەیەوە بیستبووی کە خواردنی هەردووکیان نەهی لێکراوە ، بۆیە فرووزە

**هەرچەندی کرد نەیتوانی هیچیان بخوات ، ویناو هەر کە زانی فرووزە ئەم خواردنانە ناخوات ، بۆی دەرکەوت کە فرووزە خەڵکی نیشتمانی ئەوان نیە ، بەڵکو لە وڵاتێکی ترەوە هاتووە ، یان بەسەردان هاتووە ، یان کەسێکی سەرگەردانە و ڕێگای لێ تێکچووە .**

**– ئایا تۆ لە کام وڵاتەوە هاتووی ؟**

**– لەوڵاتێکەوە هاتووم کە خۆشم نازانم ناوی چیە .**

**– چۆن نازانی وڵاتەکەت ناوی چیە ؟!**

**مەگەر تۆ ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەم پرسیارەت لە خەڵکی ناوچەکەت نەکردووە ، یان تۆ لە خەڵکی ناوچەکەت ناوت نەبیستووە ؟**

**– بۆچی ، من لەو گۆتەیەت تێناگەم ، ئایا نازانی ؟**

**– من لە ناوچەیەك ژیانم دەبردەسەر کە دوور بوو لە ئاوایی ، تەنانەت باوك و دایکی خۆشم نەبینیووە ، کاتێك من دایك و باوکی خۆم نەبینیبێ ناوی وڵاتەکەی خۆمم بۆچیە .**

**ژیانم بۆچیە ، تەنانەت داپیرە و باپیرەشم لێ وون بووە ، هێشتا بەدوای دۆزینەوەی ئەوانەوەم . بەڵکو ڕۆژێ دابێت بتوانم بیاندۆزمەوە .**

**– لەوانەیە تۆ کەسێك بیت هەرگیز خۆشیت لە وڵاتەکەتدا نەبینیبێ .**

**– بەڵێ ، ئەو ڕۆژەی داپیرەم چوو کەمێك نان کۆبکاتەوە لە ئاوایی ، من بە سکی برسیەوە چاوەڕوانی بووم تا بێتەوە سکی خاڵیم تێربکەم ، بەڵام شەو بەسەر چاوەکانمدا هات و داپیرەش نەگەڕایەوە .**

**من چووم تا بتوانم بیدۆزمەوە ، بەڵام خۆم وون بووم و ئاوارەی کەژ و کێوەکان بووم ، هەتا ئێرە تارمایی ڕێنیشاندەرم بوو .**

**– کام تارمایی ؟**

**– ئەو تارماییەی کە تووشی کەسە بەد بەختەکانی وەك من دەبێت و خۆیان لێدەکاتە داپیرە ، بەڵام هەرگیز ڕوو ناکاتە شوێنی منداڵە پادشاکان ، چونکە ئەو تارماییە تەنیا بۆ منداڵانی وەك من درووست بووە .**

**– کەمێك ڕووی لە فرووزە وەرگێڕا و دەستیکرد بە گریان و هەڵوەراندنی ئەسرین ، گریانێك کە دەتگووت خۆی فرووزەیە .**

– فرووزە تۆ بۆچی لەلای من نامێنیتەوە ؟

– ڕۆژگار منی بۆ گەڕان و سەرگەردانی درووستکردووە ، نەك بۆ مانەوە ، من هێشتا وێنەی باپیرە و داپیرەم لەبەرچاوە ، چۆن بتوانم ساتێك ئارامی بەخۆم ببەخشم .

– من چۆن دەتوانم یارمەتیت بدەم ؟

– لە خەڵکی ناوچەکەم بیستوومە کە وڵاتەکەی ئێمە زۆر دەوڵەمەندە بەڵام بێکەسە ، منیش مرۆڤی وڵاتێکی بێکەسم ، یارمەتی هیچ کەسم ناوێت ، لەبەرئەوەی هەر بەتەنیا خۆم لێرە بێکەس نیم ، بەڵکو وڵاتەکەشم وەك من سەرگەردانە و لەهەوڵی دۆزینەوەی داپیرە و باپیرەی خۆی دایە ، من لەوانەیە نەتوانم بیاندۆزمەوە و بمرم ، بەڵام سەرباری هەموو ئەو ناخۆشیانە پەرۆشی وڵاتەکەمە ، چونکە ئەو نامرێت و بەردەوام دەبێت بەدوایاندا بگەڕێت ، بەردەوام دەبێت شین بۆ کەس و کارەکەی بکات .

– وڵاتەکەی تۆ بۆچی ئاوهایە ، مەگەر کەسێك نیە خۆی بکات بە خاوەنی ڕاستەقینەی ؟

– وڵاتەکەی من جیاوازە لە وڵاتەکەی تۆ .

– چۆن ؟

– وڵاتەکەی تۆ کۆمەڵێك مرۆڤی ڕۆشنبیری تێدایە ، بەڵام وڵاتی من ئەو مرۆڤانەی تێدا نیە ، چونکە هەموو مرۆڤەکانی وڵاتی من کەوتوونەتە دوای خواردن ، وڵاتی تۆ پڕیەتی لە کلتور و شتی جۆراو جۆر کە هیچ کاتێك لەبیر ناکرێن ، بەڵام وڵاتی من یەك کلتوری هەیە ، ئەویش دابەشکراوە و کەسیش بۆ ساتێك نایهێنێتەوە بیری خۆی ، وڵاتی تۆ ئاگاداری هەموو شتێکن ، ئەو شتانەش هەر لە منداڵێکەوە تا گەورەیەك دەیانزانێت ، وەك یاسا و ماف و ئابووری و ئازادی و دادپەروەری ، بەڵام ئەم شتانە لە وڵاتی مندا بوونیان نیە .

بڕیار لەلایەن کەسێکەوە دەردەچێت کە تەنانەت هاوسەرەکەی خۆشی ئاگای لێنیە ، نەك هەموو جڤاك ، ژیانی وڵاتی من بریتییە لە ژیانێك کە پێی دەوترێت سەمەرگی ، بەڵام لەوڵاتی تۆدا بریتییە لە مرۆڤ مەرگی ، هەموو یاساکانی مرۆڤ کە پێیان دەوترێت ماف و باس لە ژیانی هاوڵاتیانی وڵات دەکات ، لە وڵاتی مندا بوونیان نیە و بریتییە لە یاسای کەسانێك کە نزیکایەتیان هەیە لە گەڵ کار بەدەست و دەوڵەمەندەکان ، لەهەمان کاتدا ئەم یاسایانە جێبەجێکردنیان بەسەر دەوڵەمەندەکاندا بوونی نیە ، بەڵکو تەنیا بەسەر هەژارەکاندا

**جێبەجێدەکرێت و بەس ، ئەمەش هەموو هاوڵاتیانی وڵاتی بێ هیوا کردووە ، چونکە ؟**

**– چی چونکە ؟**

**– وڵاتی من بریتییە لە مەیدانی دەوڵەمەند ، نەك هەژار . بریتییە لە زۆرداری ، نەك ئازادی ، بریتییە لە نا دادپەروەری ، نەك دادپەروەری ، بریتییە لە ماف خواردن ، نەك ماف پێدان و یاساکانی ڕێزگرتنی مرۆڤ .**

**فرووزەویناوی بەجێهێشت و کەوتە گەڕان بەناو شاردا . ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارە بەناو شاردا خەریکی گەڕان بوو ، کاتی ئێوارە بوو وردە وردە ڕۆژ خۆی بزر دەکرد لەو ناوچەیە . لەناو شاردا کەسێکی بینی کە لە کوچەیەك دانیشتبوو . غەمباری ڕووخساری داپۆشیبوو ، ناوە ناوەش ئەسرین بە ڕوومەتەکانیدا دەهاتنە خوارەوە . فرووزە ، بە پەرۆشەوە لێی چۆوە پێشەوە و لەبەردەمی دانیشت .**

**فرووزە ؛ بۆچی دەگری ؟**

**ئەویش وەڵامی فرووزەی دایەوە و وتی : تۆ دەزانی ناوی من چیە ؟**

**– نا . من لە کوێوە بزانم ناوی تۆ چیە ؟**

**– کەواتە پێش ئەوەی پرسیار بکەی دەربارەی ئازاری کەسێك ، ئەوا پێویستە شارەزای ئەو شوێنە بیت کە کەسەکە ئازاری تێدا دەچێژێت .**

**– ڕاستە . کەواتە ناوت چیە و هۆکاری گریانەکەشت چیە ؟**

**– هۆڵمان .**

**– ئەی ناوی تۆ ؟**

**– فرووزە .**

**– فرووزە من بگریم یان پێبکەنم خۆم ئازادم ، تۆ ناتوانی هیچ کاتێك بەگریانم بێنی ، هەروەها ناشتوانی هیچ کاتێك بمخەیتە پێکەنین .**

**– ڕاستە . مرۆڤەکان ئازادن لە بڕیارداندا و ئازادیشن لە وەڵامدانەوەدا ، بەڵام کاریگەری**

هەندێك کەسیش دەوری خۆی دەبینێت ، چونکە مرۆڤ خۆی بەتەنیا ناتوانێ بەرەنگاری هەموو کێشەیەك ببێتەوە ، هەروەها هۆشی مرۆڤ توانای چارەسەرکردنی هەموو کێشەیەکی هەیە ، بەڵام لە کاتێکدا کە هۆش ئەزموونی هەبێت لە چارەسەرکردندا ئەوا لەوانەیە پێویستی پێ نەبێت .

– من لێرە دەگریم ، بەڵام تۆ بەم کاتە درەنگە چی دەکەی لێرە ؟

– من ڕێبوارێکم و ڕێگام هەڵە کردووە .

– کەواتە بە هۆشی خۆت ڕێگاکەی خۆت بدۆزەوە ، نەك بە هۆشی من و کەسانی تر ، چونکە ئەو ڕێگایەی تۆ پێیدا تێپەڕیووی مەرج نیە من ئەو ڕێگەیەم بینیبێ و پێیدا تێپەڕ بووبم ، یان لەوانەیە هەر ناوی ئەو ڕێگەیەشم نەبیستبێ .

فرووزە بەم قسەیەی ئەو کەمێك نیگەران بوو ، دواتر فکری کردەوە بۆی دەرکەوت کە ئەو ڕاستدەکات ، چونکە مەرج نیە مرۆڤێك بتوانێ بە هەموو ڕێگەیەکدا تێپەڕ ببێت .

– هۆڵمان تۆ خەڵکی ئێرە نیت ؟

– بازرگانێك بووم و بە کۆمەڵێك شمەکەوە ڕووم کردە ئێرە ، بە هیوای ئەوەی کە قازانجێکی زۆر بکەم و بگەڕێمەوە وڵاتەکەی خۆم ، بەڵام هەموو شمەکەکان تەنها هی خۆم نەبوون ، بەڵکو مافی خەڵکی ناوچەکەشمی پێوەبوو ، بەڵام ئەم وڵاتە ئەوەندەی دز و جەردە زۆرە ، هەرگیز ناتوانی پشوویەك بدەی ، ئەوەندەی چاو چنۆك زۆرە کە ناتوانی بۆ ساتێکیش ماڵەکەت بەجێبهێڵی .

بە وتنی گۆتەکانی هۆڵمان فرووزە زۆر پەشۆکا . فکریکردەوە کە ئەو پێشتر لەلایویناو زۆر باسی چاکەی ئەم وڵاتەی دەکرد لەبەرامبەر وڵاتەکەی خۆیدا .

فرووزە فێری ئەوە بوو کە هیچ کاتێك بڕیاری پێش وەختە نەدات تا بەتەواوی هەموو ڕوویەکی شتەکان نەبینێت ، فرووزە زۆر پەشیمان بوو لەوەی کە زوو بڕیاری پێش وەختەی داوە . بۆی دەرکەوت کە هەرگیز ڕەشبین نەبێت بەوەی کە مرۆڤ نەتوانێ بەسەر ژیاندا زاڵبێت ، بۆیە دەستی هۆڵمانی گرت و هەڵیستاندە سەر پێ ، کەمێك خەمی دایەوە و سێ درهەمی دایە ، ئەو درهەمانەش ویناو بە فرووزەی دابوون ، تا بتوانێ کەمێك سکی پێ تێر بکات لە کاتی برسیەتیدا . هۆڵمان بە پێدانی ئەو درهەمانە کەمێك هاتەوە سەر خۆی .

– فرووزە بە دیدی تۆ ژیان بۆ منە بە تەنیا یان بۆ تۆشە ؟

– ژیان تەنیا بۆ کەسانێك نیە تا بە ئارەزووی خۆیان بتوانن گەمەی تێدا بکەن ، بەڵکو بۆ هەمووانە ، ئەوانەشی خۆیان بە بەرز دەنرخێنن لەلای کەسانی تر ، ئەوا بزانە خۆیان هەم سەنگیان نیە و هەم گەمژەی ناو جڤاکیشن . هۆشی مرۆڤ لە هەموو کارێکدا پێویستی بە پشووە ، چونکە زۆر ئەستەمە مرۆڤ بتوانێ لە کاتێکدا دوو بەرنامە دابڕێژێ ، هەروەها ئەوانەشی فکر دەکەنەوە پێش بڕیاردان ، ئەوا سەرکەوتوو دەبن لە ئەنجامدا ، ئەوانەشی بێدەنگ دەمێننەوە ، ئەوا هاوڵاتی بۆ قسەکانیان هەڵوەدایە ، چونکە یەك قسە دەکەن ، ئەو قسەیەش دەبێتە وتە و جێگای خۆی دەگرێت ، ئەو وتەیەش دەبێتە بناغەی قسەکانی هاوڵاتیان .

فرووزە ماڵئاوایی لە هۆڵمان کرد . لەناو شاردا لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە شوێنێك بدۆزێتەوە تاوەکو بتوانێت تا سبەی لێی بخەوێت .

فرووزە باخچەیەکی دۆزیەوە لەناو شاردا ، باخچەیەك تا بڵێ ڕەنگین و دڵڕفێن ، ئەوشەوە فرووزە لەناو ئەو باخچەیەدا خەوی لێکەوت ، بەڵام نەیزانی کە ئەو باخچەیە باخچەی پادشازادەکانە و لە ئەوان زیاتر هیچ کەسێکی تر بۆی نیە بچێتە ناویەوە بۆ پشودان .

دنیا بەرە بەرە ڕووناك دەبۆوە ، تیشکی خۆریش خەریك بوو دەردەکەوت ، فرووزە لەخەو هەڵسا ، لەوکاتەدا بینی کۆمەڵێك پاسەوان چواردەوریان گرتووە ، فرووزە ئەمەی لەلا سەیر بوو ، کە لەکاتی شەو ئێرە پاسەوانی لێنەبوو ، بەڵام ئێستا پڕبووە لە پاسەوان ، هەمووشیان بەیەك دەنگ دەیانوت : دزەکەمان گرت .

فرووزە بەم وشیەی کە سەربازەکان دەریاندەبڕی زۆر پەشۆکا ، فکری دەکردەوە کە ئەو هیچ دزیەکی نەکردووە ، پاسەوانەکان دەست و قاچی فرووزەیان بەست و بردیان بۆ لای پادشا ، بەڵام هێشتا پادشاکەیان لە خەو هەڵنەستابوو ، دەنگی باڵندەکانیش ئەو ناوەیان پڕ کردبوو لە ئاوازی جۆراوجۆر .

پادشا لەخەو هەستا . گەورەی پاسەوانەکان ڕۆیشت تا هەواڵ بداتە پادشا بۆ دەستگیرکردنی دزێك ، بەڵام پادشا سەرقاڵی خواردن و خواردنەوە بوو ، بۆیە کاتەکەی دواخست بۆ کاتژمێرێکی تر و بۆ بینینی فرووزە .

پاسەوانەکان دەستیانکرد بە گەمەکردن ، فرووزەیان لەملا بۆ ئەولا هەڵدەدا لە نێوان خۆیاندا ، فرووزەش پەرێشان ببوو بە دەستیانەوە ، فرووزە ئەوەندە بێزار بوو ناچار برِ بەدەنگی هاواری کرد ، وازم لێبێنن - وازم لێبێنن ، پادشاش گوێی لە دەنگی فرووزە بوو ، هاتە دەرەوە .

– ئاوها ڕێز لە پادشاکەتان دەگرن .

– ئەمە تاوانبارە .

– چۆن دەزانن کە ئەوە تاوانبارەکەیە ؟

– ئەمە ئەمشەو لە باخچەکەی تۆدا خەوتبوو ، بەڵام هیچ کەسێکیش بۆی نیە تەنانەت بێتە شوێنی ئاسایی بەرێزتانەوە نەك لێی بخەوێت ، بۆیە دەستگیرمانکردووە .

– زەردەخەنەیەك بەسەر لێوەکانیدا هات . ئەم باخچەیە هەموو شەوێك پاسەوانی لێبووە ، بەڵام ئەم شەو پاسەوانی لێنەبووە ، ئەگینا ئەویش نەیدەتوانی بێتە ئەم شوێنەوە ، کەواتە تاوانبارەکە ئێوەن ، نەك ئەو ، پادشا فەرمانی کرد  بە پاسەوانەکانی تر کە هەموو ئەم پاسەوانانەی لێرەن دەزگیر بکرێن ، پاسەوانەکان هەموویان دەزگیرکران ، چونکە ئەو شەوە پارێزگاری باخچەکەیان نەکردبوو ، بەڵکو هەموویان خەریکی خواردن و خواردنەوە بوون .

پادشا دەستی خستە سەر شانی فرووزە و لەگەڵ خۆیدا بردیە شوێنی ئارامبوونەوەی خۆی ، کاتێ فرووزە چووە ژوورەوە لەگەڵ پادشا ، سەری سوڕما لە جوانی شوێنەکە و ڕازاندنەوەی شوێنەکەی ، ئەوەندە سەیری ئەملاو ئەولای ناوەوەی کۆشکەکەی دەکرد کە بەهیچ شێوەیەك بێزار نەدەبوو لە سەیرکردنی .

پادشا فەرمانی کرد کە خواردن و خواردنەوەی بۆ بهێنن .

– ناوت چیە ؟

– فرووزە .

– فرووزە ئارەزووت لە چ خواردن و خواردنەوەیەکە ؟ تا فەرمان بکەم بۆتی بهێنن .

– پارچەیەك نان و کەمێك ئاو .

پادشا بەم داواکاریەی فرووزە هۆشسام بوو ، کە ئاواها لەناو ئەو هەموو خواردنە خۆشانەدا داوای پارچەك نان و کەمێك ئاو دەکات .

– فرووزە بۆچی داوای ئەم خواردنە دەکەی ؟

– من بەهەژاری لەدایك بووم و هەر بە هەژاریش گەورە بووم ، دەمەوێت بەهەژاریش بمرم ، چونکە گەر خواردنی خۆش بخۆم ، ئەوا دواتر توانای ژیان بەسەر بردنم نامێنێت . توانای خواردنی بەتامی هەژاریشم نامێنێت .

پادشا زۆر بەهۆشسامیەوە گوێی لە وتەکانی فرووزە دەگرت ، دواتر پادشا فەرمانی کرد کە بیکاتە ڕاوێژکاری خۆی .

– پێویستە تۆ ببیت بە ڕاوێژکاری من .

– من ناتوانم بە داواکاریەکەت ڕازیبم .

– هەموو هیوایەکم ئەوەیە کە کەسانی وەك تۆ لە دەورو پشتی من بن ، نەك کەسانی خراپی وەك ئەو سەربازانەی کە تۆیان تاوانبارکرد .

– گەر من ببمە ڕاوێژکاری تۆ ، ئەوا پێویستە هەموو کەسانی ناو فەرمانڕەواییەکەت بگۆڕی .

– بۆچی ؟

– لەبەرئەوەی ئەوانیش بەهەمان شێوەی سەربازەکانتن ، ئەوانیش خەریکی خواردن و خواردنەوەی خۆشن و نازانن ژیانی ناو جڤاك چۆن گوزەر دەکات ، هەروەها نازانن سنوری وڵات لە کوێوە تا کوێیە ، نازانن دووژمن کێیە و دۆستی وڵات کێیە ، نازانن هەژار کێیە و دەوڵەمەند کێیە ، هەروەها نازانن جوتیار کێیە و کشتوکاڵ چیە ، نازنن چۆن جڤاکەکەیان لە نەزانی و نەخوێندەواری ڕزگار بکەن ، هەموو ئەو شتانەشی کە لەم وڵاتەدا هەیە دابینکراوە بۆ خێزانەکەی ئەوان ، ئەمەش وایکردووە کە نەزان دەربچن بەرامبەر بە خاك و جڤاك .

– تۆ هەموو ئەم شتانە چۆن دەزانی و لە کێ ئەو زانیاریانەت بیستوون ؟

– لە چاوەکانی تۆدا هەموو شتێك بە ڕوونی دیارە و بەرامبەر بە هەژارێکی وەکو من هاوار دەکەن ، منیش ناتوانم بێدەنگ بم . هەڵەی تۆش لێرەدا ئەوەیە کە هێشتا نازنی من خەڵکی کوێم و دەتەوێ من بکەی بە ڕاوێژکاری خۆت . چۆن تۆ کەسێکی بێگانە بەسەر گەلەکەی خۆتدا زاڵ دەکەی ، هەروەها من باوەڕم وایە کە تۆ هۆشت لە دەست دابێ ، چونکە هاوڵاتی

ولآتێكی ترم كە خۆشم نازانم كوێیە ، ئەوا چەندین ساڵە لە هەوڵی ئەوەدام كە بیدۆزمەوە و خاكەكەی ماچ بكەم ، تا دار و دەوەنەكانی توند لەباوەش بگرم .

– باشە منیش زۆریت لێناكەم بۆ ڕاوێژكاری و ناشتوانم ڕازیبم بە داواكاریەكانی تۆ .

– كەواتە تۆ لە سەربازەكانت زیاتر تاونباری .

پاشا بەم گۆتەیەی فرووزە زۆر توورە بوو ، فەرمانی كرد فرووزەش ببنە ناو بەندیخانەوە ، فرووزە پاش چوار ڕۆژ لە بەندیخانە ئازاد كرا لەگەڵ سەربازەكانی تر ، بەلآم لەسەر گۆتەكەی خۆی سوور بوو ، ناچار پاشا فرووزەی ئاگادار كردەوە كە ولآتەكەی بەجێبهێڵێ .

پادشا هەڕەشەیەكی ڕەوانەی فرووزە كرد ، كە هەرگیز باسی ئەم ولآتە نەكات لەهیچ شوێنێك ، ئەگینا تووشی سزای قورس دەبێت ، ئەویش مردنە .

فرووزە بەڕێكەوت بۆ ناو شارەكانی ئەم ولآتە ، ماوەیەك بە نهێنی لە شارۆچكەكانی ئەم ولآتەدا مایەوە ، چونكە فەرمانی پێكرابوو كە بڕوات ، هەربۆیە نەیدەتوانی بە ئاشكرا لە شارۆچكەكانی ئەم ولآتەدا بگەڕێت ، فرووزە دەیوویست زیاتر شارەزای خەڵكی ئەم ولآتە ببێت ، بەلآم فرووزە بینی كە خەڵكەكەی چاوترسێن كراون و ناوێرن تەنانەت ناوی پادشاكەشیان بهێنن ، لە هەموو كارێكیشدا بە پیرۆزەوە لێی دەڕوانن ، هەموو داهێنان و تازەگەریەكیش بە هی پادشا دەزانن و دەڵێن گەر پادشاكەمان بەبەزەیی نەبوایە ئێمە نەماندەتوانی ژیانیش بكەین نەك داهێنان .

دەیانووت ، هەموو هەناسەیەكمان لەبەر دەستی پادشا دایە ، تەنانەت گیانیشمان بە گیانی پادشاوە بەستراوەتەوە ، بەلآم پادشا لەبەر خواردن و گەڕان بۆ هەوارگە خۆشەكان هەرگیز نەیدەزانی خەڵكی چۆن ژیان دەگوزەرێنن ، ئەم خەیاڵەش لەلای پادشا تەنیا بیرۆكەیەك بوو لەپشتی پەردەوە لە كاتی خەوتندا لەناو هۆشیدا دروستدەبوو، هەربۆیە ئەمیش بێزار بوو ئەم ولآتەشی جێهێشت و ماڵئاوایی لەم ولآتە كرد .

فرووزە بەرەو ناوچەیەكی دوور بەڕێكەوت ، ئەمجارەیان فرووزە لە فكری ئەوەدا بوو كە ئەو

ناوچەیەی لەمەودوا پێیدەگات دەبێ چ ناوچەیەك بێت ؟ هەروەها دەبێ چ جۆرە كلتوور و ئایینێكی هەبێت ؟ دەبێ چ كەسانێك فەرمانڕەوایەتی بكەن ؟ هەموو ئەو پرسیارانە لەناو هۆشی فرووزەدا درووستببوون ، چونكە پێشتر ئەو ناوچانەی كە پێی گەیشتبوو پڕ بوون لە نەریتی جۆراوجۆر ، هەریەكە بە شێوەیەك وڵاتی بەڕێوەدەبرد و هەریەكە بەشێوەیەك كلتوورەكانی خۆی دەپاراست ، فرووزە هەر بەدەم ڕێگەوە بوو و ئەم پرسیارانەشی لەخۆی دەكرد ، ماوەی چوار ڕۆژ و چوار شەو بە ڕێگاوە بوو ، بەرە بەرە لە وڵاتێك نزیك دەبۆوە ، هەر لەگەڵ نزیكبوونەوە بەرەو ئەو وڵاتە هەستیكرد كە خاكێكی شووم و نەفرەتلێكراوە بەهۆی كۆمەڵە كەسانێكەوە .

گەیشتە گوندێك كە دوور بوو لە هەموو خزمەتگوزاریەك لە ڕووی نەخۆشخانە و قوتابخانە و ڕێگاوبانەوە ، لەپڕ دارێكی بەدێكرد لە نزیكی خۆیەوە كە گەڵای دارەكە چواردەوری خۆی بە سێبەر داپۆشیبوو ، ئەویش بەرەو دارەكە هەنگاوینا ، كاتێك كە نزیكبۆوە بینی مرۆڤێكی ڕەش ئەسمەر لەژێر دارەكەیە و سەری بردۆتەوە ناو كۆشی و خەریكی گریانە .

فرووزە گەیشتە لای و سڵاوی لێكرد ، ئەویش هەستایە سەر پێیەكانی و هەتا هێزی تێدا بوو لەو شوێنە ڕایكرد ، فرووزە كاتێك كە ئەمەی بینی خێرا ئەویش بەدوایدا ڕایكرد ، پاش ڕاكردنێكی زۆر ئەو مرۆڤە ئاوڕێكی دایەوە و بینی كە ئەو كەسەی بەدوویكەوتووە نە باوكیەتی و نە دایكیەتی و نە خوشك و نە برایەتی .

– تۆ كێی بەدوای من كەوتووی ؟

– من ڕێبوارێكم ڕێگەم كەوتۆتە ئەم ناوچەیە ، سەرەتا گەیشتمە ئێرە و ویستم بێمە ژێر ئەو دارە و كەمێك ماندوویەتیم ئارام بكەمەوە ، بەڵام تا نەهاتمە ژێر دارەكە تۆم نەبینی .

– تۆ هیچ دارێكی ترت بەدینەدەكرد ئەم دارە نەبێت ؟ یان تۆش یەكێكی لە زۆردارەكانی تر و لە شوێنی خۆش دەگەڕێی .

فرووزە ئەوەی بە فكر هاتەوە كە پێویستە ناوی بزانێت ئەو كاتە پرسیاری لێبكات .

– ناوت چیە ؟

– سەیزوو .

– ئەی تۆ ؟

– فرووزە .

– سەیزوو ، لەبەر چ هۆکارێك ئەم بڕیارە ئاراستەی من دەکەی ؟ مەگەر زۆردارەکان چیان لەتۆ کردووە کە ئاوها قینت لێهەڵگرتوون .

– پێویست ناکات باسی بکەم .

– بۆچی ؟

– کاتی زۆری پێویستە .

– ئاساییە .

– باشە با بچینە ژێر دارەکە . کە ئارامبوومەوە ئەوا باسی دەکەم ، لەژێر دارەکە دانیشتن . کەمێك ئارامبۆوە و دەستی بە چیرۆکەکەی خۆی کرد .

– من لەم گوندە لە دایك بووم و هەر لەو گوندەش گەورە بووم ، چیرۆکی ژیانم ئەوەندە دوورودرێژە هەرگیز بە ساڵێك و دوو ساڵ تەواو نابێت ، بەڵام گەر ماندوویەتیت ئارام بۆوە گوێیەکانت ڕادێرە با کەمێك ژیانی خۆمت بۆ باسبکەم ، فرووزە ئەمەی زۆر لەلا باش بوو کە هەم چیرۆکی ئەویش بزانێت و هەم بشزانێت کە ئەم وڵاتە چۆنە و چۆن نیە .

فرووزە ویستی کەمێك ئارام ببێتەوە ، بەڵام خەوی لێکەوت و چووە ناو خەوێکی قوڵەوە . خەونێکی ترسناك هاتە ناو هۆشیەوە ، لەو خەونەدا لادێیەکی بینی کە پیاوێکی زۆردار ببۆوە کوێخای لادێیەکە ، هەموو سامان و دارایی لادێیەکەی خستبۆوە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە . هەموو خەڵکی ئەم گوندە لەژێر فەرمانی ئەودا کاریاندەکرد و دەجوڵانەوە ، تەنانەت هەموو شتێکی ئەو لادێیەی بۆ خۆی قۆرخ کردبوو ، هەردەم ئەم کوێخایە خۆی بە کەسێکی دادپەروەر و بەبەزەیی لەقەڵەم دەدا لەناو خەڵکی لادێکەدا ، بەڵام هیچ کام لەو سیفەتانەی تێدا نەبوو ، ڕۆژێك کوێخا بڕیاریدا هەرچی ماڵ و دارایی هەیە بۆی بهێنن ، خەڵکی لادێیەکەش بەم کارەی کۆمەڵێك فکرەی جۆراوجۆریان کەوتبۆوە ناو هۆشەوە ، ئاخۆ دەبێت کوێخا بۆچی داوای سەروەت و سامانی ئێمە بکات ؟ ئایا دەبێت بۆچی داوای ئەم کارە بکات ؟ کاتێك خەڵکەکە سەروەتەکەی خۆیان بۆ برد ، ئەویش بەرامبەر خەڵکەکە وەستا . بە خەڵکەکەی وت ؛ من گەورەی ئەم لادێیەم و دەبێت خواردنی ڕۆژانەتان لەلای من بخۆن و هەرچی کاری ڕۆژانەشتان هەیە دەبێت بەرهەمەکەی بێتە بەردەستی من .

لەولاشەوە لاوێك وەستابوو و لەبەرخۆیەوە دەیووت : ئای لەو خەڵکە زاڵمە ، ئای لەو خەڵکە بێڕەوشتە ، دواتر پیاوە پیرەکە خۆی پێڕانەگیرا و هەتا هێزی هەبوو هاواری کرد و وتی خەڵکینە کوێخاتان پیرۆز بێت ، خەڵکەکە سەریان سوڕما و وتیان : بۆچی ئەم قسەیە دەکات ! ئەویش وتی : ئایا ئێوەی چەوساوە و هۆش نەخۆش ناتوانن گشتتان بەرنگاری تاکە کەسێك ببنەوە کە لە ئێوە ترسنۆکترە ، خەڵکەکە بەم قسەیەی کەوتنە لێدانی کوێخا و هەموو گیانیان شین کردەوە بە لێدان ، کوێخا لەبەر دەستیان هاواری دەکرد ، فریامکەون – فریامکەون .

فرووزە بەخەبەر هات ، بینی کەسێك لەناو لادێیەکەوە هاوار دەکات فریام بکەون — فریامکەون .

– سەیزوو ، ئەم هات و هاوارە چیە لەناو لادێیەکەتانەوە دێت ؟

– ئەمە کەسێکە بەردەوام خەریکی ئاژاوەنانەوەیە لەناو لادێیەکەدا ، کاتێك کە خەڵکی لێی تووڕە دەبن ئەوا دەستدەکات بە هاتووهاوار .

– باشە با واز لە باسی ئەو هاتووهاوارە بهێنین و بێینە ناو چیرۆکی ژیانی تۆ .

– باش ، با بۆتی باسبکەم .

– ئادەی با ژیاننامەی تۆ بزانم .

– لەم لادێیە و لە خێزانێکی هەژار لە دایك بووم و چاوم بە دنیای پڕ لە ئێش و ئازار هەڵێناوە ، لە سەرەتای تەمەنمدا هەتا ئێستا خەریکی کارم و یارمەتی خێزانەکەم دەدەم . کاتێك کە تەمەنم گەیشتە چوار ساڵ ، لە ماڵەوە کردیانم بە شوانی پەلەورەکان ، بەیانیان پێش ئەوەی تیشکی ڕۆژ لەسەر چیاکانی دەوروپشتمان دەربکەوێت ، دایك و باوکم لەخەو هەڵیاندەستاندم و پەلەورەکانیان دەهێنایە بەردەمم .

دایکم دەیوت : ئەمڕۆ هەتا کاتی نیوەڕۆ هەموو پەلەورەکان دەبێ ببەیتە ناو ئەو زەویانەی کە چەند ڕۆژێك لەمەوبەر بەروبوومەکانیان هەڵگیراوەتەوە ، ئەو زەویانەش یان کرابوون بە گەنم یان بە نیسك یان بە نۆك ، منیش بە ترس و لەرزەوە فەرمانەکەیم بەجێدەگەیاند ، چونکە گەر هاتبا و فەرمانەکەیم بەجێنەگەیاندبا ئەوا ڕووبەڕووی سزایەکی قورس دەبوومەوە ، هەروەها لەپاڵ ئەوەشدا هەڕەشەی ئەوەم لێدەکرا گەر بێت و یەکێك لە پەلەورەکان دیار نەبایە ئەوا ئەو ڕۆژە نەدەبوو ڕووم لەماڵەوە بکردبایەوە ، هەتا نەمدۆزیبایەوە . ترسی

ئەوەشم لێبوو کە ڕۆژێك بێت و یەکێك لە پەلەوەرەکان نەخۆش بکەوێت و لەڕێگا مندار ببێتەوە ، چونکە دیارنەمانی پەلەورێك سزاکەی نەهاتنەوە بوو بۆ ماڵەوە ، ئەی ئەگەر ئەم ڕووداوە ڕوویدابایە و یەکێك لە پەلەورەکان مندار بووبایەوە ، ئەوا سزاکەم لەوانەیە کۆچکردنی یەکجاری بوایە ، هەروەها نەدەبوو چاوم لەسەریان هەڵگرتبا لەبەر ئاژەڵە کێویەکان ، ماوەی ساڵێك بەم کارەوە خەریك بووم و بەخۆشبەختیەوە هیچ ڕووداوێك لەم ڕووداوانەم تووش نەهات ، بژێوی ماڵەوەشمان بەرە بەرە باش دەبوو ، منیش سزاکانم ڕووی لە کەمبوون دەکرد .

لەدوای ئەو ساڵە لە ماڵەوە کرام بە شوانی ڕەشەوڵاخێك و کارەکەم قورستر بوو کە ڕۆژانە خۆزگەم بە مردن دەخواست، چونکە ئەمجارەیان تەنها هەڕەشەیەکم ئاراستە نەدەکرا بەڵکو ڕۆژانە سەدان هەڕەشەم ئاراستە دەکرا ، ئەمجارەیان باوکیشم هەڕەشەی لێدەکردم ، بەهەمان شێوەی پێشوو ڕۆژانە هەر لەگەڵ دەرکەوتنی تیشکی ڕۆژ لەخەو هەڵیاندەستاندم و کۆڵە پشتیەکیان بۆ ئامادە دەکرم ، کۆڵە پشتیەکەشم تەنیا نیو نانی سەرسێلی تێدابوو لەگەڵ مەتارەیەکی فافۆن ، ئەم مەتارە فافۆنەش بۆمن زۆر بەسوود بوو ، چونکە کاتێك کە ئاوم تێدەکرد ماوەیەکی زۆر خۆیدەگرت و ئاو تێیدا بە درەنگی گەرم دەبوو .

ڕۆژێك ڕەشە وڵاخەکەم بردە یەکێك لە گردەکانی لادێیەکە و ماوەی نیو کاتژمێر خەیاڵم ڕۆیشت ، چاوم لە ئاسمان دەکرد و بەراوردی زەویم پێدەکرد ، دواتر پیاوێکی بەتەمەنم بینی بەرەو لای من دەهات و لەبەرخۆیەوە دەیوت : " ئاژەڵەکان تەمەنیان چەند زیاتر بێت ژینگەش ئەوەندە پاکە و تەندرووستە" ، هێندەی پێنەچوو گەیشتە لام و سڵاوی لێکردم ، منیش وەڵامم دایەوە و پێشوازیم لێکرد .

ماوەیەك لەلام دانیشت و هەر لەبەرخۆیەوە قسەی دەکرد ، دەتوت کەسێکە تازە بۆ زەوی نێردراوە ، چونکە هەموو قسەکانی پڕ مانا و پڕ بەها بوون ، هەرچەندە لە دوورەوە قسەی دەکرد ، بەڵام من بەباشی لێی تێدەگەیشتم . دوای هەندێك قسەکردنمان بەیەکەوە ، وتی ؛ برسیمە و لە ڕێگەیەکی دوورەوە هاتووم . منیش کۆڵە پشتیەکەم کردەوە و ئەو نیو نانەی کە لەماڵەوە بۆیان ئامادەکردبووم دام پێی ، نیو نانەکەی کردە پارووەك و هەمووی خوارد .

دواتر وتی ؛ هێشتا برسیمە ، منیش لە ڕێگا هەندێك هێشووە ترێم لە باخەكان لێكردبۆوە بەنیازی ئەوەی لە كاتی نیوەڕۆدا نانیان پێ بخۆم .        هێشووە ترێكانیشم لەبەردەمی دانا ، هێشووە ترێكانیشی هەموو خوارد . دوای ئەوە ، داوای ئاوی خواردنەوەی لێكردم ، منیش مەتارە فافۆنەكەم هێنایە بەردەم . سەیری مەتارە فافۆنەكەی كرد و ماوەیەك راما و پاشان دەمی نا بە مەتارەكەوە و چۆڕی ئاوی تێدا نەهێشت ، ئەو ڕۆژە بەبێ نان و ئاو مامەوە .
دوای ئەمە دەستمان كرد بە گفتوگۆ .

– لەكوێوە هاتووی و بەرەو كوێ دەچی ؟

كاكی ڕێبوار ؛ واباشترە نەزانی من كێم ، چونكە گەر بزانی من كێم و چیم كردووە ئەوا لەوانەیە سەرزەنشتم بكەی ، منیش ئەم جۆرە قسەیەی ئەوم زۆر لەلا سەیر بوو .

– بۆچی خۆ دزیت نەكردووە ؟

– سەد بریا دزیم كردبا .

– خۆ قسەی نابەجێت بۆ كەس هەڵنەبەستووە ؟

– سەد بریا ئەوەم كردبا .

– خۆ سەیری ماڵی دراوسێكانت نەكردووە ؟

– سەد بریا ئەوەم كردبا .

– تاوانی كوشتنت ئەنجامداوە ؟

– دەستیكرد بە گریان . نەخێر من هەموو ئەوانەم بەرامبەر بە گەلەكەم و نیشتمانەكەم كردووە .

– چۆن ؟

– من كەسێكم لەوانەی كە لەناو هەرای گەلەكەم بەشدار بووم ، ئێستاش ڕێگەم لێ ونبووە و نازانم شارەكەم كەوتۆتە كام لایە .

– زۆرم بەزەیی پێیدا هاتەوە ، ئەو ڕۆژە لەلای خۆمم هێشتەوە تا كاتی ئێوارە ، هەر كە كاتی ئێوارە داهات لەگەڵ خۆم بردمەوە بۆ لادێیەكە و بردمە ماڵی گەورەی لادێیەكەمان ، چونكە لەناو لادێیەكە كەسی نەناسراو نەدەبوو لە ماڵی كەس بمابایەوە ، تەنانەت ماڵی گەورەی لادێیەكە نەبێت ، ئەویش زۆر بەگەرمی پێشوازی  لێكرد و فەرمووی كردە ژوورەوە ، من لەو

کاتەدا بەجێمهێشت تا بەیانی ، هەر کە سبەی داهات هەستام و خۆم ئامادەکرد بۆ ئەوەی ڕەشەوڵاخەکە بەرم بۆ شاخ و بۆ لەوەڕگە ، بینیم ئەویش خۆی ئامادەکردووە و بەنیازە بچێتەوە بۆ ناوچەکەی خۆی ، هەر کە منی بینی هات بۆ لام و هەردوو ڕوومەتی ماچ کردم .

– من هەتا ماوم چاکەی تۆ لەبیر ناکەم ، چونکە گەر تۆ نەبوویتایە لەوانەیە لەبەر برسیەتی و لە بێ ئاویەتی بمردبامایە وکەسیش لەو شاخە نەهاتبا بەهانامەوە ، هەروەها تۆ تاکە لاوی کەرپەککاری لە لادێیەکەدا .

– من هیچم نەکردووە ، ئەوەشی کە کردوومە لەپێناو ئەوەدا کردوومە تا مرۆڤ بوونی خۆم بسەلمێنم .

دواتر هەریەکەمان بەڕێگەی خۆماندا ڕۆیشتین .

ئەو ڕۆژە چوومەوە بۆ شاخ و ڕەشەوڵاخەکەم بردەوە بۆ لەوەڕگە ، کاتێك کە گەیشتمە شاخ دەستمکرد بە ژماردنی ڕۆژەکان ، بۆ ئەوەی بزانم کە من چەند مانگە خەریکی بەخێوکردنی ئەو ڕەشە وڵاخەم ، بۆم دەرکەوت کە ساڵێکی تێپەڕاندووە ، هەر لەوکاتەدا باوکم منداڵێکی ناردبوو بۆ ئەوەی ڕەشە وڵاخەکە بهێنمەوە بۆماڵەوە ، کاتێك کە بردمەوە بۆ ماڵەوە باوکم وتی فرۆشتوومە و پاش کەمێکی تر ئاژەڵکڕەکان دێن و لەگەڵ خۆیان دەیبەن ، منیش ئەو ڕۆژە نەمدەزانی بە چ شێوەیەك دڵتەنگی خۆم دەربخەم ، چونکە ماوەی ساڵێك خەریکی بەخێوکردنی بووم ، هەروەها ئەوەندە هۆگری ببووم وامدەزانی هاوڕێیەکی زۆر نزیکم دەبەن بۆ لە سێدارەدان و بە دیدەنی شاد نابمەوە .

ڕەشە وڵاخەکە فرۆشرا لەلایەن باوکمەوە ، منیش مەتارە فافۆنەکەم هەڵگرت و لە شوێنێکی پارێزراوم دانا . لەو کاتەشدا سەرەتای کردنەوەی فێرگەکان بوو ، منداڵان پۆل پۆل ڕوویان لە فێرگەی لادێیەکە دەکرد ، هەندێك لە منداڵەکان یان دایکیان لەگەڵدا بوو یان باوکیان ، ئەو کاتە تەمەنم گەشتبۆوە شەش ساڵ .

بە جل و بەرگێکی دڕاوەوە چووم بەدوایان کەوتم بەرەو فێرگە ، هەر کە گەیشتمە فێرگە لەگەڵ منداڵەکان چوومە ناو فێرگەکە و لە یەکێك لە ژوورەکان دانیشتم ، دواتر فێرکارەکان لە ناو فێرگەکەدا بەسەر ژوورەکاندا دابەش بوون ، کاتێك یەکێك لە فێرکارەکان هاتە ئەو ژوورەی کە من بۆی چووبووم ، یەکەمین جار بوو کە من لە بەرامبەر فێرکار دابنیشم ، ماوەیەك

وەستا لەبەردەممان و هەندێك وتوێژی لەگەڵ كردین دەربارەی ساڵی تازەی فێركردن ، كاتێك لە قسەكانی بۆوە ، سەیری هەموومانی كرد ، دواتر سەیرێكی منی كرد .

یەكەم فێركار ؛ تۆ لە چ ئاستێك دای ؟

– یەكەم ساڵە بەشدار دەبم .

بەرەو ڕووم هات و بە نینۆكەكانی گوێی گرتم و هەڵیدامە دەرەوە و وتی ؛ ئەو ژوورەی كە تۆ پێویستە بۆی بچیت ، بەرامبەری دەروازە گەورەكەی فێرگەیە .

دوای ئەمە منیش چووم بۆ ئەو ژوورە و لەسەر یەكێك لە كورسیە شكاوەكان دانیشتم .

فێركاری ئەو ژوورەش لێم هاتە پێشەوە ، ئەو ڕۆژە توانیم دوو فێركار ببینم كە پێشتر هیچ فێركارێكم نەبینیبوو .

دووەم فێركار ؛ پەیوەندیت بە بەڕێوەبەری فێرگەكەوە كردووە ؟

– نا .

– بڕۆ سبەی باوكت لەگەڵ خۆتدا بهێنە و ئەو جل و بەرگە دڕاوانەش بگۆڕە بە یەكێكی نوێتر.

كاتێك چوومەماڵەوە و ئەم بابەتەم بە باوكم وت .

– سەیزوو سبەی لەگەڵت دێم بۆ فێرگەكە .

– دەست خۆش باوكە .

دواتر باسی جل و بەرگم لەگەڵ باوكمدا كرد ، چونكە هیچ جل و بەرگێكم نەبوو لەو جل و بەرگە دڕاوانە زیاتر ، كراسێكم لەبەردا بوو كە قۆڵەكانیم بە چەقۆ لێ كردبۆوە و كردبوومە نیوقۆڵ لەبەر گەرمای هاوین . پانتۆڵێكیشم لەبەردابوو كە یەكێك لە دەلینگەكانی بە درێژایی یەك بست دڕابوو ، ڕووخی شوێنە دڕاوەكەش زەرد ببوو ، دەلینگەكەی تریشی بەهۆی گژوگیاوە سەوز ببوو .

سبەی زوو هەستام لە خەو ، بەنیازی ئەوەی كە لەگەڵ باوكم بچین بۆ شار و جل و بەرگم بۆ بكڕێت ، ئەو ڕۆژە لە خۆشیان نەمدەزانی چی بكەم ، چونكە دەچوومە ناو ئاستێكی تری ژیانمەوە ، هەروەها ئەو شەوەش لەخۆشیان خەوم لێنەكەوتبوو هەتا دەمە و بەیانی .

كاتێك ڕۆژ سەری وەدەرنا لەسەر چیاكان ، منیش لەگەڵ دەركەوتنی تیشكی ڕۆژ هەستام و خۆم ئامادە كرد ، دواتر چووم باوكیشم لەخەو هەڵساند .

ماوەیەك دانیشتین و نانمان خوارد .

– کوڕەکەم خۆت دەزانی گرانیە و ڕەوشی ئێمەش چۆنە ، بۆ ئەوەی زۆر پارە خەرج نەکەین پێویستە خۆت بەتەنیا بچیت بۆ شار و پێداویستیەکانی خۆت بکڕی ، قسەکانی باوکیشم ڕاست بوون . ئەو کاتە وڵات لەبەردەستی کەسانێکدا بوو ، بەتایبەتی ناوچەکەی ئێمە دەتوت سەردەمی فیرعەونەکانە و ئێمەی خەڵکیش بەگشتی وەك کۆیلەکان دەهاتینە بەرچاو ، هەروەها لەپێناو بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی خۆیان وازیان لە بەرژەوەندی گەل هێنابوو ، هەموو شتێکی وڵاتیان خستبۆوە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە و تەنانەت لایەنگرەکانی خۆیان دەیانتوانی سودی لێوەربگرن ، هەربۆیە من بەتەنیا ڕوومکردە شار ، جل و بەرگم کڕی و گەڕامەوە بۆ لادێیەکەی خۆمان .

ئەو ساڵەم بەڕێکرد هەتا کۆتایی بەو جل و بەرگانەوە ، هەروەها کاتێك کە ڕۆژانە لە فێرگە تەواو دەبووم ڕووم دەکردە شاخ بۆ لای ڕەشە وڵاخەکان ، چونکە باوکم ئەمجارەیان چاودێری چوار ڕەشەوڵاخی پێدەکردم ، بەڵام لە هەمووی خۆشتر بۆ باوکم ئەوە بوو کە ئەو ساڵە پلەی یەکەمم بەدەستهێنا لە فێرگەکەدا و دواتر فێرکارەکان لەلای باوکم باسی سەرکەوتنی منیان کردبوو .

ماوەی هەشت ساڵ بەمشێوە لە فێرگەدا مامەوە ، پیشەکەم هەم شوانی بوو هەم خوێندن ، لە دوای ئەو هەشت ساڵە دەبوو چووبامایە بۆ لادێیەکی تر تا خوێندنەکەم تەواو بکەم ، چونکە لە لادێیەکەی ئێمەدا تەنیا هەشت ئاستی لێبوو و بەس ، دوای ئەو هەشت ساڵە ڕووم لە لادێیەکی تر کرد بۆ تەواوکردنی فێرگە لەو ناوچەیەدا ، ئەو لادێیەش تەنیا نۆ ئاستی لێبوو ، ماوەی ساڵێکیش هاتووچۆم کرد بۆ ئەو لادێیە ، تا ئاستی نۆیەمیشم تەواو کرد ، بەڵام لەم ساڵەدا کە لە ئاستی نۆیەمدا بووم شوانیم نەدەکرد ، چونکە ڕێگەکەم ئەوەندە دوور بوو کە تەنیا ئەو ڕۆژە هەر بەفریا چوون و هاتنەوە دەکەوتم ، لە دوای ئاستی نۆیەم وازم لە خوێندن هێنا و لەماڵەوە کردیانم بە شوانی چەند مەڕێك ، ماوەی دوو ساڵ پێشەی من تەنها شوانی بوو ، لەماوەی ئەو دوو ساڵەدا توانیم کۆمەڵێك ئەزموون پەیدابکەم دەربارەی ڕووەکە کێویەکان و نەخۆشیەکانی ئاژەڵ ، هەروەها هەندێك لە نەخۆشیەکانی مرۆڤیش .

ڕۆژێك لەو لادێیەوە دەگەڕامەوە بۆ لادێیەکەی خۆمان ، هێشتا زۆرم مابوو بگەمەوە بۆ ماڵەوە

، لەڕێگا نووسینی بنی مەتارە فافۆنەکەم بە فکر هاتەوە .

لەبەرئەوەی کوڕە هەژارێك بووم ، نەمدەتوانی لە سنوری لادێیەکەی خۆمان بڕۆمە دەرەوە تەنیا بۆ کارێکی زۆر پێویست نەبێت ، هەربۆیە هەژاری و زەحمەتکێشی وایلێکردبووم کە لە هەموو خۆشیەکانی ژیانی بێبەش کردبووم ، هەموو ڕۆژێك بەم ئازارەوە دەمنالأند و خوێن لە جگەرم دەهات ، چونکە سەیری دەوروپشتی خۆمم دەکرد و کۆمەڵێك لاوم دەبینی کە تەواو کەوتبوونە ناو خۆشیەکانی ژیانەوە . ژیان لەلای من ببۆوە گۆڕێکی شوێن نەدیتە . بەهۆی هەموو ئەو ڕۆژانەی کە بەسەر مندا هات و ئەو زانیاریانەی کە دەستم کەوتن ، توانیم پێناسەیەك بۆ ژیان بکەم .

– بوەستە .

– بۆچی بوەستم لە قسەکانم ؟

– ئەو پێناسەیە چیە کە تۆ پێی گەیشتووی دەربارەی ژیان ؟

– ژیان بریتییە لە بوونێکی کاتی و کۆتاییدار بۆ بوونەوەرەکان ، هەروەها بۆ خودی خۆشی بریتییە لە هەبوونێکی بێ کۆتا و ناکاتەکی .

مرۆڤانێك تێیدا سوودمەند دەبن کە دەزانن بۆخۆیان بەکاریبهێنن . ئەوانەشی نازانن بەکاریبهێنن بۆ خۆیان ، ئەوا تێیدا ماڵ وێران دەبن . خۆشی و ناخۆشیەکانی ناویشی هەتا سەر نامێننەوە و کۆتاییان پێدێت .

– وەرەوە سەر باسی چیرۆکەکە .

– دوای ئەو دووساڵە چووم دەستمکردەوە بە خوێندن لە فێرگەکانی شار ، ئاستەکانی تری خوێندنم لە شار تەواو کرد و گەڕامەوە بۆ لادێیەکەمان ، چونکە دوای ئەمە دەبوو چوبامایە بۆ فێرگەی کۆتایی و ئەویشم تەواو بکردبایە ، لەماوەی پشوی هاویندا فکرم لەوە دەکردەوە ئاخۆ دەبێت ئەمجارەیان بچم بۆ کام لەشارەکانی تر ، هەروەها فکرم لەوە دەکردەوە کە ئەو شوێنەی بۆی دەچم دەبێت بیروباوەڕیان چۆن بێت ، دواتر ناوی خۆم نووسی بۆ ئەوەی ناوم لە یەکێك لە فێرگەکانی کۆتایی بێتەوە و دەستبکەم بە خوێندن ، پاش مانگێك چاوەڕوانی ، ناوم لەیەکێك لەو فێرگە گەورانە دەرچوو کە پێشتر ئاستەکانی بەرەو فێرگەی گەورەم لێتەواو کردبوو . هەر کە ئەو هەواڵەم بیست ، ناخۆشی کەوتە ناو دڵمەوە ، دەتوت کۆلکە دارێکی

گەورەیان بەسەری دڵم کێشاوە ، چونکە ئارەزووم لەوە بوو کە ناوم لە شارێکی تر دەربچێت ، بۆئەوەی بتوانم شارەزای شارەکانی تریش ببم و هەم فێری هەڵسوکەوت و کلتوورەکانی تریش ببم .

چووم پەیووەندی بەو فێرگە گەورەیەوە بکەم . یەکەمین شت داوای ئەوەیانکرد کە کەسێکی ناسیاوی خۆم بهێنم و نیشانی ئەوانی بدەم ، دواتر بچم بۆ دادگا و کاغەزێکی ئەویش بهێنم .

فرووزە ؛ ئایا بڕیارەکەت لە داداگا هێنا بۆ فێرگە گەورەکە ؟

سەیزوو ؛ بەڵێ ، بەڵام بەهۆی ئەم بڕیارانەی فێرگەی گەورە زۆر تووڕە بووم ، چونکە من خەڵکی هەمان وڵاتم و لەسەر ئەم خاکەش لەدایك بووم ، ئایا دەبێ بۆچی من بنێرنە دادگا و بڕیاری خوێندن لە دادگا بهێنم !

ئایا من بێگانەیەکم و هاتوومە ئەم وڵاتە یان مرۆڤم کووشتووە یان دزیم لە یەکێك لە دامودەزگاکانی نیشتمان کردووە ؟

من زۆر گوێم بەم هەڵسوکەوتە ناشرینانەی فێرگەی گەورە نەدا و کارەکانی خۆمم تەواوکرد ، پاش تەواوکردنی کارەکانی دادگا بێ کێشە و گرفت لە فێرگەی گەورە دەستمکرد بە خوێندن ، لەو شوێنە شێواوە باسی هەموو بوارەکانی ژیان دەکرا لە هەموو ڕوویەکەوە ، منیش بەردەوام گوێم دەگرت و هیچ قسەیەك لە دەمم نەدەهاتە دەرەوە ، چونکە پێشتر وتەی یەکێك لە زانا گەورەکانم گوێ لێببوو کە دەیانوت . ئەو زانایە فەرموویەتی : " قسە مەکە با بە قسەت بهێنن ، نەك قسە بکەی و بێدەنگت بکەن " . بەردەوام ئەو وتەیەم لەناو هۆشدا دەهات و دەچوو ، هەر بۆیە لە کۆتاییدا بۆخۆم توانیم پێناسە بۆ شتەکان بکەم ، نەك ئەوەی کە لەوێ فێریانکردبم کە بتوانم پێناسە بۆ شتەکان بکەم ، چونکە ئەوان تەنیا فێری زمانی تووتیەکانیان دەکردین ، لەگەڵ ئەوەشدا تەنیا گرنگیان بە کەسانێك دەدا کە تەواوی ژیانیان تاوان بوو بەرامبەر بە جڤاك ، هەربۆیە ئەوەی زمانی تووتیەکانی نەزانیبایە ئەوا لەلایەن تووتیە گەورەکان دژایەتی دەکرا ، هەروەها گەر پێشنیارت هەبوایە و پێشنیارەکەت جوانبایە ئەوا تۆ تەواوی ئەو ساڵەت لە دەست دەچوو ، منیش ئەوەم زۆر لەلا سەیر بوو کە شوێنی ڕۆشنبیری ببۆوە شوێنی نان خوساندن و شوێنی قەزوان فرۆشەکان ، بۆیە کەسێکم نەبینی ببێتە ڕۆشنبیر و هۆزانڤان ، چونکە تووتیە گەورەکان سەرقاڵی خواردنەوەی ماستاوی پڕ لە

**قەزوان بوون .**

**– ئەو هۆكارانە چ كاریگەریەكیان لەسەر تۆ درووستكرد ؟**

**– هەموو ئەو هۆكارانە بوونە هۆی ئەوەی كەمن بتوانم پێناسە بۆ زۆر لە شتەكان بكەم بە هۆشی خۆم .**

**– ئایا ئەو پێناسانەی كە تۆ لە هۆشی خۆتدا دروستتكردوون مەرجە هەموو مرۆڤەكانی تر پێیان ئاشنا بووبن .**

**– لەوانەیە و لەوانەش نیە . چونكە كەمێك لە مرۆڤەكان بەدوای زانستدا وێڵن نەك هەموو مرۆڤەكان ، هەروەها مرۆڤ پێویستە ناخۆشی چەشتبێت .**

**– بۆچی ؟**

**– ناخۆشی و ئازارەكانی ژیان بریتیین لە هونەر ، ئەو هونەرەش بریتییە لە زانستی ژیان ، هەروەها بریتییە لە كۆكراوەی ڕووداو و پێشهاتەكان .**

**لەدوای ئەمە ماوەیەك بێدەنگ بوو ، دواتر بە چاوێكی پڕ گریان ڕوویكردە فرووزە و بە دەنگێكی نزم وتی : خۆزگە ئەو كەسەم نەناسیبایە و هەرگیز لە خەونیشدا نەمدەبینی .**

**– ببورە . من بووم بە مایەی بێزاری بۆ تۆ .**

**– نا فرووزە . ژیان خۆی بریتییە لە خۆشی و ناخۆشی ، ئارەزوو و بێزاری .**

**– پێش كەمێك باسی كەسێكت كرد .**

**– كام كەس ؟**

**– ببورە كە بێزارم كردی ، بەڵام ئەو كەسەی خۆزگەت دەخواست كە نەتناسیبایە . مەبەستت لەو كەسە كێیە ؟**

**– ئاساییە .**

**– لەو ماوەیەی كە لە خوێندنگەی گەورە بووم لە شار ، وردە وردە فێری ئەدەب و كلتوری ناو ئەو شارە بووم ، دواتر بە هۆی درووستبوونی پەیووەندیم لەگەڵ كۆمەڵێك هاوڕێ توانیم گەشە بە فكرەی خۆم بدەم ، لە هەمووی سەیرتر ئەوەبوو كە من پێشتر هیچ ئافرەتێكم نەدەكەوتە بەر دڵ ، تەنانەت ئەو ئافرەتانەی كە لەگەڵ مانگ و ڕۆژیش لە جەنگدا بوون ، كاتێك كە لەگەڵ هاوڕێكانم دەچووم بۆ پیاسە و گەڕان و سەفرە لێیان دەپرسیم هەستت چۆنە**

بەرامبەر بە ئافرەت ، منیش دەموت : هیچ ئافرەتێك نایەتە ناو دڵم ، ئەوانیش زۆریان لەلا سەیر بوو کە من ئەو هەستەم هەیە ، ئەمەش مانای ئەوە نەبوو کە من رك و کینەم بەرامبەر بە ئافرەت هەبێت ، بەڵکو زۆر ئارەزووم لە خۆشەویستی و هاوژیانی نەبوو ، چونکە مەبەستی سەرەکی هاوڕێیەکانیشم تەنیا بریتیبوو لە هاوژیانی ، پاشان بەهۆی ئەو ماوە درێژەی کە نزیکەی سێ ساڵ بوو کە لەگەڵ هاوڕێکانمدا پەیوەندیەکی توندوتۆڵم بەستبوو ، ڕۆژێك لە وەرزی هاویندا و لە شوێنێکی ناو شار ئافرەتێکم ناسی ، کە خۆشەویستی خاك و خوێنی تێکەڵ بە یەکتری ببون ، خۆشەویستی خاك لەگەڵ خوێنیدا تێکەڵ ببوو ، بەناو دەمارەکانیدا دەهات و دەچوو .

ڕۆژێك لەگەڵیدا کەوتمە گفتوگۆ و یەکترمان ناسی ، پاشان بۆ ڕۆژی دواتر بەهەمان شێوە دەستمان بە گفتوگۆ کردەوە ، بەڵام تا دەهات خۆشەویستی ئەو لەناو دڵمدا زیاتر جێگەی خۆی دەکردەوە ، تا وایلێهات ماوەی چەند مانگێك بە بەردەوامی دەچووم بۆ لای و گفتوگۆم لەگەڵ دەکرد ، لەماوەی ئەو چەند مانگەدا خۆشەویستیم بۆ ئەو بێ سنوور ببوو ، بەڵام ئەو بەخۆی نەدەزانی کە من ئەوەندەم خۆشدەوێت ، هەروەها لە قسەکردنەکانیدا دەردەکەوت کە مەینەتی زۆری چەشتبوو لە ژیانیدا وەك من ، ڕۆژێك کە نەمدیتبایە وەك شێتێکی ناو کۆڵانەکانم لێدەهات یان بێ هیوایی دایدەگرتم و وامدەزانی کە تەواو ژیانم لە دەستچووە ، چونکە من شەیدای توانا و لێهاتوویەکەی ببووم نەك باڵا و ڕەنگی ڕووخساری . هەتا وایلێهات شەوانەش بە خەیاڵی ئەو دەنووستم و بەیانیانیش هەر بە خەیاڵی ئەو لەخەو هەڵدەستام .

ڕۆژانە ئەگەر شتێکی جوانم بەرچاو کەوتبایە ، دەموت : ئەوە دەکڕم دەیدەم بە ئەو تا جوانتر بێت ، بەڵام لەناو دڵمدا هیچ شتێك لە ئەو جوانتر نەبوو ، جوانیەکەی ئەو بۆ من بریتیبوو لە دەروونی نەك ڕووخساری ، چونکە بۆ یەکەمین جار بوو کە من ئاوهام لێبێت بۆ ئافرەت ، هەروەها پێش ناسینی ئەم ئافرەتە دەموت : هیچ ئافرەتێك ناتوانێت جێگەی خۆی لەناو دڵی مندا بکاتەوە ، بەڵام نازانم ئەو چ شتێك بوو کە تەواو دڵی منی داگیر کردبوو .

ئەو شتەی منی واڵێکردبوو کە ئەو ئافرەتەم خۆشبوێت ، خۆشەویستی ئەو بوو بەرامبەر بە خاك ، هەربۆیە ئەوەندە ئارەزووم لێبوو کە لەباوەشی بگرم و هەتا هێزم هەیە ماچێك لە ڕوومەتەکانی بکەم ، بەڵام دڵم ڕێگەی نەدەدا و لەبەرخۆمەوە دەموت : لەوانەیە ئازارێك بە

**روومەتەکانی بگات .**

**– گەر تۆ پێشتر ئاوها بووی بۆ ئافرەت ، بۆچی ئاوها شەیدای ئەو ئافرەتە ببووی لە پاشان ؟**

**– خۆشەویستیەکەم بۆ ڕووخساری نەبوو ، بۆ بالأکەشی نەبوو ، بۆ لارولەنجەکەشی نەبوو .**

**– ئەی خۆشەویستیەکەی تۆ بۆ ئەو لەپێناو چی بوو ؟**

**– خۆشەویستیەکەی من بۆ ئەو بریتیبوو لە فکر و باوەڕەکەی .**

**– چ فکر و باوەڕێك ؟**

**– فکر کردنەوە لە بوونی خاکی تایبەت بە خۆ و باوەڕبوون بە خاوەنی خۆ . لەگەڵ ئەوەشدا ئافرەتێکی ئەوەندە خوێن شیرن و ئەوەندە زانا بوو کە هەرگیز ئافرەتی ئاوهام نەبینیبوو پێشتر ، چونکە زانایی و لێهاتوویی و خەباتکردنەکەی لەپێناو خاکدا وایکردبوو کە هەموو دڵی من داگیربکات لە خۆشەویستی ، هەربۆیە بەردەوام فکرم لەلای ئەو بوو .**

**لەدوای ئەمە دەستیکردەوە بە گریان ، ئەسرین بە ڕوومەتەکانیدا تك تك دەکەوتنە خوارەوە .**

**– ببورە .**

**– نا . خۆ من وتم ژیان خۆی ئاوهایە .**

**– پاشان چی ؟**

**– چیتر نامەوێت باسی ئەو بابەتە بکەم ، چونکە لەوانەیە پەنا بۆ خۆ کۆشتن بەرم ، تەنیا هەر ئەوە دەڵێم کە هەرچەندە خۆم هێشتا هاوژیانیم نەکردووە " هاوژیانی لەناو مرۆڤەکاندا تەنیا لەسەر بنەمای درووستکردنی وەچەخستنەوەیە ، هەربۆیە تەمەنی کورتە ، گەر لەسەر بنەمای زانایی و لەسەر بنەمای خۆشەویستی بێت هەرگیز ناڕوخێت ، بەلأم گەر لەسەر بنەمای سەیرکردنی تەمەن و ڕووخسار بێت هەر زوو کۆتایی پێدێت " .**

**– ئیدی با ئەمە کۆتایی بێت .**

**– هێشتا ماویەتی . هەموو شتێك دوو دیوی هەیە . ئەمە یەك دیو بوو .**

**– وەك چی ؟ نازانم مەبەستت لە کام دیوەیانە .**

**– شتەکان دوو دیون ، دیوێکی شتەکان گێڕانەوەیە ، دیوەکەی تریشی بریتیین لە ڕەوشت و جوانی و هونەری شتەکان .**

– کەواتە با لە ڕەوشتەوە دەستپێبکەین .

– بەڵێ . یەکەم بنەما ، ڕەوشتە .

– چۆن پێناسەی ڕەوشت دەکەی ؟

– ڕەوشت تایبەتمەندیەکە لە دەروونی مرۆڤەکاندا سەرهەڵدەدات ، هەر لە تەمەنی بچوکیەوە ، واتە لە دوای وەسەرپێکەوتن و فێربوونی قسەکردنەوە مرۆڤ هەستی پێدەکات ، بەڵام هەردەم مرۆڤانێك هەن خۆی لێ لادەدەن .

– ئەم خۆ لادانە چی لێ دەکەوێتەوە ؟

– کاردەکاتە سەر جڤاك و دەبێتە پەرژینێك لەبەردەم پێشکەوتنەکانیدا .

– کەواتە ڕەوشت تەنیا پەیووەست نیە بە هەڵسووکەوتەکانی مرۆڤ .

– ڕاستە . ڕەوشت بەتەنها لەسەر گۆتەکانی مرۆڤ دیاریناکرێت ، بەڵکو لەسەر کار و کردەوەکانیشی دیاریدەکرێت ، چونکە مرۆڤەکان تەنیا فکر لەوە دەکەنەوە کە ڕەوشت بریتییە لە هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ ، بەڵام هەڵسوکەوت تەنها بنەمایەکی ڕەوشتە .

ڕەوشت بنەمایەکی کرۆکی ژیانە بۆ مرۆڤەکان و کار و کردەوەکانیان . مەرج نیە مرۆڤ بە هۆی هەندێك کردەوەی باش بتوانێت لەمانای ڕەوشت تێبگات ، ڕەوشت بنەمایەکە بۆ هەموو بوارەکانی ژیان ، هەروەها کاریگەریەکی زۆری لەسەر ژینگەی مرۆڤەکان هەیە .

– دەتوانی نمونەیەکم بۆ باسبکەی لەسەر ڕەوشت ؟

– بەڵێ .

– ئادەی بزانم .

– بۆنمونە ، من کاتێك بەرەو باخچەیەك دەچم . پێشتر ئەو شوێنەم لەناو هۆشی خۆمدا نیشانە کردووە ، تەنانەت چۆنیەتی ئەو ڕێگەیەش کە لە کوێوە بۆی دەچم . هەموو درەختەکانی ناو باخچەکە لەناو هۆشمدا بە شێوەی خەیاڵ نیشانە کراوە . کاتێك کە دەگەمە ناو باخچەکە هەست دەکەم کە هەموو ئەو شتانەی کە نیشانمکردبوون لەناو هۆشمدا تەواون ، لێرەدا کە کەسێکی بە ڕەوشت بم ئەوا ناتوانم هێرش بکەمە سەر ڕووەکەکان هەم بە شێوەی کرداری و هەم بە شێوەی گۆتن دەربارەی چۆنیەتی ڕووەکەکان ، چونکە من پێش ئەوەی بگەمە ناو باخچەکە هەستم کردووە کە چۆنە ، ئەگەر باخچەیەکی قێزەون بوایە ئەوا

**نەدەهاتم و چۆنیەتیەکەشی بە خەیاڵ نەدەچۆوە ناو هۆشمەوە ، بەڵام گەر کەسێکی بێڕەوشت بم ئەوا دەستدەکەم بە هەڵوێستی ناشرین بەرامبەر بە هەریەك لە ڕووەکەکانی ناو باخچەکە ، هەروەها ژینگەی ناو باخچەکەش تێکدەدەم .**

**لێرەشدا ڕووندەبێتەوە کە خەیاڵ و هۆش ، ئەزموون و کردەوەش پەیوەندیەکی بەردەوامیان بە ڕەوشتەوە هەیە ، جوانی ڕەوشت و ناشرینی ڕەوشت تەنها بەدەست مرۆڤەکانە ، چونکە ئەوە مرۆڤەکانن ئەو هۆکارە جوانی و ناشرینە ڕەوشتیە دەڕەخسێنن ، بۆ ئەوەی مرۆڤ بەڕەوشت بێت پێویستە جیاوازی نەکات لە نێوان خۆی و کەسێکی تردا ، هەروەها لەنێوان ئازادی خۆی و ئازادی کەسێکیتردا ، چونکە ئەو کەسەش بەهەمانشێوەی ئەو پێویستی بە ژیانە و دەبێت پێداویستیەکانی بۆ دابینبکرێت ، هەروەها ئەو کەسەی تریش بە هەمانشێوەی ئەو مافی ژیانی هەیە و پێویستە ڕێزی لێبگیرێت .**

**– زیندەوەرەکانی تر هۆکارن بۆ دیاریکردنی ڕەوشتی مرۆڤ ؟**

**– فرووزە تەنانەت مرۆڤ بۆئەوەی بە ڕەوشت بێت پێویستە گرنگی بە زیندەوەرەکانی تریش بدات ، گرنگترین شت کە پێویستە مرۆڤ پێیی ئاشنا بێت زانستی زیندەوەرەکانی ترە ، چونکە زیندەوەرەکانی تر ژینگە بۆ مرۆڤ دەپارێزێت ، ئەگەر زیندەوەرەکانی تر بوونیان نەمێنێت ئەوا مرۆڤیش بوونی نامێنێت ، هەروەها مانەوەی مرۆڤ بە مانەوەی زیندەوەرەکانی ترەوە بەستراوەتەوە ، هەروەها تەنانەت ڕووەکەکانیش پێویستە ئەو ڕێزەیان لێبگیرێت و گرنگی و بەهایەکی تایبەتیان پێبدرێت ، چونکە ڕووەکەکانیش بەهەمانشێوە کارێگەریەکی گەورەیان هەیە لەسەر بوون و نەبوونی مرۆڤ .**

**– کەواتە داد و دادوەری شتێکی پێویستیە بۆ ئافراندنی ڕوشت .**

**– بێگومان . ڕەوشت ، داد و دادوەریە ، کاتێك کەسێك دادوەرە و نادادوەری دەکات لەنێوان کەسێك و کەسێکی تردا ، ئەوا ئەو کەسە هەرچەند دادوەریش بێت بێڕەوشتە ، چونکە دادوەرێکی سزاوار و کەرپەککار نیە .**

**– کەواتە ئەم ڕەوشتەی تۆ باسی لێوە دەکەی بۆ خۆشویستنی خاك زۆر پێویستە .**

**– خۆشەویستی بۆ خاك یەکێکە لە هەرە ڕەوشتە بەرزەکان کە مرۆڤ بتوانێت پێی بگات ، هەرچەندە مرۆڤ بە شێوەی وتە ئەو خۆشەویستیەی خۆی بۆ دووپاتدەکاتەوە ، بەڵام بە**

شێوەیەکی کرداری هیچ بوونێکی نیە ، تەنانەت هەنگاوێکیش نانێت بەشێوەی کرداری تا ئەو خۆشەویستیەی خۆی بسەلمێنێت .

– سەیزوو بە دیدی من هۆکارەکەی بۆ خۆ پەرستی مرۆڤ دەگەڕێتەوە .

– بەڵێ فرووزە ، مرۆڤ بە خەیاڵ دەیەوێت ببێتە خاوەن ڕەوشتی بەرز ، بەلاَم دڵی کەمتر داوای ئەو پێگەیە بەرزە دەکات . گەر بێت شوێنەکەیان ئاڵوگۆڕ پێبکەین ، ئەو فکرەیەی لەناو خەیاڵدا درووستبووە بیگوازینەوە بۆ دڵ و ئەو هەستە کەمەی کە لەناو دڵدا بوونی هەیە بیگوازینەوە بۆ خەیاڵ ، ئەوا ڕەوشتێك درووستدەبێت کە هاوشێوەی نابێت و هیچ کردەوەیەکیش بەبێ ئەو ڕێسایە ڕەوشتیەی کە درووستبووە لەناو دڵ بە ئەنجام ناگات .

– بۆچی دڵ ؟

– لە هەموو شتێکدا دڵ مەبەستی سەرەکیە ، نەك سەرەوژێرکردنی قسە . قسەکردن خۆشە بۆ ڕووخاندنی کێوێك ، بەلاَم کردەوەکەی زۆر ئەستەمە بۆ لابردنی تەنیا بەردێك لەو کێوە ، کێویش مرۆڤ دەناسێت ، بۆیە مرۆڤ ناتوانێت تەنیا بەرەنگاری بەردە بچوکەکانیشی ببێتەوە ، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەسەی کە قسەکە دەکات و دەروونیشی شتێشکە باسدەکات .

– ڕەوشت سامانە یان بیروباوەڕێکی پاکی دەروونی مرۆڤەکانە ؟

– ڕەوشت بیروباوەڕی پاکی دەروونی مرۆڤە بە ئەزموونەکانە ، نەك سامان و بکەوێتە دەستی کۆمەڵێك کەس ، وەك دەوڵەمەندەکان ، بەڵکو هەر کەسێك بیەوێت دەتوانێت سامان بەدەستبهێنێ  چ هەژار بێت یان دەوڵەمەند ، بەلاَم بەمەرجێك ئەو مرۆڤە لە دەروونیەوە پاك بێت ، بەلاَم  ڕەوشت شتێك نیە هەموو مرۆڤێك بتوانێت پێیبگات .

سامانی زۆر ئاماژەیە بۆ بێ ڕەوشتی زۆر ، سامانی کەمیش ئاماژەیە بۆ ڕەوشت بەرزی . بۆیە ئەمەش واتاکەی ئەوەیە کە هەرچەندە سامانت زۆر بێت زیاتر پەنا بۆ بێڕەوشتی دەبەیت ، ئەمەش بەهۆی چاو پڕنەبوونەوەیە ، چونکە وا هەستدەکەیت کە لەوانەیە ڕۆژێك ئەو سامانەی کە لەبەردەستتدایە کۆتایی پێبێت ، هەروەها لە لایەکیتر کۆمەڵێك شت ئەنجامدەدەیت لە پێناو زیاتر کردنی سامانەکەت لەوانەیە بچێتە بواری شەرمکردنەوە و لە لای خەڵکی تر بە چاوێکی نزم و بێڕەوشت لێتبڕوانرێت ، بەلاَم نیشانەی هەژاری بریتییە لە ڕەوشت بەرزی ، چونکە هەژار ناتوانێت هەندێك شت ئەنجامدات کە دەچێتە بواری نامرۆڤ

بوون و تووڕبوونی کەسانی تر ، هەرچەندە لەوانەشە زۆرترین قازانجی بۆ ئەو تێدابێت و بە ئەنجامدانی ئەو کارە قێزەونە سەراپای ژیانی بگۆڕێت ، بەڵام بەهۆی فکرکردنەوەی لەو کارە و پێشبینی بۆ داهاتوو ناتوانێت ئەو کارە بە ئەنجام بگەیەنێت ، هەروەکو مرۆڤ ڕۆژانە کردەوەی دەوڵەمەند و هەژاری بە بەرچاو دەکەوێت .

– با ئەوەمان لە فکر نەچێت ، کە کێبڕکێیەکی چاو هەیە لە نێوان هەردووکیاندا .

– فرووزە ئەمە ڕاستە . نکۆڵی لێناکرێت . هەموو کاتێك هەژار بە چاوێکی کەم سەیری دەوڵەمەند دەکات و هەروەها دەوڵەمەندیش بە چاوێکی کەم سەیری هەژار دەکات ، زۆربەی کاتیش دەوڵەمەند نوکی لووتی بەرزە و هەژارەکان بە نەفام و گێل لە قەڵەم دەدەن ، بەڵام بە پێچەوانەوە ئەوە دەوڵەمەندەکانن کە لە لای هەموو خەڵکی ئەو تایبەتمەندیەییان تێدایە ، چونکە بڕیاری زۆرینە زیاتر ئەوە دەردەخات ، چونکە هەژارەکان لە سەدا نەوەد و پێنجی جڤاك پێکدەهێنن ، بەڵام دەوڵەمەندەکان لە سەدا پێنجی جڤاك پێکدەهێنن ، مرۆڤ خۆی هۆکارە بۆ بوون و نەبوونی ڕەوشتی خۆی وەك چۆن خۆی خاوەنی خۆیەتی .

ڕەوشتی تاك لە چۆلەوانیەوە سەرچاوەدەگرێت و دواتر بەرەو جڤاك هەنگاو دەنێت .

– تێناگەم .

– مرۆڤ پێویستە سەرەتا لە دەروونی خۆیەوە دەستپێبکات و دواتر هەوڵبدات ئەم ڕەوشتە لەناو جڤاکدا بلاّو بکاتەوە ، چونکە مرۆڤ گەر خۆی دەروونی خۆی پاك نەکردبێتەوە ناتوانێت ببێتە ئامۆژگاریکاری چەند کەسانێك . گەر مرۆڤ خۆی دەروونی خۆی ئازاد نەکات و دوور نەکەوێتەوە لە هەموو بەها نا ڕەوشتیەکان و تایبەتمەندی کەسانیتر لەبەرچاو نەگرێت ، ئەوا ناتوانێت ببێتە کەسێکی خاوەن ڕەوشت و ناشتوانێت بلێت : من خاوەن ڕەوشتم .

– ئەم ڕەوشتە خۆت دیاریدەکەیت یان کەسەکان بۆتی دیاریدەکەن ؟

– کەسەکان دیاریدەکەن نەك تۆ .

– بەدیدی تۆ ڕەوشت لە شوشویەکی تەنك دەچێت .

– هیچ شتێك لەپڕ ڕوونادات تەنیا مردن و سەر شۆڕی نەبێت ، کاتێك کە ئەم دووانە ڕۆیشتن چاوەڕێ مەکە بێنەوە لات .

– خۆ پاککردنەوە مەرجی سەرەکیە . بەڵام تایبەتێتی و گشتێتی گەرەکە لێرەدا دیاریبکرێن .

– بەڵێ ، پێویستە هەموو مرۆڤێك سەرەتا خۆی پاك بكاتەوە و بەدوای ئەو شتانە بكەوێت كە گرنگن بۆ ڕەوشتی گشتی نەك بۆ ڕەوشتی تایبەتی ، چونكە بە لەبەرچاوگرتنی ڕەوشتی تایبەتی ئەوا ڕەوشت كۆتایی پێدێت و دوور دەكەوێتەوە لە دەروونی هەموو مرۆڤێك ، بەلاَم ڕەوشت كاتێك جوانتر و زیاتر دەبێت و جێگەی خۆی دەگرێت كە بۆ گشتێتی بوو لە لای مرۆڤەكان ، ئەمەش پێویستیەكە هەموو كاتێك لە دەروونی مرۆڤەكاندا بوونی هەیە ، بەلاَم كاری پێناكرێت و نایەتە دەرەوە ، هەر بۆیەشە ڕەوشت لە لای مرۆڤەكان لەناو بەندیخانەدایە ، هەروەها دەروونی مرۆڤ بۆتە بەندیخانە بۆ ڕەوشت ، بەتایبەتی ئەو كەسانەی كە هەستی پێدەكەن و دەرینابڕن .

– بەلاَم هەندێك مرۆڤ هەن هەستی پێدەكەن ، بەلاَم تەنها بە قسەكردن دەریدەبڕن ، كەواتە ئێمە كاتێك قسە لەسەر ڕەوشت دەكەین پێویستە شارەزاییمان لە هەموو تایبەتمەندیەكانی ڕەوشت هەبێت .

– بەڵێ . دەروون پیس ئەو كەسەیە كە مووی بە سەرەوە نیە و دەیەوێت سەری بتاشێت .

– مانای ئەمە چیە ؟

– مانای ئەمە بریتییە لە خودی ئەو كەسەی كە قسە دەكات بەرامبەر بە كۆمەڵێك كەس و هەوڵدەدات ئامۆژگاریان بكات ، واتە من پێش ئەوەی بابەتێك بدركێنم پێویستە خۆم ئەو تایبەتمەندیەم تێدا هەبێت ، هەروەها كاتێك كە دارگۆچانێك هەڵدەگرم پێویستە تایبەتمەندی پیریەتیم تێدا هەبێت یان كەموكوڕی لە جەستەمدا هەبێت ، بەلاَم گەر ئەو تایبەتمەندیەم تێدا نەبوو ئەوا بێڕەوشتی من لەو كاتەدا دەردەكەوێت كە پیر نەبووبم و دار گۆچانێكم بە دەستەوە گرتبێت . لێرەشدا جیاوازیەك دەكەوێتە نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ .

— فرووزە ، ڕەوشت لەلای مرۆڤ باسی لێوەدەكرێ و كاری پێناكرێ ، بەلاَم ئاژەڵ باسیشی لێوە ناكات و كاری پێدەكات . ئەمەش زۆر ئەستەم نیە كە ئەو جیاوازیە بكەین .

– چۆن ؟

– مرۆڤ كاتێك كارێك دەكات ئەوا زیان بە ژینگە دەگەیەنێت ، ئەمەش بێڕەوشتیە بەرامبەر بە ژینگە ، هەروەها كاتێك كە پاشەڕۆ فرێدەداتە دەرەوە ئەوا هەم بێڕەوشتیە لەبەرامبەر ژینگە هەم بێڕەوشتیشە بەرامبەر بە مرۆڤ ، بەلاَم ئاژەڵ هەر شتێك بكات ئەوا كارەكەی بكە بە سێ

بەشەوە ، ئەوکاتە دەبینی کە دوو بەشی کارەکەی ژینگە پارێزیە ، بەلاَم هەموو کارەکانی مرۆڤ دژی ژینگەیە .

ڕەوشت پەیوەندیەکی پتەوی بە هۆشی مرۆڤەوە هەیە ، لە کاتێکدا کە درك بەو شتە ئەخلاقیانە دەکات ، هەستەکانیش لێرەدا ڕۆڵیان هەیە ، دەبنە ڕێخۆشکەرێکی گەورە بۆ هۆش و پاشان هزراندن دەربارەیان ، لە هەمان کاتیشدا لەوانەیە پەیوەندی بە هۆشەوە نەبێت ، چونکە ئاژەڵەکان دەرکی پێناکەن و ناتوانن هەستی پێبکەن ، بەلاَم زیان بە شتەکان ناگەیەنن ، لەوانەیە ڕۆژانە چەند ئاژەڵێك ببینین کە هێرش دەکەنە سەر ڕووەکەکان ، بەلاَم گەر لەبارەی ئەو کارەیانەوە بهزرێین ئەوا زیانی پێناگەیەنێت ، چونکە ڕووتاندنەوەی دارەکان دەبێتە هۆی باشتر گەشەکردنیان ، کەواتە مرۆڤ ژینگە تێکدەدات ، بەلاَم ئاژەڵ ژینگە تێکنادات ، ئەمەش واتای ئەوەیە کە ئاژەڵەکان زیاتر ژینگە پارێزترن لە مرۆڤەکان ، دەبینین کە هەموو ئەم تایبەتمەندیە ژینگەییانەش بەزۆری لەدەروونی ئەو مرۆڤانە سەرهەڵدەدەن کە بە قسەکردن باسی دەکەن و بە هۆشیش لێیهزراون و دەیزانن ، بەلاَم خۆیان هۆکاری تێکدانەکەن و ڕاستیەکان نادرکێنن ، ئەمەش بریتییە لە بێڕەوشتیەکی گەورە بەرامبەر بە ژینگەی جڤاك .

– کەواتە ڕەوشت لێرەدا ڕوودەکاتە چاکە و خراپە به شێوەیەکی ئاشکرا .

– هەرگیز لەگەڵ کەسانێك دامەنیشە کە لەسەرەوە چاکەکارن و لە ژێرەوەش ڕەشمارن ، چونکە ئەوانە دووڕوو و خۆفرۆش و بێڕەوشتن .

– وا بزانم بابەتەکە بۆ هەموو لایەکی دەوروپشتی خۆی پەل دەهاوێت .

– بەڵێ . وەك دار گوێزەکەی بەردەم دەرگای کەلاوەکەی ئارەزوو وایە .

– تۆش ئارەزوو دەناسیت ؟

– بەڵێ .

– من ئەو ئارەزووە دەڵێم کە لە چۆلەوانیەکە و دەستی لە هەموو شتێك بەرداوە .

– نەخێر .

– کەواتە تۆ ئارەزوویەکی تر دەناسیت .

– ئارەزوو کەلاوەیەکە لەناو لادێیەکەی ئێمەدایە و دارگوێزێکی لەبەردەمە .

– تێگەیشتم کە تۆ مرۆڤ وەك دار گوێزێك سەیر دەکەی .

**– جیاوازیەکی نیە ، تەنیا مێشك نەبێت کە جیاوازی خستۆتە نێوانیانەوە .**

**– پێویست ناکات بچینە ناو ئەو جیاوازیەوە ، با بەردەوامی بە ڕێگەکەی خۆمان بدەین .**

**– کەسێك کە پابەندی بنەما ڕەوشتیەکان بوو ، ئەوا هەرگیز ناتوانێت ئەو جۆرە ئاکارە ناشرینە بئافرێنێت ، هەروەها بە مردنیشی نمونەی ئەو کەسە هەردەمێنێت و لەلایەن خەڵکانی ترەوە باسی ڕەوشتەکەی دەکرێت .**

**– بەڵێ . من هێشتا دەنگۆی ئەمە دەبیستم .**

**– نمونەی ئەو کەسە کەمە و بە ئەستەم کەسێکی تر دەتوانێت جێگەی بگرێتەوە ، ئەمەش لەلای مرۆڤەکانی تر کاتی دەوێت تا بتوانن هەمان ڕەوشت بۆ خۆیان فەراهەم بکەن ، چونکە بەدەستهێنانی هەروا ئاسان نیە .**

**– سەیزوو ، ڕەوشت پەیووەندی بە هونەرەکانیشەوە هەیە یان تەنیا لە خودی هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ دەڕوانێت ؟**

**– بەدڵنیاییەوە ڕەوشت پەیوەندیەکی تۆکمەی هەیە لەگەڵ هونەر و هونەرمەند ، چونکە هەموو مرۆڤێك هونەرمەندە لەسەر زەوی ، بەڵام هەریەکەو بەشێوەیەکی جیاواز هونەرەکەی دەئافرێنێت . هونەرمەند پێویستە هونەرەکەی لەسەر بنەمایەکی ڕەوشتی دابڕێژێت و هونەرەکەی بە ڕەوشتێکی بەرزەوە لەناو جڤاکدا بڵاوبکاتەوە ، هەرکاتێك هونەر ڕەوشتی تێدا لەبەرچاو نەگیرابێت و تەنیا بۆ فریودانی جڤاك بێت ، ئەوا هونەرمەند بێڕەوشتی بەرامبەر بە جڤاك نواندووە .**

**– کەواتە هونەرمەند لێرەدا ئەرکێکی کرۆکی دەکەوێتە سەر شان .**

**– پێویستە هونەرمەند لەپێش ئافراندنی هونەرەکەیدا بنەماکانی ڕەوشت لەناو هۆشی خۆیدا بئافرێنێ . مەرج نیە ڕەوشت تەنیا لە هونەرێکدا لەبەرچاو بگیرێت ، بەڵکو هەموو هونەرێك گەرەکە ڕەوشتی تێدا بئافرێنرێت ، چونکە ڕەوشت پەیوەندی بە هەموو بوارێکی ژیانەوە هەیە ، هونەریش بریتییە لە مانای ژیان .**

**– بەدیدی من هونەرەکان جیاوازیان هەیە ، هەریەکە و بە بوارێکی تایبەت بە خۆیەوە سەرقاڵە .**

**– بەڵێ فرووزە ، هونەر بریتییە لە زانستی ژیان ، هونەر تەنیا لەبواریکدا خۆی دەرنەخستووە**

، بەڵکو لەهەموو بوارەکانی ژیاندا خۆی دەرخستووە ، هونەریش زۆرجار بەشێوەی هۆزان یان بەشێوەی شانۆیی یان بەشێوەی موزیك دەردەکەوێت ، هەروەها بەزۆر شێوەی تریش دەردەکەوێت ، بەڵام ئەوەی لێرەدا گرنگە ئەوەیە کە کاتێك هونەرمەند هۆزانێك دەئافرێنێت چۆن ڕەچاوی ئەو بەها ڕەوشتیانە دەکات لە هۆزانەکەیدا ، ئەگەر بێت و بۆ تێکدانی کلتور و یاسا بێت ئەوا پێویستە بەپێی بنەما ڕەوشیتیەکان سزا بدرێت ، بەڵام گەر بۆ هۆشیارکردنەوەی جڤاك بێت ئەوا پێویستە بەردەوامی بە هونەرەکەی خۆی بدات .

– ئەمانە پێویستیەکن لەناو جڤاکدا .

– بێگومان ، جڤاك پێویستی بەم جۆرە هۆزانانە هەیە ، ئەمەش مایەی دەستخۆشیە بۆ ئەو هونەرمەندەی کە هۆزانەکەی نووسیووە ، هەروەها کاتێك ئەو هونەرە بە شێوەی شانۆیی ئەنجام دەدرێت پێویستە بەهەمان شێوەی هۆزان تایبەتمەندی و یاسا ڕەوشتیەکانی تێدا دیاربن و تێیدا بدرەوشێنەوە .

– بۆچی شانۆ ؟

– شانۆ بۆ ئامۆژگاریکردن و بۆ بەخۆداچوونەوەی مرۆڤەکانە ، نەك بۆ گێرەشێوێنی و گاڵتە و پێکەنین ، هەروەها کاتێك هۆزان دەنووسرێت پێویستە هەموو دەقەکانی لە پێناو هۆشیار کردنەوەی جڤاك بن نەك بۆ جوانی و بریقەداری ، هەروەها دوور بێت لە بێڕەوشتی و هێرشکردنە سەر بیروباوەڕەکان ، پێویستە تێیدا ڕێز لە هەموو بیروبۆچوونەکان بگیرێت ، نەك تەنیا هۆزانەکە بۆ باسکردنی ئەڤینی و ئەندامەکانی مێینە بێت ، هەموو کردەوە ڕەوشتیەکانیش دەگەڕێتەوە بۆ لای ئەو کەسەی کە نووسەری هۆزانەکەیە ، ڕێزو شکۆداری ئەو کەسەش بەخۆیەوە گرێدەدات کە پێشکەشی دەکات ، جا بەشێوەی ستران بێت یان بە هەر شێوەیەکی تر .

– مرۆڤ لەکارەکانیدا هەست بە بوونی ڕەوشت دەکات بۆ کارەکەی ؟

– مرۆڤ پێش ئەوەی هەر کارێك ئەنجامبدات فکر لەوە دەکاتەوە کە ئایا ئەو کارە بەرەو بێڕەوشتی دەبات یان بەرەو ڕەوشت بەرزی دەبات ، بەڵام کاتێك دەکەوێتە ناو کارەکەیەوە ئەو فکرەیە پشتگوێ دەخات .

– ئەمە نمونەیەکی بۆ تێگەیشتن پێویستە .

**– کەسێك زۆر ئارەزووی لە پلە و پایەیە لەناو جڤاکدا ، پێشتر هەموو بڕیارێك دەدات لەناو جڤاکەکەیدا کە لە بەرژەوەندی گشتیدا کار بکات ، بەڵام کاتێك کە پێی دەگات ئەو بڕیارانەی کە بە جڤاکەکەی داوە پشتگوێیان دەخات ، ئەمەش بریتییە لەوپەڕی بێڕەوشتی . کاتێك وڵات دەوڵەمەندە و مرۆڤەکان تێیدا لەبرسان دەمرن ، ئەوا مانای ئەوەیە کە بێڕەوشتی لەناو ئەو کەسەدا تواوەتەوە کە بڕیار و جێبەجێکردنی کاری هاوڵاتیانی جڤاکەکەی بەدەستە ، کەسێکە کە دوورکەوتۆتەوە لە بەها ڕەوشتیەکان ، جیاوازیکردن لە نێوان خودی خۆی و کەسێکی تریش بە هەمان شێوە بریتییە لە بێڕەوشتی و نامرۆڤ بوون .**

**– کەواتە بوونی خود بە بوونی جڤاکەوە بەستراوەتەوە .**

**– من بەهۆی جڤاکەکەمەوە دەژیم نەك بەهۆی بوونی خۆم ، خۆم تایبەتیە و دوورە لە مرۆڤ بوون ، گەر جڤاك نەبوایە من خاوەنی خۆم نەدەبووم ، گەر گشتیەتی نەبووایە ئەوا تایبەتیش بوونی نەدەبوو ، من بەهۆی جڤاکەکەمەوە زمانی نیشتمانەکەم دەزانم ، نەك بەهۆی بوونی تایبەتی خۆمەوە .**

**– لەوانەیە لێرەشەوە ڕەوشت پەل بهاوێت بۆ ئازادی و دادپەروەری .**

**– ڕەوشت پێوەرە بۆ ئازادی و دادپەروەری . بەڵێ ڕەوشت پێوەری سەرەکیە بۆ ئەو دوو پێداویستیە ، چونکە پێداویستیەکی کرۆکین بۆ بوون بە مرۆڤ . هەموو بنەمایەکی ئازادی و دادپەروەری بەهۆی ڕەوشت دەگەنە لوتکەی سەرکەوتن ، نەك بەهۆی قسەکردن و بەس ، چونکە بڕیاری ئازادی لە دەروونەوە دێتەدەر نەك بە قسەکردن ، ئەو دەروونەش هەست بە ڕەوشت دەکات بەرامبەر بەهەر تێگەیەکی ئازادی ، بەهەمان شێوەش دادپەروەری بەبێ ڕەوشت بەئەنجام ناگەیەنرێت ، گەر ڕەوشت نەبوو دادپەروەریش بوونی نیە ، دادپەروەری واتە یەکسانی لەنێوان مرۆڤەکان ، بریتییە لە پێدانی ماف بە شێوەیەکی گونجاو و ڕاستەقینە .**

**– ڕەوشت چۆن مافەکان دەگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی ؟**

**سەیزوو ؛ کەسێك گەر خاوەنی ڕەوشت بێت ئەوا ناتوانێت مافی کەسێکی تر بخوات . بۆ ئەمەش بریتییە لە گێڕانەوەی ماڵی کەسانی ماف خوراو ، کەواتە ڕەوشت دادپەروەری دەچەسپێنێت و مرۆڤ بەرەو فکرەیەکی گونجاو هاندەدات ، بەمەش نەك تەنیا تاکەکانی کۆمەڵگە بەرەو فکرەیەکی نوێ دەبات ، بەڵکو جڤاك بەم هۆیەوە بەرەو گەشەکردن و ئاوەدانی**

زیاتر دەبات ، ئەمەش دەبێت بەهۆی هەوڵدانی هەموو ئەندامێکی ناو جڤاك بێت ، نەك کەسێك بەتەنیا ئەو هەوڵە بدات ، چونکە زۆرینە سەردەکەون و کەمینەش ناتوانن ئەم بنەمایە گرنگە بە جڤاك بناسێنن .

لەکاتێکدا هەموو ئەندامانی جڤاك هەژار بن و تەنیا کەسێك تێیدا دەوڵەمەند بێت ، ئەوا ئەو کەسە بێڕەوشتترین کەسە ، چونکە ڕەوشت بەرزی ئەو کەسە ئەوەیە کە لە هەموو ڕوویەکەوە یەکسان بێت لەگەڵ هەموو تاکەکانی ناو جڤاکەکەی خۆی ، تەنیا فکرەکەی نەبێت .

ماوەیەك بێدەنگ بوو ، ئەوشوێنەی کە لێی دانیشتبوو بەرز بوو ، دواتر ڕووی کردە چۆمەکە ، چۆمێکی پڕ ئاو ، دار و دەوەن ئەمبەر و ئەوبەری تەنیوە وەك تەنی جاڵجاڵۆکە .

– ئەم جارەیان چی وایکرد کە بێدەنگت بکات ؟

– فرووزە ، لە درەنگانی شەودا و لە چۆمی بێدەنگیەوە، دنیای من وردە وردە بەرەو ڕووناکی هەنگاوی دەنا ، منیش بەردەوام بووم لە هاوڕێیەتی چۆم ، هۆشم لەو شەوەدا دوور کەوتبۆوە لە خەیاڵی خەو ، تەنیا بەرەو هاوڕێیەتی چوو بوو ، هاوڕێیەتیەك کە لەو شەوەدا ئەوەندە ئەڤینی پێوەدیاربوو وەك بڵێی دایکێك مناڵەکەی مردبێ و پاشان زیندوو بووبێتەوە و هاتبێتەوە لای . لەو شەوەدا هۆشم ماندوو نەدەبوو ، چاوەکانیشم زیاتر خۆیان بە تووڕەیی دەنواند ، چونکە هاوڕێیەتی چۆم وەك کاغەزێکی سپی پاك بوو ، خیانەتی نەبوو ، ئیرەیی نەبوو ، سەرمایەدار نەبوو ، داوێنپیس نەبوو ، هاوڕێی دووژمن نەبوو . وتەکانی ئەسریناوی بوون . لەو شەوەدا هەر ڕستەیەك و چەند نمونەیەکی هەبوو بۆ من ، بەهێواشی و لەسەرەخۆ خۆی پێدەناساندم . زیاتر لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە خۆم هەوڵدەم خۆم بە خۆم بناسێنم ، ئەو شەوە تا سپێدەی بەیان لە هاوڕێیەتی بەردەوام بووم ، پاشان کە ماڵئاوایی لێکردم ، چاوەکانم زیاتر بەرەو تورەیی دەچوون ، لە پڕ خەیاڵم فڕی بەرەو ئازادی و دادپەروەری و مرۆڤ بوونی ڕاستەقینە . ئەوەندەی نەبرد چاوەکانم لە تووڕەیی بێزار بوون و دەستیانکرد بە هەڵوەراندنی ئەسرین . هەر دڵۆپە و هاوارێکی لێوە دەهات ، هەر هاوارە و ناپاکیەکی دەسڕیەوە ، هەر ناپاکیە و نمونەیەکی ڕابردووی دەهێنایەوە خەیاڵم ، هەر ڕابردوویەکیشم داوای داهاتوویەکی پاکی دەکرد ، هەر پاکیەکیش نەفرەتی لە ڕابردوو دەکرد ، هەر نەفرەتێکیش فەرمانێکی دووژمنی لەناو دەبرد و ڕیسوای دەکرد . مرۆڤەکان لەو کاتەدا گوێیان لەو هاوارانە بوو ، بەڵام

ترس سەراپای گیانی داپۆشیبوون ، زەویش وەك بێچووە هەڵۆیەك دەمی کردبۆوە بۆ لاشەی مرۆڤەکان .

– تێگەیشتن لەمەیان بۆ من گران بوو .

– فرووزە ، مرۆڤی ڕاستەقینە بە هزرینی درووست دەست پێدەکات و هەر بە هزرینی درووستیش کۆتایی پێدێت ، هەر بەو هزرینە دنیای مرۆڤ بە ڕووناکی خۆر ئاشنا دەبێت ، مرۆڤ بوون بە بیرکردنەوەی سادە تاڵە ، گەیشتنیش پێی زۆر ئەستەمە، چونکە گەر مرۆڤێك پێی ئاشنا بێت و دواتر لێی دوور کەوێتەوە ، ئەوە دڵنیابە لەوەی کە بەلاشە لێی دوور کەوتۆتەوە نەك بە هۆش ، کەلەپچەی هۆش بە هیچ مرۆڤێك ناکرێتەوە تەنیا تاوانبارەکان و لایەنگرانی دووژمن نەبێت کە خۆیان ئەو کلیلە دەخەنە بەردەم کەسانی ناپاك ، ئەوانیش مەبەستەکانیان لە ماوەیەکی زۆر نزیکدا ئاشکرا دەبێت و هەرگیز ناشتوانن نکۆڵی لە تاوانباریەتی خۆیان بکەن ، مرۆڤی خاوەن ئەزموون هەرگیز ناتونێ ڕاستی و ناڕاستی تێکەڵ بەیەکتری بکات .

– هەموو کەسێك ؟

– تەنانەت ئەوانە نەبێت کە پەروەردەی فکرەی دووژمنن و دەیانەوێت خاك و مرۆڤەکانی خۆیان بە دووژمن بفرۆشن ، سەروەت و سامان تەنیا فکرەی ئەو کەسانەیە کە ناتوانن ویژدانی خۆیان کۆنترۆڵ بکەن ، نەك ئەوانەی لە پێناو بەرژەوەندی گشتیدا خۆیان ئازار دەدەن ، بەزۆری ئەو کەسانەی ئازار دەچێژن و ناتوانن خۆیان پشوویەك بە هۆشی خۆیان بدەن ، ئەوانەن کە لەپێناو خاك و نیشتماندا خۆیان دەکەن بە قوربانی ، هەروەها ئەوانەن کە ویژدانی خاکیەتی ڕێگەیان نادات کە هەژارانی جڤاکەکەیان برسی بن و ئەوانیش تێربن . مێرووله هەرچەندێك بباتە ژوورەوە لە دەنکە گەنم ، ئەوا ناتوانێت بەتەنیا بۆ خۆی بەفریای خواردنیان بکەوێت .

– بەڵام سەیزوو ئەمە لەناو هەموو زیندەوەرێکدا بەدیدەکرێت .

– گەدەی بچوك پێویستی بە گەدەی تریش هەیە ، گورگ هەرچەندێك زۆردار بێت ، ئەوا شێرێك هەیە بەرەنگاری ببێتەوە ، یاسا هەر بەتەنیا بۆ گورگ نەلواوە ، بەڵکو هەموو زیندەوەرانی تریش دەگرێتەوە ، بەڵام ئەو یاسایەش تەنیا لە پێناو بەرژەوەندی یەکێك لە

زیندەوەرەکان نابێت بەکار بهێنرێت ، بەڵکو بۆ بەرژەوەندی هەموو زیندەوەرەکانی تریشە ، کاتێك مرۆڤ ڕوودەکاتە ئەوەی کە ڕەوشت بناسێت ، ئەوا تامەزرۆیی ڕاستەقینە بوون زیاتر لەلای درووستدەبێت .

– ئەم ناسیەنە نکۆڵی لێناکرێ .

– مرۆڤ بوون ئەوەندە بەرزە کە بالآی هیچ کێوێك ناتوانێت بگاتە بالآی ئەو ، پاکیەتیشی لە هەموو بەفری کوێستانەکان سپی ترە ، ڕەنگی ڕاستەقینەشی لە گەلآی هەموو درەختەکان سەوز ترە .

– با بچینە سەر باسی یەکێکی تر لە پەلەکانی دار گوێزی کەلاوەکەی ئارەزوو .

– با ئەمە بەس بێت .

– لەبەر چی ؟

– لەبەر زۆر شتی ئارەزوو بۆخوازراو .

– ئاساییە .

– بۆ من ئاسایی نیە .

تەنیا چەند شتێك نەبێت .

– چەند شتێکی وەك چی ؟

– هێشتا بۆ فرمێسك دەگریاین ، فرمێسکیش بۆ ئێمە ، ڕەوشتیش بۆ ئێمە لە پاڕانەوەدا بوو . بۆ دەنگی هەڵۆکان ببوینە هاوڕێی کێوەکان ، کێوەکانیش لە پێناو ئێمەدا ببونە دووژمنی هەورە برووسکەکان . ئەسرینەکان زۆر درەنگ دەگەیشتنە سەر ڕووی خاك ، خاکیش دەیووویست شنە بایەك بێت و وشکیان بکاتەوە .

دایك دوو دەستی لە خاکدا بوون ، منداڵآن بۆ سەیرکردنی هاتبوون و لەبەردەمی دەگریان . لە کێوەکان دەنگی ئێمە و هەڵۆکان تێکەڵ بوون ، درەختەکان هەموو دەستیانکرد بە لاژانەوە هێشتا گوێمان لە دەنگی شەپۆلەکان بوو ، هاشەیان دەگەیشتە بناری چیاکان .

کوپەیەکی بەتاڵ لە ڕووخی دەریا تیشکی خۆر دەیسووتاند ، پەرداخیش بۆ گۆزەی سووتاو سەمای دەکرد . ئێمە بێدەنگ وەستابووین ، بەڵام دەریا بێدەنگ نەمایەوە تاسەر . لە ناخیدا هاتووهاوار دەستی پێکرد ، ئێمە هەر بێدەنگ بووین ، دەریا لە بێکەسیدا کەفی هەڵدا ، گۆزەش

**چاوەڕێی دوو دەستی خاکاوی بوو . نەتوانرا گۆزە پڕبکرێت ، پەرداخیش دەستیکرد بە پاڕانەوە لە هەورەکان تا گەرووی تەڕ بکات و کەمێك لە ژیان ئارامی بکاتەوە .**

**گوڵەکانیش جوانیان نەما ، لەتاو جوانیەکەیان پەنایان بردە بەر هەورە برووسکەکان ، ژیانیش وردە وردە ڕووی لە ئاوابوون دەکرد .**

**ڕەوشت لەولاوە دەهات بەرەو پیری مەرگ و جار جارەش ئاوڕی لە مرۆڤەکان دەدایەوە و خۆی تاوانبار دەکرد ، چونکە باسی دەکرا و خراپەشی لەپاڵدا دەکرا .**

**مرۆڤ پێویستە لەهەموو کارێکدا ڕەوشت بکاتە ئامانج ، نەك بێڕەوشتی ، هەموو هەنگاوێکی مرۆڤ پەیوەستە بە یاسای ڕەوشتەوە ، ڕەوشت بنەمایەکی دیار و گرنگی مرۆڤ بوونە**

**– ئەمە لە چ ئاستێکدا مرۆڤ پێی ئاشنا دەبێت ؟**

**– پێویستە هەموو منداڵێك دوای وەسەرپێکەوتن و قسەکردن ، یەکەمین هەنگاو فێری ڕەوشت بکرێت ، چونکە مرۆڤ لەم جیهانەدا فێردەبێت و هیچ پەیوەندیەکی بە وێناکردنەوەوە نیە ، من لێرەوە بەهۆی گەشەی جەستەمەوە فێری شتەکان دەبم ، هەروەها بەهۆی تێکەڵ بوون و گەڕانم بەدوای زانیندا فێری زانست دەبم .**

**– کەواتە ڕەوشت پێویستیەکە دەبێت لەگەڵ مرۆڤدا ئامادەیی هەبێت .**

**– ڕەوشت یەکێکە لەو پێداویستیە گرنگانەی کە دێتە سەر ڕێگەم و بەهۆی ئەوەوە دەتوانم چاکسازی لەخۆم و دەوروپشتەکەمدا بکەم . ڕەوشت هەردەم لەسەر زاری مرۆڤەکان ئامادەیە و بریتییە لە یەکەمین گۆتەیان ، بەڵام لە کاتی کارکردنیان لە دواوەی هەموویانەوەیە . مرۆڤ بەهۆی ڕەوشتەوە دەتوانێت بمێنێتەوە تا کاتی مردن وماڵئاوایی کردنی لە ژیان ، بەڵکو ژیانیش زۆر مەودا نادات بەو کەسانەی کە یاسا ڕەوشتیەکان پەیڕەو ناکەن ، ڕەوشتیش چەند یاسایەکی هەیە .**

**– ئەو یاسایانە چین کە مرۆڤەکان دەیگرنەبەر بۆ دۆزینەوەی خۆیان لەناو ڕەوشتدا ؟**

**– ئەم یاسایانە سێ یاسان . هەتا مرۆڤ لە ژیاندا بێت ئەوانیش لە ژیانی مرۆڤدا کار دەکەن ، هەروەها هەموو کار و کردەوەی مرۆڤەکانیش بەم یاسایانەوە بەستراوەتەوە .**

**– یەکەم یاسا چیە ؟**

**– یاسای سەرەتایە . ئەو ئاستەیە کە منداڵ لەدوای وەسەرپێکەوتن دەتوانێت پێی ئاشنا ببێت**

و ورده ورده بەهۆی ئەوەوە هەنگاو بنێت بەرەو پێشەوە و خۆی تێدا بناسێت ، ڕەوشت لەم ئاستە سەرەتاییەدا بناغەیە بۆ ڕەوشتی مرۆڤەکان لە داهاتوودا .

– یاسای دووەم ؟

– یاسای ناوەندە . ئەو ئاستەیە کە مرۆڤ پێی ئاشنا بووە ، ئەمەش لە کاتی لاویدایە و هەموو شتێکی لەبارەوە دەزانێت ، بەلاّم گرنگ ئەوەیە چۆن بەکاریدەهێنێت و دەروونی خۆی تێدا دەبینێتەوە ، ئەمەش ئاستی ئامادەکاریە بۆ مرۆڤ تا بتوانێت وەك ئامادەکاریەك بیگەیەنێت بە مرۆڤەکانی خوار تەمەنی خۆی .

– یاسای سێیەم ؟

– یاسای کۆتاییە . ئەمەش ئاستی کۆتاییە و هێشتا مرۆڤ پێویستی پێیەتی لەو ماوە کەمەی کە لە ژیانی ماوە ، بەلاّم ئەوەندەی پێ ئاشنا بووە کە بتوانێت مرۆڤانی تر بەو ئاستە ئاشنا بکات و بیانگەیەنێتە نزیکی ئەوەی کە ئەوانیش وەك ئەو لێی تێبگەن و بەرەو کوێیان بەرێت . وەك ئەوەی کە فێرکەرەکەم فێریکردم کە هەرگیز وێنەی کەس نەکێشم تا بێڕەوشت دەرنەچم ، بەڵکو هەوڵدەم لە ئاوێنەکانەوە سەیری خۆم بکەم و وێنەی ڕەوشتی خۆم بکێشم .

– مرۆڤ دەتوانێت ئاستی ڕەوشتی کەسێکی تر دیاریبکات ؟

– بە مەرجێك سەرەتا لە خۆیەوە دەستپێبکات ، چونکە مرۆڤ هەتا ئاستی ڕەوشتی خۆی دیارینەکات و نەزانێت چۆنە و تا چەندە ، ئەوا ناتوانێت ڕەوشتی کەسێکی تر دیاریبکات و بزانێت ئاستی ڕەوشتی ئەو کەسە چۆنە و تا چەندە ، بەلاّم لە دوای ناسینی خۆی دەتوانێت بەشێکی کەم لە ڕەوشتی کەسێکی تر دیاریبکات ، ئەمەش کاتێکی زۆری پێویستە بۆ ئەو کەسانەی کە هەوڵدەدەن بتوانن ڕەوشت پێناسە بکەن و هەڵیسەنگێنن بۆ کەسانی تر ، ئەمەش زیاتر دەچێتە بواری ناساندنی خودی مرۆڤ خۆی .

هەرگیز هاوڕێکانت مەکە بە قوربانی بیرۆکەکانت ، هەموو کاتێکیش هەوڵدە ڕاست و هەڵەکانیان بۆ ڕوونبکەیتەوە ، چونکە بێڕەوشتی دەبێتە کار و پیشەی هەمیشەییت و لەگەڵتدا دەژیت .

– ڕەوشت بەرزی چۆن لەناو جڤاکدا بلاّودەبێتەوە ؟

– ڕەوشت بەرزی لە تاکەوە بەرەو گشتیەتی دەڕوات ، ئەویش ئەوەیە کە تۆ بتوانی یاساکانی

**ژیان بە جڤاك بناسێنی و هەوڵبدەی چۆن جڤاك بەرەو نەشونماکردنی فکرەی تازە و پاك بەریت ، فکرەی پاك ئەویە کە تۆ کەسانی تر لە فکرەی دووبارە و ڤێزەون دوور بخەیتەوە ، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە تۆ داهێنانت لەناو جڤاکدا کردووە ، ئەمەش جیاوازی نیە لەنێوان گەورەیەك و بچوکێکدا ، بەڵام پێش ئەوەش پێویستە خۆت بهزریت و دواتر ئەم کارە ئەنجام بدەیت ، چونکە هەموو شتێك لەخۆتەوە سەرچاوە دەگرێت .**

**– کەواتە نمونەیەك بهێنەوە با بزانم چۆن ئەو ڕەوشت بەرزیە تەشەنە دەکات ؟**

**– بۆنمونە ، سەرکردەیەك گەر ڕەوشت بەرز بێت ، فکرەو بۆچوونەکانی وەك پێشنیار دەردەبڕێت ، نەك بیانکاتە یاسا و بەسەر جڤاکەکەیدا بیانسەپێنێت .**

**– با ئەم باسە کۆتاییی بێت لەسەر ڕەوشت . با ڕوو بکەینە جوانی شتەکان ، چونکە ئەمە خۆی ڕەوشتی ڕاستەڤینەیە .**

**– منیش ئارەزووم لێیە کەمێك بچینە سەر باسی جوانی .**

**– ئادەی سەیزوو ، جوانی بەلای تۆوە چ مانایەك دەدات بەدەستەوە ؟**

**– جوانی بریتییە لە بنەما و بەهای ڕەوشت و یەکسانی و ئازادی و دادپەروەری بۆ مرۆڤ بوون لە ژیاندا ، " جوانی بریتییە لە ناوەڕۆکی شتەکان نەك ڕووخساری شتەکان " ، هەروەها بریتییە لە پەرتوکێك کە ناوەوەی وەك بەفر سپی بێت و ڕووی دەرەوەشی پیس و ڤێزەون بێت ، یان بریتییە لە کارێك کە بەرنامە و یاساکانی لەوپەڕی تەواوەتیدابن ، هەروەها بریتییە لە دەروونی شتە زیندووەکان و خستنە ڕووی جوانیەکەیان . ئێمەی مرۆڤ بەردەوام لە ڕووخسار دەڕوانین نەك لە ناوەڕۆکی شتەکان ، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە نەتوانین جوانی پێناسە بکەین ، چونکە جوانی بریتییە لە ئاکاری جوان لە هەموو ڕوویەکەوە ، واتە کاتێك کەسێك کارێك بە ئەنجام دەگەیەنێت و کارەکەی بەو پەڕی دڵسۆزی و پاکیەوە ئەنجام دەدات ، ئەوا ئەو کاتە جوانی پێدەوترێت ، بەڵام ئێمەی مرۆڤ هەموو کاتێك بە شتی ڕێك و دەم و چاوی ڕێك دەڵێین جوانی ، ئەمەش لە یاسای جوانیدا بوونی نیە ، چونکە کردەوە و ئاکارەکانی مرۆڤ جوانی دەردەخەن نەك ڕەنگ و ڕووخساری مرۆڤ ، هەروەها کاتێك دەچینە بواری پەروەردە کردنەوە ، ئەوا دەتوانین جوانی تێدا دیاری بکەین ، منداڵ کاتێك لەلایەن**

دایك و باوكیەوە پەروەردە دەكرێت ، ئەو پەروەردەیە لە ماوەیەكی كەمدا ڕوودەكاتە ناو جڤاك یان فێرگەكان ، كاتێك فێری ئەوە دەكرێت كە چۆن هەڵسوكەوت بكات ، ئەوا بەهەمانشێوەی ئەوان كە پێیان وتووە لە دەرەوە بە ئەنجامی دەگەیەنێت ، لە هەمان كاتدا بەهۆی ئەو هەڵسوكەوتەوە دەتوانرێت جوانی منداڵەكە و هەم دایك و باوكەكەش دیاریبكرێت .

– باشە ، نمونەیەكم بۆ بهێنەوە .

– گەلێك نمونە هەیە بۆ ئەمە فرووزە .

– یەكێك لەو نمونانە باس بكە .

– كاتێك من دەچمە فێرگەیەك ، لەو فێرگەیەدا چەند فێركارێكی تێدایە ، لە سەرەتای ساڵەوە ، هەریەك لەو فێركارانە وانەیەكم بۆ باسدەكات و هەوڵدەدات بە جوانترین شێوە فێرم بكات . پاشان دەگەمە كۆتایی ساڵ و وانەكان كۆتاییان پێدێت ، لەوكاتەدا تاقیدەكرێمەوە ، دوای تاقیكردنەوەكانیش نمرەكانم وەردەگرمەوە . سەیری نمرەكانم دەكەم ، ئەوكاتە بەپێی نمرەكانم دەتوانم جوانی ئەو فێركارە دەستنیشانبكەم ، بەڵام مەرج نیە نمرەی باش ئاماژە بۆ جوانی فێركارەكە بكات ، بەڵكو نمرەی خراپیش ئەو جوانیە دەستنیشاندەكات ، لەوانەشە ئەو فێركارەی كە نمرەم خراپە لە وانەكەیدا ، بەرنامەی ئەو لە هەموو فێركارەكانی تر جوانتربێت ، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كە ئەو فێركارە هەوڵی ئەوەی داوە كە من بگوشێت بە هۆی نمرەكانەوە تا بتوانم زیاتر هەوڵبدەم ، لە ئەنجامیش من بەهۆی ئەو گوشینە نمرەییەوە دەتوانم زۆرترین شت فێر ببم ، ئەمەش خۆی لەخۆیدا جوانە ، هەروەها ئەو فێركارە یاسایەكی جوانی هەیە بۆ فێركردن .

– ئەم جوانیە لەلای هەموو مرۆڤەكان وەك یەكە ؟

– سرووشتی مرۆڤ  وا ڕەخساوە لەناو گەردووندا فێری ئەوە دەبێت كە چۆن جوان و ناجوان لە یەكتری جودا بكاتەوە ، هەر تاكێكی مرۆڤ لە تاكێكی تر جیاوازە ، ئەمەش بەهۆی هەستەكانەوە لە یەكتر جیا دەكرێتەوە ، لەناو ئەو جیاوازیەشدا جوانی یەكێكیان لەویتر جیاوازە ، ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئاكارانەی كە خۆی دەیانئافرێنێ نەك بۆی دەئافرێنرێت . زۆر جار ئارەزووەكان دەبنە هۆی جیاكردنەوەی جوانی و ناجوانی ، ئەمەش بەپێی ئارەزووی مرۆڤەكان دەگۆڕێت ، لەوانەیە من شتێكم لەلا جوان بێت ، بەڵام لەوانەیە كەسێكی تر شتێكی

تری لەلا جوان بێت ، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئارەزووە تایبەتیەکانی تاك ، من لەوانەیە چێژ لە شتێك ببینم ، بەڵام لەوانەیە کەسێکی تر چێژی لێنەبینێت ، چونکە مەرج نیە ئەوەی لەلای تۆ جوانە لەلای کەسانی تریش جوان بێت ، یان ئەوەی لەلای تۆ چێژ بەخش بێت لەلای کەسانی تریش ئەو چێژەی هەبێت .

– جوانی تایبەتێتیە یان گشتێتیە ؟

– جوانی سەرەتا ڕوودەکاتە تایبەتیەتی ، دواتریش بەرەو گشتیەتی .

– تۆ سەرەتا وتت تایبەتێتیە .

– ڕاستە ، بەڵام بەپێی ڕای زۆرینە دەبێت بە گشتێتی ، سەرەتا بەپێی ئارەزووە تایبەتیەکان دیاریدەکرێت و دەگەڕێتەوە بۆ ئارەزووەکانی خودی تاکەکە ، دواتر ئارەزووە گشتیەکان . لەوانەیە زۆرینە ڕایان لەسەر جوانیەك هەبێت ، ئەو کاتەش دەبێت بە گشتێتی ، یان لەوانەیە بۆ زۆرینەی خەڵکی ئەو ئاکار نواندنە بە سوود بێت ، ئەو کاتە دەبێت بە جوانیەك بۆ هەمووان ، واتە گشتێتی .

– کەواتە جوانی سەرەتا بە قۆناغێکی تایبەتیدا تێپەڕ دەبێت .

– بەڵێ .

– سەرچاوەی جوانی دەگەڕێتەوە بۆچی ؟

– سەرچاوەی جوانی دەگەڕێتەوە بۆ هەستەکان و دەروون ، هەروەها دەگەڕێتەوە بۆ توانای مرۆڤ ، بۆ ئافراندنی شتەکان بە تەواوەتی و بێ کەموکوڕی ، کە لێرەدا مرۆڤ لە ڕێگەی هەستەکانەوە دەتوانێت جوانی تایبەتی بۆ خۆی بئافرێنێ ، بۆ نمونە ، لە هەستی بۆنکردندا ، من کاتێك بۆنی گوڵێك دەکەم بۆنەکەی لەلای من چێژێکی تایبەتی هەیە و لەوانەیە بۆ من ئارامبەخش بێت ، کەواتە ئەو گوڵە لەلای من جوانە ، لەوانەشە لەلای کەسانی تر ئەو بۆنە خۆشە نەدات بەدەستەوە و ئەو چێژە تایبەتیەی نەبێت ، چونکە ئەمەش بەپێی کەسەکان دەگۆڕێت ، هەروەها هەستی تامکردن : من ئارەزووم لە خواردنێکە ، ئەو خواردنە چێژێکی تایبەتی بە لاشەم دەبەخشێت ، چونکە ئارەزووم لێیەتی و تامەکەی لەسەر زارمە ، ئەمەش بۆ من جوانە و چێژێکی خۆی هەیە لەلای من ، بەڵام دیسانەوە لەلای کەسانی تر جیاوازە ، لەوانەیە ئەو خواردنە لای کەسێکی تر ئەو چێژەی نەبێت و بەبێ تام وەسفی بکرێت ،

**ئەمەش مانای ئەوەیە کە هەستەکانیش لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاوازن .**

**– کەواتە بە دیدی تۆ جوانیەکان جیاوازن بەپێی جیاوازی هەستەکان .**

**– هەستەکان وا دەکەن کە تۆ شتێکت لەلا جوان بێت ، بەلاَم مەرجی سەرەکی ئەوەیە کە تۆ لەوکاتەدا چ هەستێکت هەیە بۆ ئەو شتە ، لێرەدا ئەوەت بۆ دەردەکەوێت ، کە ئەگەر شتەکەت بە هەستێکی خۆشەوە وەرگرت ، ئەوا ئەو شتەش جوانە ، بەلاَم گەر بە هەستێکی ناخۆشەوە وەرتگرت ، ئەوا ئەو شتە بۆ تۆ جوان نیە و ناچێتە بواری جوانیەوە لەلای تۆ .**

**– کەواتە من و تۆ هەر لە شێوەدا جیاواز نین ، بەڵکو لە دەروونیشەوە جیاوازین .بەلاَم ئەی دەروون چی ؟**

**– دەروون سەرچاوەیەکی گرنگی جوانیە بۆ مرۆڤ ، بەشی هەرە زۆری جوانیەکان لە دەروونەوە سەرچاوە دەگرن ، چونکە زۆربەی شتە وروژێنەرەکان دەگەڕێنەوە بۆ لای دەروون .**

**– وا هەستدەکەم لەمەشیاندا پێویستم بە نمونەیەکە .**

**– ئاساییە . بۆنمونە ئاوازێکی هونەری پێشکەش دەکرێت . لەو کاتەدا لە ڕێگای هەستی بیستنەوە دەروون دەوروژێنرێت و چێژە تایبەتیەکانی بۆ دەگوازرێتەوە ، لەو کاتەدا دروون ئارام دەبێتەوە بەهۆی ئەو ئارەزووە تایبەتیەوە کە پێی گەیشتووە ، هەروەها بۆ هەستکردن بە جوانی پێویستە دەروون ئامادەیی هەبێت .**

**– کەواتە هەستەکان و دەروون پەیوەندیەکی پتەویان بەیەکەوە هەیە بۆ گشت جوانیەکان .**

**– بێگومان فرووزە . دەروون کۆگایەکە بۆ چالاکی هەستەکان و هەستەکانیش شتەکان بۆ دەروون دەگوازنەوە ، کەواتە دەروون کانگای هەستەکانە ، جوانیش لەلای دەروونەوە وەردەگیرێت و چێژی تایبەتی خۆی پێدەدرێت .**

**– هونەریش بەهەمان شێوە لە دەروونەوە دەئافرێنرێت ؟**

**– پێویستە ئەوە بزانیت . گەر لە ڕوانگەی جوانیەوە ڕووبکەینە هونەر ، هونەر بەرهەمێکی درووستکراوی مرۆڤە ، مرۆڤ لەگەڵ سرووشتی خۆی و لەناو دەروونی خۆیدا دەیئافرێنێت ، لێرەشدا دەتوانێت جوانی و ناجوانی هونەر لە یەکتری جودا بکاتەوە ، هونەر دەبێت بۆ جوانکردنی جڤاك و هۆشیارکردنەوەی جڤاك بئافرێنرێت ، نەك بۆ دووبارەبوونەوەی ئافراندنەکانی پێشوو ، کەواتە جوانی هونەر لە ئافراندنی جوانی تازەوە سەرچاوەدەگرێ و**

دەگاتە لووتکەی سەرکەوتن .

– ئەی ئەم خۆشەویستی و جوانیەی کە لەناو مرۆڤەکاندا بوونی هەیە ، چی ؟

– زۆربەی خۆشەویستی و جوانی نێوان مرۆڤەکان لە پێناو بەرژەوەندی دایە ، نەك لەپێناو بەدەستهێنانی ڕەزامەندی یەکتر و دەرخستنی دڵسۆزی بۆ یەکتر ، ئەمەش وایکردووە کە جوانی نێوان مرۆڤەکان بوونی نەمێنێت و جوانی ببێتە بەرژەوەندی . جوانی بۆتە ئارەزوویەك بۆ خۆ پڕکردن و بەرامبەر قڕ کردن . لە کاتێکدا کە هاوڕێکەت پێویستی بە تۆیە و یارمەتی دەدەی ، بەڵام تۆ پێویستیت بە ئەوە و ئەویش یارمەتیت نادات ، کەواتە تۆ هەوڵتداوە جوانی هاوڕێیەتی بسەلمێنیت ، بەڵام ئەو نەیتوانی ئەوە بسەلمێنێت .

– مەگەر جوانی پنتێك نیە بۆ پەیووەندیەکی توند و تۆڵ ؟

– جوانی نێوان هاوڕێیەتی بریتییە لە پەیوەندیەکی پتەو و توندوتۆڵ ، ئەمەش بەتایبەتی لەنێوان کەسانێکدا ڕوودەدات کە یاساکانی جوانی پەیڕەودەکەن ، بەڵام مرۆڤەکان هەمیشە ناتوانن ئەو یاسا جوانیە لەبەرچاویبگرن و کاریپێبکەن .

– سەیزوو ، بە دیدی من هۆکارەکەی زیاتر بۆ ڕاستی و ناڕاستی وتن دەگەڕێتەوە .

– فرووزە . ئەو دوو وشەیەی تۆ باسی لێوەدەکەی ، تەواوە . چونکە جوان ڕاستی وتن لە لای مرۆڤەکان زۆر گرانە ، وەك ئەوە وایە بانگ بکرێن بۆ ئەرکێکی پیرۆز ، بەڵام خۆی لێبشارنەوە ، هەردەم سرووشتی مرۆڤەکان وا ڕاهاتووە کە ڕاستیەکان بە جوانی و تەواوەتی نادرکێنن ، خۆیان لە ڕاستیەکان لادەدەن و دەیانشارنەوە ، چونکە بڕوایان وایە کە ڕاستیەکان بدرکێنن لەوانەیە تووشی سزای قورس ببنەوە ، بەڵام لە هەمان کاتیشدا ئەو ڕاستیانە جوانترین بابەتی ناو جڤاکن و لەوانەیە بە چاوێکی پیرۆزەوە سەیری ئەو مرۆڤە بکرێت کە ڕاستیەکە بە تەواوی و جوانی دەدرکێنێ .

– ئەمە زیاتر ڕووناکاتە دەسەڵات ؟

– ئیدی نکۆڵی لەوە ناکرێ کە پەیووەندیەکی زۆری بە دەسەڵاتەوە هەیە . وەك ڕاستیەکانی دەسەڵات و چۆنیەتی بەڕێوەبردنی . کاتێك کەسێك ڕاستیەکان دەزانێ و دەیانشارێتەوە ، بەڵام لە کاتێکدا دەریاندەخات کە بەرژەوەندی خۆی تێدا ببینێتەوە ، کەواتە ئەمەش هەم ناجوانیە و هەم بێڕوشتیە بەرامبەر بە جڤاك ، چونکە بەهۆی شاردنەوەی ئەو ڕاستیانە کۆمەڵێك

بەرژەوەندی گشتی خستۆتە ژێر پێیەکانی بەرژەوەندی تایبەتیەوە ، لە لایەکی تریش هەم ئەو وایکردووە کە دەسەلأت بەرەو ناجوانی و بێڕەوشتی بەرێت ، هەم واشیکردووە کە خۆی ناجوان بکات لەناو جڤاکدا ، کەواتە لێرەدا ناجوانی و بێڕەوشتی یەکدەگرنەوە و بەهۆی چەند کەسانێکەوە جوانیان پێدەدرێت یان ناجوانیان پێدەدرێت .

– کەواتە من و تۆ و هەموومان هۆکارین بۆ ئافراندنی جوانیەکان .

– ئێمە زۆر جار بە خەیاڵەکانمان جوانی دەئافرێنین ، بەلأم ئەو جوانیە تەنیا جوانیەکی خەیاڵیە و نابێتە جوانی بەردەست و ڕاستەڤینە ، چونکە ئێمە بە خەیاڵ شتێك درووستدەکەین و هەر بە خەیاڵیش لەلامان جوانە ، لە کاتێکدا ئێمە ئەو شتەمان نەبینیووە و تەنیا خەیاڵێکە لەناو هۆشی ئێمەدا درووست بووە . نمونەش بۆ ئەمە زۆرە .

من لە خەیاڵمدا ڕەنگی گوڵێك درووستدەکەم ، بە شێوەیەك کە خۆم ئارەزووم لێیەتی ، دواتر شوێنەکەی هەر لە خەیاڵمدا نیشانە دەکەم ، کە ئەو خەیاڵەم لێرەویەوە هەستدەکەم هێشتا لەناو هۆشمدا بوونی ماوە ، بەلأم ئەو گوڵەی کە من لە خەیاڵمدا نیشانم کردبوو پێش کەمێك ، ئەوا لەم جیهانەی کە من هەستی پێدەکەم نە بوونی هەیە و نە لەو شوێنەشە کە من لە خەیاڵمدا نیشانم کردووە .

– ئەو خەیاڵەی تۆ باسی لێوەدەکەی پەیوەستە بە جوانی ڕاستەڤینەوە ؟

– نەخێر ، چونکە تەنها بە هۆش هەستی پێدەکەم و ناتوانم ڕاستی و درووستیەکەی بسەلمێنم ، بەهۆی تێپەڕبوونی کات بوونی نامێنێت لەناو هۆشدا ، کەواتە ئەو جوانیە بریتییە لە جوانی خەیاڵ نەك جوانی ڕاستەڤینەیی .

– ئەم جوانیەی کە لەڕیگەی خەیاڵەوە درووستدەبێت ، جیاوازی هەیە لە نێوان مرۆڤەکاندا ؟

– ئەو جوانیەش بە پێی خەیاڵی مرۆڤەکان دەگۆڕێت ، هەروەها چۆنیەتی شوێن و ڕەنگەکەشی دەگۆڕێت ، زۆر جار ئێمە شەیدای ئەو خەیاڵە دەبین کە بوونی نیە بە شێوەیەکی ڕاستەڤینە ، چونکە ناتوانین دەستی لێبدەین یان تامی بکەین ، بۆنی بکەین ، هەروەها ناشتوانین بە شێوەیەکی ڕاستەڤینە بچینەوە سەر ئەو شوێنەی کە ئێمە لە خەیاڵماندا درووستمانکردبوو ، کەواتە بوونی جوانی ڕاستەڤینە بە بوونی شوێنی ڕاستەڤینەوە بەستراوەتەوە . ئەو جوانیەشی کە بۆ ئێمە دەستدەدات و لەبەر دەستدایە ئەوا ئافرێنراوی خۆمانە .

– کەواتە لێرەدا وا دەردەکەوێت کە سەرچاوەی جوانی ڕاستەقینە ، ڕەهایە .

– بە دڵنیاییەوە خەیاڵە . لەکاتێکدا بە خەیاڵ جوانیەك نیشانەدەکەین و دواتر بە کردار ئەو جوانیە دەئافرێنین ، ئەوا بریتییە لە جوانی تەواو و ڕاستەقینە ، چونکە زۆربەی ئافرێنراوە جوانیەکان سەرچاوەکەیان بۆ خەیاڵ دەگەڕێتەوە ، بەڵام تا نەئافرێنرێن بە شێوەیکی کرداری و نەیەنە بەردەست و بە هەستەکان درکی پێنەکرێت ئەوا جوانی ڕاستەقینەیان پێناوترێت و ناتوانرێت ناوی ڕاستەقینەییان لێبنرێت .

– باشە ، لەمەودوا ئاشنایەتیەکم لەگەڵ جوانیدا پەیداکرد . بەڵام دەروونی مرۆڤ لێرەدا چ ڕۆڵێك دەگێڕێت ؟

– جوانی مرۆڤ بریتییە لە دەروونی نەك لە ڕووکاری دەرەوەی . دەروونی مرۆڤ دەتوانێت جوانیەکان بئافرێنێت و لاشەیان پێ جوان بکات ، بەڵام لاشە هیچ جوانیەکی نیە تاوەکو بە دەروونی ببەخشێت ، چونکە لاشە کۆیلەی دەروونە .

– دەروونی مرۆڤیش ڕۆڵی خۆی هەیە بۆ جوانی . بەڵام چ نمونەیەك هەیە بۆ ئەمە ؟

– فرووزە ، من دەزانم کە بۆ ئەمەش نمونەیەکت پێویستە .

بۆنمونە کاتێك مرۆڤ نائارامی دایدەگرێت ، ئەوا بە دەروونی ئەو نائارامیە درووستدەکات ، لاشەش بەهۆی ئەو نا ئارامیەوە تێکدەچێت بە شێوەی جۆراوجۆر وەك لاواز بوون یان لاواز بوونی دەم و چاو ، تووشبوون بە نەخۆشیەکان ، هەروەها لاواز بوونی زۆربەی ئەندامەکانی لاشە ، کەواتە جوانی بریتییە لە ئاکار کە مرۆڤ بە دەروونی خۆی دەیئافرێنێت .

– فرووزە ، هەرگیز بە بەرزی چیاکان کارێگەر مەبە و بە جوانیەکەیان فریو مەخۆ ، چونکە کاتێك کە شەویان لێدادێت ئەوا سێبەرەکەشیان نامێنێت .

– ڕاستە ، سەیزوو . لەوانەیە ئێمەی مرۆڤ ڕۆژانە زۆر لە شتەکان ببینین کە جوانیان بێسنوور بێت ، بەڵام کاتێك کە لە ناوەڕۆکەکەیان دەکۆڵینەوە ئەوا قێزەونترین شت دەردەچن لەلامان .

— فرووزە ، لەوانەشە بەزۆری لەناو مرۆڤە رووخسار جوانەکان ئەمە بەزۆری ڕوو بدات ، چونکە زۆربەی مرۆڤە جوانەکان لە ڕووکاردا جوانن ، بەڵام کاتێك کە سەیری ناوەڕۆکیان دەکەین جوانیان هێندەی پووشوویەکی با بردوو نیە ، چونکە دەروونی مرۆڤە ڕووکار جوانەکان هەرگیز سزاواری جوانی نین ، ئەمەش بەهۆی هەڵسوکەوت و ڕەفتار و پۆزی باڵاَ و

ڕووخسارەوە سەنگی جوانیان بۆ خۆیان نەهێشتۆتەوە .

– ئەمە تایبەتە بە ڕەگەزێك ؟

– نەخێر ، فرووزە . ئەمەش تەنها تایبەت نیە بە ڕەگەزێك ، بەڵكو هەردووك ڕەگەزی نێر و مێ دەگرێتەوە ، لەپاڵ هەموو ئەمانەشدا نێر و مێی دەوڵەمەندەكان ، كە هەرگیز شیاوی جوانی نین و ناگەن بە جوانی ، ئەمەش بەهۆی بەرزایی لوتیانەوە بەرامبەر بە كەسە هەژارەكان و كەم دەرامەتەكان ، بۆ ئەمەش قێزەونترین كەسی ناو جڤاكن ، چونكە خۆیان و لارولەنجەكانیان ئەم ناجوانیەیان بۆ خۆیان دەستنیشانكردووە ، ئەمەش بەزۆری لە كاتێكدا دەردەكەوێت كە كەسێكی هەژار لەبەردەمیان وەستاوە ، ئەمەش بریتییە لەوپەڕی ناجوانی و بێڕەوشتی ، چونكە جوانی بریتینیە لە مادی ، بەڵكو بریتییە لە دەروون ، كەواتە دەروونی مرۆڤ هۆكارە بۆ جوانی خۆیی و ئەو ئاكارانەی كە لەناو جڤاكدا دەیانئافرێنێت ، ئەمەش خۆی لە خۆیدا جوانی و ناجوانی دەردەخات .

– مادام دەوڵەمەند و هەژار هەیە لێرەشدا ، ئەوا توندوتیژیش سەرهەڵدەدات هەندێك كات .

– بێگوان ، توندوتیژی ڕەگەزێك بەرامبەر بە ڕەگەزێكی تر هۆكارە بۆ جوانی و ناجوانی خودی مرۆڤ خۆی . توندوتیژی لەلایەن كەسێكەوە بە ئەنجام دەگات كە خودی خۆی بێدەسەڵاتە ، یان كەسێكە لە بەرزترین شوێنی دەسەڵاتە ، ئەوەی كە لەلایەن كەسێكی بێدەسەڵاتەوە ڕوودەدات ئەوا ئەو كەسە پێیناوەتە ئاستێكی ناجوانیەوە و لەهەمان كاتیشدا هەنگاویناوە بەرەو بێڕەوشتی ، ئەوەشی كە لەلایەن ئەو كەسەوە ڕوو دەدات كە لە بەرزترین شوێنی دەسەڵاتە ، ئەوا لەلایەك هەم خودی خۆی ناجوانە هەم ئاكارەكەشی ناجوانە ، لەلایەكی ترەوە هەم بێڕەوشتیە و هەم نازانستییە و دوورە لە هەموو بەها ڕەوشتیەكان و یاساكانی جوانی ، ئەمەش ناجوانی بۆ ناو جڤاك دەئافرێنێ و وادەكات لە نەشونماكردن بیوەستێنێت ، ئەو وەستاندنەش درێژە بكێشێ .

– سەیزوو ، با ئەمە بەس بێت .

— بەڵێ فرووزە ، تەنیا شتێك نەبێت .

– چ شتێك ؟

– ئەو شتەی كە چەندەها شتی تر لەناو خۆیدا كۆدەكاتەوە . بەردەوامیش لەناو هۆشمدا دێن و

دەچن ، دواجاریش دەڵێن . جوانی برایەکی زۆر نزیك بوو لێمان ، بەڵام هەر کارێکمان کە دەکرد پرسمان پێنەدەکرد .

دەروونیش لەولاوە وەك کۆیلەیەك بێزار ببوو بەهۆی فەرمانەکانی هۆش . هۆش و جەستە هاوڕێیەکی لە مێژینەی یەکتر بوون . یەکتریان زۆر خۆشدەویست . گوڵەکانیش تازە پەیمانی هاوڕێیەتیان لەگەڵ هەنگەکان بەستبوو .

من و هاوڕێ کۆنەکەم بەردەوام بەیەکەوە کارماندەکرد و نهێنیەکانی خۆشمان بەیەکتر نەدەوت ، دڵی هەریەکەشمان لەلای کەسێکی تر بوو .

بەهار تازە لە سەفەر گەڕابۆوە و لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە تەیرەکان لەگەڵ خۆیدا ئاشتبکاتەوە ، بەڵکو بتوانێت سەدای دەنگیان بۆ لای خۆی ڕابکێشێ . دەروونی هەریەکەشمان دوای لە جەستەمان دەکرد کە ڕێگەی خۆی تەواو بکات و بەتەنیا ملی ڕێگا بگرێت ، چونکە مرۆڤە خراپەکان ڕێگەیان چۆڵ نەدەکرد بۆ ئێمە ، تا بتوانین لە ناوەڕاستیدا گوڵەکان بچێنین . بەیانیان زوو من و تەیرە دەنگ خۆشەکان بەیەکەوە لەخەو هەڵدەستاین . پەنجەرەکانیش هێشتا کراوە بوون و تەنانەت پەردەیەکیشیان پێوەنەبوو .

ئێمە جوان نەدەبووین و کەسانێکیش لە دوورەوە جوانیان نەشونمایدەکرد ، چونکە ئێمە ناچار نەکرابووین ، بەڵام خۆمان خۆمانمان ناچار کردبوو کە لە خۆمان دوورکەوینەوە .

دوای ئەم باسە لەسەر جوانی ، فرووزە وەڕێکەوت بەرەو ناو لادێیەکە ، پێش ئەوەی بگاتە لادێیەکە تووشی کەسێکی تر بوو کە سەرقاڵی موزیك ژەنی بوو . فرووزە کەمێك لە دوورەوە ڕاوەستا بەدیاریەوە ، بەڵام هەرچەندی دەکرد هیچ دەنگێك نەدەهاتە بەر گوێیەکانی ، چونکە مەبەستی ئەوە بوو لەکاتی هاتنی دەنگی موزیك خۆی تەنیا بێت و کەس لە چواردەوری نەبێت . فرووزە پێیوابوو ، کاتێك کە دەنگی موزیك هات ئەوا تەنیایی خۆشترە لە جەنجاڵی . پاش چاوەڕێکردنێکی کەم و لەبەر نەهاتنی دەنگی موزیك ، ناچار فرووزە لێی نزیك بۆوە ، تا ئاشنایەتیەك لەگەڵ ئەو کەسە و موزیك ژەنیدا پەیدا بکات .

– سلاّو .

– سلاّو له تۆش .

– ناوت چیه ؟

– زامیاد .

– ئەی تۆ ؟

– فرووزه .

– زامیاد ، ئادەی کەمێکی تر موزیکەکەت بە دەنگ بهێنه ، بەڵکو منیش کەمێك له ماندوویەتیەکەم کەم بێتەوه .

– بەدڵنیاییەوه فرووزه ، ئاوازەکانی موزیك ئارامی به لاشەی مرۆڤ دەبەخشن .

زامیاد دەستیکرد به موزیك ژەنی ، فرووزەش کەوتە ناو خەیاڵ و ئارەزووە بێ بنەکانی .

ماوەی چەند کاتژمێرێك موزیك ژەنیەکەی زامیاد بەردەوام بوو ، لەپڕ یەکێکله داوەکانی ئامێره موزیکیەکەی پسا . فرووزەش لەو کاتەدا بۆی دەرچوو له خەیاڵەکانی و هاتەوه سەر خۆی .

– زامیاد ، ئامێره موزیکیەکان تا چەند بەلای تۆوه خۆشەویستن ؟

– ئامێره موزیکیەکان خۆشەویستیان لەلای من بێسنووره ، چونکه ژیان لەلای من بریتییه له موزیك . موزیکیش بریتییه له تەواوکەری هونەر . لەلای من گەر موزیك نەبێت ئەوا خۆشەویستی مرۆڤ بوونی نیه ، گەر خۆشەویستیش له مرۆڤدا نەبوو ئەوا خۆشەویستی له ژیانیشدا بوونی نیه .

– کەواته هونەر بەلای تۆوه چ مانایەك دەگەیەنێت ؟

– هونەر وەسیلەیەکه بۆ پیشاندانی ڕووی جوانی و توانای فیکری مرۆڤ ، هەروەها بۆ نیشاندانی ڕواڵەتی جوانی نەتەوه و جڤاکه ، هونەر هەستێکی بێ واسیته و ڕاستەوخۆی مرۆڤەکانه . هونەر ڕاستەوخۆ له دەروونی مرۆڤەوه بەرهەم دێت و دەئافرێنرێت ، هەروەها هونەر خودی ئەو ڕاستەڤینەتیەیه که ئاشکرا دەبێت و دەبێته بابەتی مشتومڕ و لێکۆڵینەوه لەنێو مرۆڤەکاندا ، ئەمەش هەستێکه له ناخی هەموو مرۆڤێکدا بوونی هەیه ، هەر مرۆڤێکیش که لەدایك دەبێت خاوەنی وەها هەستێکه ، پەروەردەکردن و راهێنانی ئەو

هەستانەش ئاكاری هەموو مرۆڤەكانە .

هونەر هەموو ئەو ئارەزووانەی كە لەناو خودی مرۆڤدا سەرهەڵدەدەن وەدیار دەخات و دەیانخاتە بەردەمی جڤاك . هونەر بەرهەمێكە كە هەستەكان دەوروژێنێت ، بەتایبەتی ئەو هەستانەی كە بەرهەمی جوانین ، هونەر خۆی دەستكەوتی كەسانێكە كە هونەرەكەیان تایبەتە بە جوانی . بابەتی هونەری بنەمایەكە كە لەگەڵ توخمە تایبەتیەكاندا هاوسەنگ دەبێت ، هەروەها بەرهەمێكە كە لەگەڵ دەروون و فیكرەی مرۆڤەكاندا هاوهەنگاوە و شانبەشانی تەمەن دەڕوات ، مرۆڤ تەمەنی هەرچەندێك بێت ئەوا هونەریش ئەوەندە هاوهەنگاویەتی و لەتەكیدا دەژیەت و لێی جودا نابێتەوە .

هونەر ڕێچكەیەكی تایبەتیە بۆ دۆزینەوەی جوانیەكان ، بەتایبەتی ئەو جوانیانەی كە لە دەروونی مرۆڤەكانەوە سەرهەڵدەدەن ، هونەر دەرخستن و لێكجیاكردنەوەی جوانی و ناجوانیە بۆ مرۆڤ لەناو سروشتدا .

– كەواتە دەستنیشانكردنی پنتی جوانیە .

– بە دڵنیاییەوە . هونەر وەك بابەتێكی بێكۆتایی و بابەتێكی هەتاهەتایی ڕۆڵی خۆی دەگێڕێت ، واتە هونەر هەتاهەتایە لەگەڵ جوانیدا دەژی .

یاسای ژیان ئاوهایە ئەگەر مرۆڤ نەبێت ، هیچ شتێك لەناو گەردووندا بوونی نیە ، واتە بوونی هەموو شتەكان بە بوونی مرۆڤەوە بەندە و بەستراوەتەوە ، هونەر تێگەیەكە مرۆڤ هەروا بە ئاسانی ناتوانێت پێی بگات ، بابەتێك نیە مرۆڤ بتوانێت خۆی لێ لابدات ، واتە هونەر بابەتێكە لە هەموو شتێكدا بوونی تایبەتی خۆی هەیە .

– هونەر لەلای هەموو مرۆڤەكان هەمان مانای خۆی دەدات بە دەستەوە ؟

– نا فرووزە ، مرۆڤەكان جیاواز دەربارەی هونەر دەهزرێن . هونەر لای مرۆڤێكی سادە و لای هۆزانڤانێك و لای بیرمەندێك جیاوازە ، چونكە هەموو كات جوانی و هزراندن لە پێش هونەرەوەن ، واتە پێش ئافراندنی هونەرێك لای هۆزانڤان گەرەكە جوانی بئافرێنرێت بە هزر ، چونكە هزرین لەپێش ئافراندنی هونەرە . هزرین جوانترین و تەواوترین هونەر دەهێنێتە بوون . بەرهەمی هونەری بەرهەمی سرووشت نیە ، بەڵكو دەستكەوتی چالاكیەكانی مرۆڤە ، بەرهەمی هونەری تەنیا بۆ مرۆڤ هاتووە ، چونكە مرۆڤ خۆی ئافراندوویەتی . لەلایەكی

تریشەوە بۆ چێژ و هەستەکانی مرۆڤە و هیچی تر .

– بەرهەمی هونەر سنووردارە یان بێ سنوورە ؟

– بەرهەمی هونەری لە خۆیدا بێسنوورە ، بەگشتی لەوەتەی ژیان هەیە هونەر گرنگیەکی تایبەتی پێدراوە ، چونکە هونەر لە هۆش و هەستی مرۆڤەوە هەڵدەقوڵێ ، واتە جەوهەری هونەر بریتیە لە هۆش و هەست ، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ سەر ئەو هەستانەی کە تایبەتن بە دەرکی جوانی . هونەر لە هەموو سەردەمێکدا ڕۆڵ و گرنگیەکی تایبەتی خۆی هەبووە ، ئێمەی مرۆڤ هەموو کاتێك دەوروژێنرێین بە موزیك و بەرهەمە هونەریەکان ، لێرەشدا ئارەزووی مرۆڤەکان بۆ موزیك جیاوازی هەیە . هەر کەسە و ئارەزووی لە یەکێك لە ئامرازەکانی موزیك هەیە و هەرکەسە و بە جۆرە ئاوازێك کاریگەرە ، کەواتە هەموو مرۆڤەکان ئارەزوویان بۆ موزیك هەیە بەلاَم بەشێوەیەکی جیاواز ، ئەمەش واتای ئەوەیە کە ئەو ئارەزووە موزیکیە بەپێی مرۆڤەکان دەگۆڕێت .

– هونەر و جەنگ بەیەکەوە هەڵدەکەن ؟

– بە دڵنیاییەوە فرووزە . هونەر لە هەموو سەردەمەکاندا یەکێك بووە لە پێشەنگەکانی جەنگ ، هەروەها بابەتێکی گرنگ بووە بۆ سەرکەوتنەکان و بردنەوەی جەنگ ، ئەمەش بەهۆی ئەوەوە بووە کە هەستی سەربازەکانی وروژاندووە بە ئاوازە هەمە چەشنەکانیەوە . مادام لە سەرکەوتنەکانی جەنگدا ڕۆڵی گرنگی بینیووە . کەواتە موزیك بابەتێکی گرنگە بۆ پاراستنی خاك و نەتەوە ، لە لایەکی تر لەپاڵ سروودەکاندا ئەم کاریگەریەی خۆی دەردەخات .

هونەر دەورێکی بالاَی هەیە بۆ بەرەو پێشبردنی جڤاك ، چونکە هونەر ڕۆژ لەدوای ڕۆژ هەنگاو دەنێت بەرەو قۆناغێکی نوێتر . هونەر بەرهەمێکە کە هەستەکانی مرۆڤ دەوروژێنێت ، بەتایبەتی ئەو هەستانەی کە هەڵبژاردەی جوانیەکانن ، ئەمەش لەلای هۆزانڤان زیاتر دەناسرێتەوە ، چونکە هۆزانڤان شارەزایی هەیە بەهۆی قۆناغەکانی ژیانی ، لێرەشدا بە شێوەی هۆنراوە یان شانۆ کاریگەریەکانی خۆی دەنوێنێت . لەبەرئەوەی هونەر بەرهەمی کەسانێکە کە هەست بە جوانیەکان دەکەن ، ئەوا هونەر پەیوەندیەکی تۆکمەی هەیە لەگەڵ دەروونی مرۆڤ ، زۆربەی مرۆڤەکان بەهۆی هونەرەوە دەروونیان ئارام دەبێت ، ئەمەش بەهۆی هەستەکانەوە کاریگەری خۆی لەسەر مرۆڤ دادەنێت .

مرۆڤ هەر هەنگاوێك بنێ بەرەو پێشەوە ، ئەوا هونەرە ، بەڵام ئەو هونەرە لەلای خۆیەوە سەرچاوەی گرتووە نەك ئەوەی كە بە سرووشتی خۆی بۆی ڕەخسابێ .

– گشت كەسێك دەتوانێت ببێت بە هۆزانڤان ؟

– نا فرووزە ، ڕاستە هەموو مرۆڤێك هۆزانڤانە لە شتێكدا . بەڵام هەموو مرۆڤێك لە موزیك و شانۆ ، هۆنراوەدا ناتوانێت ببێت بە هۆزانڤان . چونكە گەر من بمەوێت ببمە هۆزانڤان ئەوا دەبێت تایبەتمەندی هونەریم تێدا هەبێت ، گەر تایبەتمەندی هونەریم تێدا هەبێت ئەوا ئەوكاتە دەتوانم هونەرێك بئافرێنم ، چونكە دەستكردی خۆمە نەك دەستكردی سرووشت ، ئەو هونەرەشی كە من مەبەستمە دەتوانم بەهۆی هەوڵەكانی خۆمەوە تۆكمەترین داهێنانی لەسەر بكەم .

– كەواتە ئەم گەردوونەش تەنیا هۆزانڤانێك ئافراندوویەتی .

– بەڵێ فرووزە . هۆزانڤانی گەورە ، كاتێك كە جیهانی درووستكرد پێویستی بە هیچ بەندەیەكی لە قوڕ و ئاگر نەبوو ، چونكە خۆی هۆزانڤانێكی بێ سنوور بوو ، تەنیا بوو ، بەڵام ئەوە بەندەكان بوون كە هاناو هاواریان بۆ یەكتر هێناو چەند ئەژدیهایەكیان بۆ خۆیان بڕیاردا. هونەر دەئافرێنرێت ، نە ئافرێنراوە پێشتر . ئەوە تۆی كە لە هۆشی خۆتەوە درووستت كردووە و بەپێی هزراندنی خۆت بڕیاری بوونەكەت داوە . ئەوەشی پێشتر هەبووە ، بەهەمان شێوە مرۆڤەكان ئافرندوویانە ، چونكە ئەوانیش هونەر ئافرێن بوون ، بەهەمان شێوەی ئێستا ، ئەمەی ئێستاش لە داهاتوودا كاریگەری خۆی زیاتر دەنوێنێ و لەگەڵ مرۆڤەكان زیاتر ئاشنایی خۆی پەیدا دەكات .

دوای ئەم باسە ماوەیەك وەستا و چەند چركەیەك لە موزیكەكەی ڕوانی .

– چی بوو زامیاد ، ئاوها لەپڕ وەستای ؟

– فرووزە ، خەیاڵم بەرەو هۆنراوەیەك چووە ، ئەو هۆنراوەیەش باس لە نەهامەتیەكانی ژیانی منداڵیم دەكات .

– ئادەی با منیش دەربارەی ئەو نەهامەتیانەی منداڵیت شتێك بزانم .

– بێگومان منیش ئارەزووم لێیە كەمێك لە ژیانی من هەموو ئەوان تر بزانی .

لە ڕووخی چۆمەكانەوە وەستابووین و سەیری زیندەوەرانی ناو ئاوەكانمان دەكرد ، بەڵام تەنیا

دەنگی تەیرەکان دەهاتە بەر گوێمان و دەروونیان دەوروژاندین . ئێمە لەپڕ دەهاتینە ناو چۆمەکان بۆ مەلەکردن ، بەبێ ئەوەی بزانین قوڵاییەکەیان چەندە و بەرەو کوێ بارگەیان تێکناوە ، ئەوەش لە نەزانی خۆمانەوە بوو .
من لەگەڵ هاوڕێکانمدا پیاسەم دەکرد و جار جارەش دەنگی ئاوی چۆمەکانم دەهاتە بەر گوێ ، کە خەیاڵمیان دەبردەوە بۆ ڕۆژانی پێشوو .
هێشتا ڕووناکی خۆر بەدەرەوە بوو ، تەیرەکانیش نەگەڕابوونەوە ناو هێلانەکانیان ، بێچووەکانیش لەبرسان کەوتبوونە جریوە جریو و ئەو ناوەیان پڕ کردبوو لە دەنگی برسی .
من لەپڕ لە هاوڕێکانم جیابوومەوە و بەرەو لای درەختێك ڕۆیشتم ، لەژێر درەختەکە بینیم سمۆرەیەك چاوەکانی لەدەستداوە و ناتوانێت بەبێ چاو بە درەختەکە هەڵگەڕێت .
جڤاکیش بۆ ئازادی نوزە نوزی گریانی بوو ، منیش شمشێرەکەم بە دەستەوە گرت و بەرەو دووژمن کەوتمە ڕێ ، بەلاّم دووژمن زەمەنێك بوو لەو شوێنە نەمابوو .
موزیك ژەنەکان لەترسان چووبوونە ناو کاوەکانی چیا بەرزەکان و ئێشکیان لەیەکتر دەگرت ، بەدەم ڕۆیشتنیشەوە داوەکانی موزیك دەزرنگانەوە و ئاوازێکیان لێدەردەچوو .
هێشتا مانگەشەو بوو من و هاوڕێکانم بەیەکتر شاد بووینەوە ، بەلاّم گوڵەکان هێشتا کەلەپچەیان لەدەستدا مابوو ، هاواری نەهەنگەکانیش گوێیەکانیان کاز کردبووین لە کانیاوەکاندا .
پیاڵەکانی بەردەم گۆزە هێشتا بۆنیان لێنەبڕابوو ، گۆزەکان لەجێگەی خۆیان ڕزیبوون ، منیش بەرە بەرە و لەسەرخۆ خۆڵەکەیانم کۆکردەوە و فڕێم دانە ناو چۆمەکەوە .
دایکانی بەردەم فێرگە لە منداڵەکانیان دەپرسی ، بەلاّم بەساڵاچووەکان وەلاّمیان دەدانەوە ، لاوەکانیش لە تەکیانەوە ڕاوەستابوون و چاوەڕێی فێرکارەکانیان دەکرد بێنە دەرەوەی فێرگە .
ڕۆژان بەپەلە هەنگاویان دەنا بەرەو پێشەوە ، منیش پیر بووم و ڕیش و سەری سپی هەڕەشەی مەرگی لێدەکردم ، منیش بە هەناسەیەکی ساردەوە وەلاّمم دەدایەوە .
ماوەی دوو کاتژمێر دەنگی موزیك ئەو ناوەی پڕکردبوو ، هەر چرکەیە و بە سەدایەك ، بەلاّم زۆری پێنەچوو داوەکان پسان و سەدایەکانی موزیکیش نەمان . کوڕی ڕۆشنبیریش لەولاوە هاتبوون باسی موزیك بکەن ، بەلاّم هیچکام لە ئامێرەکانی موزیکیان نەبینیبوو ، هەربۆیە لە

نیوەی باسەکەیان گیریان خوارد و ڕاوەستان .
دنیا ڕووناك بۆوە و قرژاڵەکانی بەردەم چۆم هەڵسان لەخەو ، پاش چەند کاتژمێرێك چریکەی ماسیەکان دەوروپشتی ئێمەی پڕ کرد ، بەلآم سەدایەکی دروستکراویان هەبوو ، نەك سرووشتی ، چونکە خۆیان دروستکراو بوون ، تایبەتمەندی سروشتیش بەرەو ناوچەیەکی تر کۆچیکردبوو . بە هەمان شێوەش هونەر مرۆڤی نە دەئافراند ، بەڵکو مرۆڤ هونەری دەئافراند ، ئەمەش دەستکردی خۆی بوو نەك سرووشت ، هونەر پێش مرۆڤ نەبوو ، بەلآم مرۆڤ پێش هونەر هەبوو .
دەنگەکان باڵندەکانیان درووست نەدەکرد ، بەڵکو باڵندەکان دەنگەکانیان درووست دەکرد .
جوانی هونەرەکانی دەرنەدەخست ، بەڵکو هونەرەکان جوانیەکانیان دەردەخست ، ئەمەش بۆ هۆزانڤان تا ڕادەیەك گران بوو بۆ هزرینەکانی بەرامبەر بە هونەر .
دەروونی ئێمە ببۆوە هاوڕێیەکی تازە لەگەڵ موزیك ، موزیك ژەنەکانیش تا ڕادەیەك بە ڕێزەوە مامەڵەی هونەریان لەگەڵ دەروونەکاندا دەکرد . هەربۆیە من و خاتوون ببوینە گوێگری موزیکی بیانیەکان ، هەر دەم نا دەمێکیش ئەمەی دووبارە دەکردەوە ، منیش بە دووبارەکردنەوەیان هەراسان دەبووم .
باڵندەکانی رووخ چۆمەکان بەرەو کوێستانەکانی سەرووی خۆیان کۆچیانکرد ، من بەتەنیا لەگەڵ دەروونی خۆمدا مامەوە بۆ گفتوگۆکردنی هونەری .
موزیك ژەنەکانیش هاتنەوە بۆ لای ئامێرە موزیکیەکان ، بەلآم ئاوازەکانی پێشتر گیانیان دەرچووبوو ، کۆرپەی موزیکیش تازە فێری گاگۆڵکەی ئاوازەکان دەبوو .

فرووزە ئەویشی بەجێهێشت و روویکردە ناو لادێیەکە ، لەناو لادێیەکەدا کۆمەڵێك خەڵکی بینی کە لە چواردەوری کەسێك کۆببوونەوە ، فرووزەش خۆی پێنەگیرا و زیاتر نزیك بۆوە ، کاتێك کە چۆوە ناو خەڵکەکە ، بینی کەسێك قسەیان بۆ دەکات لەسەر زمان .
فرووزە لەو شوێنە لەگەڵ خەڵکەکە وەستا تا سوود وەربگرێت لەم بابەتە گرنگە کە بابەتی

زمان بوو ، ئەو کەسە باسی زمانی دەکرد ، کە چۆن زمانمان پاراو بکەین و زمانی نەتەوەیی خۆمان بپارێزین ، بەڵام خۆشبەختانە ئەو کاتەی کە فرووزە گەیشتبۆوە ئەو شوێنە ، ئەوانیش تازە پەروەردەکەیان دەستپێکردبوو ، ئەوەش بۆ فرووزە وەك ئەوە وابوو کە بانگکرابێت بۆ ناو پەروەردەکە .

ئەو کەسەی کە ئەم بابەتەشی وروژاندبوو ، ناوی هایدار بوو .

پێش ئەوەی کەسێك دەستبکات بە گفتوگۆ یان تێبینیەکی هەبووبا ، سەرەتا دەبوو ناوی خۆی بە ئامادەبووان بناسێنێت . دواتریش لەلایەن هایدارەوە پرسیاری لێدەکرا .

کەسێك دەستییپێکرد .

ناوی من مەردومە .

من پێموایە سەرەتا پێویستە پێناسەیەك بۆ زمان بکەین .

– چ پێناسەیەك ؟

زمان بریتییە لە دەربڕینێکی دەنگی کە هەموو مرۆڤەکان کار و کردەوەکانی خۆیانی پێ ئەنجام دەدەن ، هەروەها بریتییە لە ئامێرێکی بزوێنراوی هۆشی مرۆڤ ، کە بەهۆیەوە دەتوانێ پەیووەندی بکات و شتەکانی بگەیەنێت بە دەوروبەر ، هەروەها ئامانج و مەبەستەکانی خۆی پێ بگەیەنێتە ئەنجام .

لەلای من زان بە سێ ئاستدا تێپەڕ دەبێت .

– ئاستی یەکەم ، وەك چی ؟

– ئاستی منداڵی .

– ئادەی ڕوونیبکەرەوە .

– منداڵ سەرەتا بەشێوەیەکی کەم فێری وشەکان دەبێت ، هەروەها بەرە بەرە بەهۆی گەشەکردنی لاشە و تەمەنی ، فێری وشە و زاراوەکانیش دەبێت .

– هەنگاوی یەکەم بۆ فێربوونی منداڵ لە کوێوە دەستپێدەکات ؟

– سەرەتا لە لایەن دایك و باوکەوە فێری ناوەکان دەبێت و دواتر لەناو جڤاکدا ، بەڵام پێویستە سەرەتا فێری زمانی دایك بێت ، هەروەها سەرەتا لەلایەن دایك و باوکەوە پەروەردەی زمان بکرێت ، گەر بێتو پەروەردەیەکی باش و تەواو بکرێت ئەوا بەدڵنیاییەوە زووتر فێری ناوی

**شتەکان و زاراوەکان دەبێت ، منداڵ چەند گرنگی پێبدرێت لەلایەن دایك و باوکەوە هێشتا کەمە ، چونکە دواتر ئەو پەروەردەیە کاریگەری تەواوی لەسەر دادەنێت لە داهاتوودا . ئەو ئاستە کە ئاستی منداڵیە ، ئاستێکی زۆر کاریگەرە ، واتە بنکی زمانە بۆ ناسینەوە و زانینی شتەکان .**

**– هەموو دایك و باوکێك گرنگی بە منداڵەکانیان دەدەن ؟**

**– ئێمەی مرۆڤ بەشێوەیەکی کەم گرنگی بە منداڵەکان دەدەین ، بەلاّم کاتێك کە پێدەنێنە ئاستی لاوی ئەوا گلەیی و گازندەیان لێدەکەین لەبەر نەزانینی شتەکان ، بەلاّم هەڵەکە بۆ ئەوان ناگەڕێتەوە ، بەڵکو بۆ دایك و باوك دەگەڕێتەوە کە پێشتر تا چەند گرنگیان بەو منداڵە داوە ، لەگەڵ ئەوەشدا زۆرێك منداڵ هەن پەروەردە ناکرێن لەلایەن دایك و باوکەوە ، بەلاّم خۆیان گرنگی بە خۆیان دەدەن ، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ توانای منداڵەکە خۆی نەك دایك و باوك ، زمان بۆ هەموو منداڵێك گرنگی و تایبەتمەندی خۆی هەیە ، بەتایبەتی لە دوای تێپەڕبوونی تەمەنی لە ئاستی منداڵی و ڕووکردنە ناو جڤاك . دواتریش ئەوە زمانەکەیەتی کە ئەو توانایەی پێدەبەخشێت بۆ ناسین و گفتوگۆکردن لەسەر شتەکان ، زمان گەورەترین ئامرازی مرۆڤە بۆ نەشونماکردنی فیکری .**

**– ئاستی دووەم ، وەك چی ؟**

**– ئاستی لاوی .**

**– لەم ئاستەدا مرۆڤ بەچی دەگات ؟**

**– لەو تەمەنەدا کە ئاستی منداڵی تێپەڕاندووە و گەیشتووە بەوەی کە خۆی فکر لە وشەکان و زاراوەکان بکاتەوە .**

**– لێرەدا بە تەواوی فێری شتەکان بووە ؟**

**– هێشتا تەواو فێری شتەکان نەبووە ، بەلاّم لە پەروەردەی خێزانی دەرچووە و هاتۆتە ناو جڤاکەوە ، لێرەدا بەپێی کات توانای زمانی مرۆڤەکان گەشەکردن بەخۆیەوە دەبینێت .**

**– لێرەدا ئەرك دەکەوێتە سەر کێ ؟**

**– لێرەدا ئەرك دەکەوێتەوە سەر خۆی ، تاچەند گرنگی بە زمانی خۆی بدات ، ئەمە زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ پەروەردەکردنی پێشوتر کە لەلایەن دایك و باوکیەوە بینیویەتی .**

– لێرەدا دەتوانێت فێری هەموو شتەکا ببێت ؟

– لێرەدا یاخود لەو ئاستەدا هەوڵدەدات کە فێری زۆربەی شتەکان ببێت ، بەڵام هەموو شتێك بەتەواوی فێر نابێت ، چونکە ئەمەش بەپێی کات و تەمەن زیاتر فێری شتەکان دەبێت ، بەتایبەتی بەهۆی گەڕان و تێکەڵاو بوونەوە ، هەروەها لەگەڵ ئەوەشدا فکر لەوە دەکرێتەوە کە لە ئاستی منداڵیدا زۆربەی ناوەکانی نەزانیووە ، بەڵام ئێستا فکرە و هزرینی گەشەی کردووە لەڕووی ناسینی زمانەوە ، کەواتە زمان گەورەترین هۆکارە بۆ بەرەو پێشەوە چوونی توانای فکری بەتایبەتی لە ئاستی لاویدا ، ئێمەی مرۆڤیش کاتێك کە دەگەینە تەمەنی لاوی وا هەستدەکەین کە کەموکوڕیمان تێدایە ، کاتێك کە هەست بەو بۆشاییە دەکەین هەوڵدەدەین خۆمان گەشە بە خۆمان بدەین لەڕووی هزرینەوە ، بۆ ئەمەش فکر لە چەندەها ڕێگەی جۆراو جۆر دەکەینەوە ، بەتایبەتی ئەو ڕێگایانەی کە ئێمە دەگەیەنێت بە ئاستی زانین ، بەڵام لێرەدا تووشی بەربەستێکی تر دەبینەوە کە ئەویش زمانە ، کەواتە بەبێ تۆکمەکردنی زمان ناتوانین بە ئاستی زانین بگەین بە شێوەیەکی تەواوەتی ، ئەمەش زیاتر بەهۆی گەڕان و دۆزینەوەی کەموکوڕیەکانی خۆمان ، دەگەین بەو ئەنجامەی کە ئێمە مەبەستمانە پێبگەین و تێبگەین ، کەواتە زمان هۆکارێکە بۆ نەشونماکردنی مرۆڤ لە هەموو ڕوویەکەوە بە شێوەیەکی گشتی .

– ئاستی سێیەم ، وەك چی ؟

– ئاستی دوای لاوی .

– وابزانم ئەمە کۆتاییی تەمەنە ، گەر بە هەڵەدا نەچووبم .

– بەڵی . ئەمە کۆتایی تەمەنە . ئەمەش لەکاتێکدایە کە ئاستی لاوی تێپەڕاندووە و بەتەواوی فێری زۆربەی وشەکان بووە ، ئەمەش زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ ئەزموونی تەمەنەکەی .

ئێمەی مرۆڤ کە بەهۆی هۆش لە زیندەوەرانی تر جیا دەکرێینەوە ، بەڵام زمانیش یەکێکە لە هەرە هۆکارە سەرەکیەکانی مرۆڤ کە لەدوای هۆش لە زیندەوەرەکانی تر جیایدەکاتەوە ، ئەمەش لەکاتێکدا کە مرۆڤ خۆی ئەو تایبەتمەندیانە دەزانێ .

– زیندەوەرانی تریش زمانیان هەیە ، ئەوەت لە فکر نەچێت ؟

– ڕاستە ، زیندەوەرانی تریش تایبەتمەندی زمانیان تێدا هەیە ، بەڵام ئەو تایبەتمەندیەی کە ئەوان هەیانە بریتییە لە تەنیا پارچە گۆشتێك و هیچی تر ، ئەوش زیاتر بۆ تامکردن و چێژ

وەرگرتنە لە خواردن ، بەلاّم لەلای مرۆڤ هەم بۆ تامکردن و چێژ وەرگرتنە لە خواردن و خواردنەوە ، هەم بۆ دەربڕین و گەیاندنە ، چونکە مرۆڤ دەتوانێ قسە بکات ، بەلاّم زیندەوەرەکانیتر ناتوانن قسە بکەن ، لەگەڵ ئەوەشدا لەوانەیە هەندێك لە زیندەوەرەکان دەنگیان هەبێت لە شێوەی بۆڕە و قیژە و لوراندن ، بەلاّم ئەوە ناچێتە بواری ئەوەی کە گوایە ئەوانیش دەتوانن قسە بکەن ، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا ئەو دەنگەی ئەوان بۆ ئاگادار کردنەوەی یەکترە ، چونکە زۆربەی زیندەوەرەکان بە کۆمەڵ دەژین و ناتوانن بە تەنیا ژیان بکەن .

– ئەی مرۆڤ ؟

– مرۆڤیش یەکێکە لەو جۆرە زیندەوەرە کۆمەلاّیەتیانەی کە تەنیا دەتوانێت بە کۆمەڵ بژیت ، بەلاّم هەموو زیندەوەرانیتر بەم شێوەیە نین ، هەروەها زیندەوەرانیتر هەن کە دەتوانن بە تەنیا و تاك تاکیش ژیان بکەن .

– زمانی مرۆڤ چ تایبەتمەندیەکی تری تێدایە ؟

– تایبەتمەندیەکی تر ئەوەیە کە زمانی مرۆڤ بەردەوام لە گەشەکردندایە ، ئەویش بەهۆی گەڕان و تێکەلاّو بوون لەگەڵ یەکتریدا ، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ مرۆڤەکان فێری وشەی تازەتر و پڕماناتر ببن ، بەتایبەتی لە ئاستی دوای لاویدا ، لێرەدا مرۆڤ دەگات بەو ئەنجامەی کە تەواو چیتر پێویستی بە پاراوکردنی زمان نەبێت .

– مەرجە مرۆڤ لەم ئاستەدا بگات بە زانینی تەواوەتی ؟

– بەداخەوە هەرچەندێك لە ژیان بەردەوام بیت هێشتا زمان کۆتایی نەهاتووە ، چونکە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ وشەی تازەتر بۆ زمان سەرهەڵدەدەن لەناو هۆشی مرۆڤەکاندا ، ئەمەش خۆی لە خۆیدا بە داهێنانی زمان هەژمار دەکرێت . کەسێکیش گەر بیەوێت مرۆڤ بوونی خۆی بسەلمێنێت ، پێویستە داهێنانی زمانی هەبێت ، چونکە تەنها ئاکارەکانی تر مرۆڤ بوون ناسەلمێنن ، بەڵکو زمانیش ئەو ڕۆڵە دەگێڕێت .

– کەواتە مرۆڤ بوون چیە بەلای تۆوە ؟

– مرۆڤ بوون هەر ئەوە نیە کە بخۆیت و بنویت ، بەڵکو ئەوەیە کە تۆ بزانی بە چ زمانێك ئاخاوتن دەکەی و خاکەکەت کەوتۆتە کوێ و لە کوێ دەژیت و دەمریت .

– چی تر مرۆڤ جیادەکاتەوە لە زیندەوەرانی تر ؟

**– مرۆڤ بەوە جیاکرێتەوە لە زیندەوەرەکانی تر کە زیندەوەرێکی کۆمەڵایەتیە و بەتەنیا ناتوانێت خواست و ویستەکانی خۆی دابینبکات ، هەروەها مرۆڤ زیندەوەرێکە دەتوانێت پەل و پۆ بۆ ڕابردوو و ئایندەش بهاون . بەڵام ئاژەڵەکان ناتوانن پەل و پۆ بهاون بۆ ئاینده و ناشتوانن لەو چوارچێوەیەی کە تێیدا دەژین بچنە دەرەوە ، چونکە زیندەوەرەکانی تر هەرچەندە توانای بیستن و بینینیان هەیە بەڵام ناتوانن وەك مرۆڤ بیربکەنەوە ، ئەمەش پەیوەندی بە هۆشەوە هەیە ، نەك جەستە ، چونکە مرۆڤ فکرەی هەیە و دەتوانێت بهزرێت ، بەڵام زییندەوەرەکانی تر ناتوانن بهزرێن و داهاتوو دەستنیشان بکەن .**

**– کەواتە لەلای تۆ ، زمانیش یەکێکە لە داهێنانەکانی مرۆڤ ؟**

**– مرۆڤ هەر لەسەرەتای مێژووەوە هەتا ئێستا بە چەندین قۆناغدا تێپەڕیووە ، قۆناغ لەدوای قۆناغ توانیویەتی شتی تازەتر و پڕ بایەختر دابهێنێت ، زمانیش یەکێك بووە لەو داهێنانەی کە ئەمڕۆ ئێمە دەرکی پێدەکەین ، هەروەها یەکێکە لەو تایبەتمەندیە سەرەکیانەی کە مرۆڤ بەهۆیەوە دەتوانێت خواست و ویستەکانی خۆی دابینبکات . زمان تاکە ڕێگەیە بۆ ئاشنابوون بە هزر و فیکری وڵاتانی تر ، بۆ ئەمەش پێویستە مرۆڤ هەر لەسەرەتای لەدایك بوونیەوە کاتێك کە فێری قسەکردن دەبێت فێری بنەما پەروەردەییەکانی زمان ببێت .**

**– پەروەردە چ پەیووەندیەکی بە زمانەوە هەیە ؟ خۆ ئێمە تەنیا باس لە فێربوونی زمان دەکەین .**

**– گەر پەروەردە نەبوو لە زماندا ئەوا پێشکەوتن و نەشونماکردنی زمانیش بوونی نابێت . پێویستە مرۆڤ سەرەتا زمانی دایك فێر ببێت ، چونکە تا مرۆڤ زمانی دایك بە تەواوی فێر نەبێت و پەروەردەی زمانی دایك نەکرێت ، ئەوا ناتوانێت پەرە بە زمانی تر بدات ، چونکە زمان تایبەت نیە بە وڵاتێك ، بەڵکو زمان تایبەتە بە هەموو وڵاتێك .**

**– پێویستە مرۆڤ فێری زمانی تریش ببێت ؟**

**– پێویستە مرۆڤ لەدوای فێربوونی زمانی دایك ، هەوڵبدات زمانی تریش فێر ببێت ، ئەمەش بۆ شارەزابوون و فراوانکردنی زمانی دایك پێویستە ، هەروەها تایبەتمەندیەکی تریشی ئەوەیە کە زمان وڵات دەناسێنێ ، ئەم ناسینەش دەبێتە هۆی پەیووەندی ، لە نێوان پەیووەندیەکانی تری وەك ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و کۆمەڵێك پەیوەندی تر کە**

**پەیوەندیان بە ولاتەوە هەیە .**

**– کەواتە بە دیدی تۆ زمان شارستانیەتیش درووستدەکات .**

**– بەڵێ . زمان پەیووەندیەکی گرنگی بە شارستانیەتەوە هەیە ، لێرەدا پێویستە هەموو تاکێکی ناو جڤاك ئەوە لەبەرچاو بگرێت و پەروەردەی زمانی خۆی ببینێت ، چونکە بەبێ زمان شارستانیەتیش بوونی نیە ، ئەوە زمانە شارستانیەت درووستدەکات ، هەروەها لانکەی شارستانیەت بریتییە لە زمانی تایبەت بە خۆ ، شارستانیەت لەسەر بوونی زمان ڕاوەستاوە ئینجا خەڵکەکەی و دانیشتوانەکەی و شوێنی جوگرافیایەکەی ، زمان پەیووەندیەکی گرنگیشی بە مێژووەوە هەیە ، چونکە گەر زمان نە بێت ئەوا مێژووی ولاتیش بوونی نابێت .**

**– ئەی چ پەیامێکت بۆ مێژوونووسان پێیە ؟**

**– مێژوونووس پێویستە زمانی تۆکمە بێت . بەتایبەتی زانی ولاتی خۆی . کاتێك کە ئێمە مێژوو دەنووسینەوە ، پێویستە پێش نووسینەوەی مێژوو زمانی تایبەت بە خۆمان هەبێت ، گەر زمان نەبوو یان پەروەردەیەکی ڕاستەقینەی زمان نەبوو ئەوا مێژووی ولاتیش بوونی نابێت ، چونکە مێژوو بەستراوەتەوە بە زمانی ڕاستەقینەی ولات ، بۆیە پێویستە گرنگی تایبەت بە زمانی خۆیەتی بدرێت پێش زمانی شوێنەکانی تر . لەوانەشە بپرسین زمان پەیووەندی بە نووسین و ئەدەبەوە چیە ؟ بەلام گەر زمان نەبێت یان پەروەردەیەکی ڕاستەقینەی زمان نەبێت ئەوا ئەدەب و ڕۆشنبیری و پێشکەوتنی لایەنی نووسینیش لە ولاتدا بوونی نابێت ، چونکە ڕوانین لە ئەدەب و کلتووری ولات بە زمان دەکرێت و دەنووسرێتەوە ، نەك بە نیشانەکان .**

**– پێموایە کە نیشانە مێژووییەکانیش ئەم گرنگیەی کلتووری ولات دەگەیەنن .**

**– ڕاستە ، نیشانە مێژووییەکان هۆکارن بۆ کلتووری ولات ، بەلام ئەوەی گرنگیەکەی دەردەخات زمانە ، نەك نیشانەکان ، هەروەها ئەوەشی کلتوور لە فەوتان دەپارێزێت زمانە ، کەواتە زمانی دایك بریتییە لە پاراستنی هەموو ولات بە شێوەیەکی گشتی ، هەروەها هەموو ولاتێك خاوەنی کلتووری تایبەتی خۆیەتی ، بوونی ئەو کلتوورانەش دەگەڕێتەوە بۆ بوونی زمانی تایبەتی و تۆکمە .**

**– لە چ شوێنێکی تر مرۆڤ دەتوانێت گەشە بە زمانی بدات ؟**

– زمان پەیووەندی بە بابەتەکانی خوێندنی پەروەردەشەوە هەیە ، گەر لە فێرگەکاندا پەروەردەیەکی تۆکمە بۆ زمان نەبێت ، ئەوا خوێندنیش گۆڕانکاری بەسەردا نایەت لە شوێنی خۆی دەوەستێت ، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ چۆنیەتی ئەو فێرگانەی کە منداڵ و لاوەکانی تێدا پەروەردە دەکرێت ، فێرکار پێویستە زیاتر گرنگی بە زمانی خۆیەتی بدات ، نەك زمانی دەرەکی ، لە پاڵ هەموو ئەمانەشدا زمان پەیووەندیەکی گرنگ و پڕ بایەخی بە گفتوگۆوە هەیە ، چونکە بوونی زمانێکی پاراو ، سەرەکیترین بنەمایە بۆ پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان . گەر پەروەردەی زمان هەبوو ئەوا گفتوگۆی نێوان مرۆڤەکانیش بە شێوەیەکی جوان بەڕێوەدەچێت ، ئەمەش لەسەر تایبەتمەندیەکانی ئەو کەسایەتیانە دەوەستێت ، کە تا چەند بە شێوەیەکی جوان گفتوگۆی نێوانیان ئەنجام دەدەن ، وەك وتمان ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ بوونی زمانێکی پاراوی خۆیەتی .

لەدوای ئەمە لەپڕ یەکێك لە ئامادەبووان دەستی بەرز کردەوە . داوای کرد کە شتێك بڵێ لەسەر زمان .

هایدار ؛ فەرموو .

– من ناوم هەموارەیە .

– زمان چیە و چ کاریگەری و گرنگیەکی هەیە بەلای تۆوە ، هەموارە ؟

– گرنگیەکی زۆری هەیە .

– ئادەی باسی بکە .

– زمان لەتەك هۆشدا لەناو جیهانی بێئاگاییەوە هات و بەرە بەرە فێری ناوەکان بوو . ئێمەش بەهۆی دەربڕینەکانی ئەو خۆمان دەپاراست لە گێرەشێوێنی ، چونکە فەرمانی لە هۆش وەردەگرت و دواتر بڕیاری دەدا بەسەر شتەکاندا .

مرۆڤەکان گشتیان چاوەڕێی هۆش بوون تا پەیامەکانی بداتە زمان و بیانکات بە دەنگ . زمانیش خەریکی خۆ دواخستن بوو ، تا هۆش بە بڕیارەکانی خۆیدا بچێتەوە . زمانیش کۆمەڵێك بەربەستی لە پێش بوون ، کە نەیاندەهێشت ڕاستیەکانی هۆش ئاشکرا بکات . کەسانێك هەبوون ڕێزیان بۆ زمانی بێگانە دادەنا و زمانی خۆیان خستبۆوە ناو

پاشەڕۆییەکانەوە . خۆ زمانیش مافی هەموو کەسێك بوو ، بەڵام گوڵەکان خۆیان لەبەر باران شاردبۆوە و هەڵدەلەرزین .

من و داپیرەشم بە پەنجە قسەمان لەگەڵ یەکتردا دەکرد و زمانمان بۆ گەورەکان هەلگرتبوو .

بچوك و گەورە تێکەڵی یەکتر نەدەبوون ، چونکە دووژمنایەتیان لەگەڵ زمانی یەکتردا هەبوو .

گۆڕستانەکان هات و هاواریان دەگەیشتە ناوەڕاستی شار ، چونکە کاتی خۆی زمانیان بڕدرابوو لەسەر ئاشکراکردنی ناخۆشیەکانی ژیان و سەمەرگی سەرخاکێکی ژێر ئاڵتوونی .

من و هاوڕێکانم هیچ شتێکمان نەبوو تا بتوانین خۆشبەخت بین لەناو جڤاکەکەماندا ، هەربۆیە لەیەکتر دابڕاین ، ئەمەش نەهامەتی ژیان بوو بۆ پەیوەندی نێوانمان .

– ئەمە یانی چی ؟ تێنەگەیشتم .

– واتە زمان لە چواردەورمان بە نهێنی شتەکانی دەردەبڕی ، بەڵام کە هەستیپێکردین لە ترسان لە جێگەی خۆی ڕەق بوو .

لە فێرگەکاندا فێرکار ڕاهێنرابوو کە لە بەرژەوەندی دۆستانی بەناو هاوزمان قسەکانی بکات .

منیش تورەیی دایگرتبووم و بەتەنیاش نەمدەتوانی بەرەنگاری ئەو دژە زمانەی خۆمان بوەستمەوە .

– من هێشتا لە مەبەستەکانت تێنەگەیشتم !

– واتە لەو کاتانەی کە داپیرەم بەخەبەردەهات ، منیش لەوکاتەدا زیاتر خەوم لێدەکەوت ، زمانیش بۆخۆی دەچۆوە ناو دنیایەکی ئارامەوە و بە هێمنی سەریدەنایەوە . ژیانیش بەرە بەرە کۆتایی دەهات لەلای مرۆڤەکان ، بەڵام هیچ هەستێك نەمابوو بەرامبەر بە یەکتر و زمانیش تەنیا دەیتوانی بڕیار بدات ، بەڵام جێبەجێکاری نەبوو .

پاشان کە کۆبوونەوەکە تەواو بوو ، فرووزە ئەو شوێنەی بەجێهێشت و ڕۆیشت بۆ شوێنێکی تر لە نزیکی لادێیەکە ، ئەو شوێنەش بریتیبوو لە گۆڕستانێك .

لەو گۆڕستانەدا تەنیا دەنگی هاشەی دارەکان دەهات . کاتێك کە با هەڵیدەکرد و دەیدا لە قەد و

**گەلآکانی وەك ئەوە وابوو کە مرۆڤێك تیری بەرکەوتبێ و هاوار بکات تا ڕزگاری بکەن . چەند کاتژمێرێك لە ژێر یەکێك لەدارەکان دانیشت ، ئەوەندەی پێنەچوو وەنەوزێکی بەسەرداهات و خەویلێکەوت ، بەلآم بۆ ماوەیەکی کەم توانی بخەوێت ، چونکە جریوەی تەیرەکان و هاشەی دارەکان نەیدەهێشت خەویلێبکەوێت ، هەربۆیە هەستایە سەر پێیەکانی و سەیرێکی دەوروپشتی خۆیکرد ، بەلآم هیچ کەسێکی نەبینی . لە جێگەی خۆی دانیشت و سەیرێکی ئاسمانی کرد ، بینیی پەڵە هەورێکی سوور بەسەر سەریەوە دێت و دەچێت ، بەمەش یەکسەر پەڵە هەورە ڕەشەکەی بە فکر هاتەوە کاتێك کە ویستی بڕوات داپیرەی بدۆزێتەوە .**

**بە بینیننی ئەم پەڵە هەورەیە ، بێ هیوایی دایگرت و خەیاڵی ڕۆیشتەوە بۆ دۆزینەوەی داپیرە و باپیرەی ، بەلآم هەرچەندێك فکری لێدەکردەوە زیاتر بێ هیوایی دایدەگرت . لەو کاتەدا کە فرووزە فکری لەلای داپیرە و باپیرەی بوو ، کەسێکی لێدەرکەوت ، ئەو کەسە وا دەردەکەوت کە شێت بێت ، کاتێك کە لە فرووزە نزیك بۆوە دایە قاقای پێکەنین ، فرووزەش بۆیدەرکەوت کە کەمێك هۆشی لەدەستداوە . ماوەی نیو کاتژمێر بەبێ دەنگی سەیری فرووزەی کرد . دواتر دایەوە قاقای پێکەنین و کەمێك لە فرووزە دوور کەوتەوە . لەپڕ سەری بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و هەردوو دەستەکانیشی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان ، بەبێ قسەکردن وەستا .**

**لەپڕ هاواریکرد ؛ ئەی خودا لە کوێیە مافی من ؟ ئەی خودا لە کوێیە مافی هەژارەکان ؟ ئەی خودا لە کوێیە ماف ؟ ئەی خودا لە کوێیە مافی چەوساوەکان ؟ ئەی خودا لە کوێیە مافی ئەو کەسانەی کە خەون بە ژیانێکی خۆشەوە دەبینن ؟**

**فرووزە ڕاستەوخۆ لەگەڵ قسەکانی ئەو دەستیکرد بە گریان ، ئەویش سەرێکی فرووزەی کرد بینی کە دەگری ، بەپەلە ڕایکردە لای فرووزە و فرمێسکەکانی ڕووەتی سڕینەوە .**

**– مەگری .**

**– بۆچی نەگریم ؟**

**– زۆر گریام و وەلآم نەبوو . زۆر گریام و گۆڕانکاری نەبوو ، زۆر گریام ، بەلآم بێسوود بوو ، کەواتە مەگری با چاوەکانت ئاوی سپی دەرنەکەن .**

**– ناوت چیە ؟**

**– فرووزە .**

– ئەی تۆ ؟

– بوردبار .

– فرووزە ، گریان بۆ ڕابردوو بێسوودە ، بەهەمان شێوەش بۆ داهاتووی هەژارەکانیش بێسوودە ، بەتایبەتی بۆ هەژارەکانی وەکو من و تۆ ، بۆیە ئەوەت پێدەڵێم ، چونکە تەمەنێکی کەمم لە ژیان ماوە و ژیان زۆری چەوساندوومەوە ، هەربۆیە تا ئێستا شتێکم نەبینی ناوی ماف بێت بۆ هەژارەکان ، تەنیا ماف بۆ دەوڵەمەندەکان بوو ، بۆ ئەمەش شتێکت پێدەڵێم هەرگیز لە یادی مەکە .

– چ شتێك ، بوردبار .

– فرووزە ، لەو چەند ساتە کەمەی کە لەوانەیە بژیت ، هیچ شتێك مەبە ، تەنها مرۆڤ بە و بەس .

– مانای ئەمە چیە ؟

– مانای ئەوەیە کە مرۆڤ بوون تەنیا بەناو نیە ، هەروەها بە لاشە نیە ، بەڵکو مرۆڤ بوون بریتییە لە ڕاستگۆیی و دڵسۆزی و پاك و بێگەردی ، هەندێك لە مرۆڤەکان وا خۆیان نیشاندەدەن کە گوایە مرۆڤن ، بەڵام هیچ تایبەتمەندیەکی مرۆڤ بوونیان تێدا نیە ، ئەوانەش بریتیین لەو کەسانەی کە خۆیان بە هەموو شتێك دەزانن ، بەڵام تایبەتمەندی هیچ شتێکیان تێدانیە ، چونکە ئەوانەی کە زانان و دەڵێن نەزانین ، ئەوانە مرۆڤن .
مەلەوان ئەو کەسەیە کە مرۆڤەکان لە شەپۆلی دەریا ڕزگار دەکات و خنکاوەکان دەهێنێتە دەرەوە ، نەك کەسێکی چۆنە و چۆن مەلە دەکات .

– کەواتە بوونی کەسەکان بە هۆی کردەوەکانیانەوە دەردەکەوێت .

– بەڵێ . ئەوەش ئەو کەسانەن کە مافی کەسانیتر لەبەرچاو دەگرن لە پێش مافەکانی خۆیان ، کەواتە ئەوانە مرۆڤی ڕاستەقینەن.

– سەرەتا کە هاتی ، بۆچی هاوارت کرد بۆ ئاسمانەکان و باسی مافت کرد ؟

– ماف بۆ هەموو کەسەکانە بە یەکسانی و بەبێ جیاوازیکردن لە نێوان تاکەکانی ناو جڤاك ، بەڵام من هیچ شتێك نابینم بۆنی مافی لێبێت یان تۆزی مافی لەسەر نیشتبێت .

– ئایا ماف ئەوەندە تینووی کردووی کە بۆی هاوار بکەین ؟

– بەڵێ . ماف ئەوەندە تینووی کردووم کە هێندەی ئاوی زەریاکان بێتە بەردەمم هێشتا تینویەتیم پێی ناشکێ .

– کەواتە تێمبگەیەنە ماف چیە ؟

– ماف بریتییە لە یاسایەك کە هەموو بنەماکانی مرۆڤ بوونی تێدایە ، هەموو مرۆڤەکان بەیەك شێوە و بە یەکسانی سەیر دەکات . ماف یاسایەکی نەگۆڕ و ڕاستەقینەیە . یاسایەکە لە کۆمەڵێك تایبەتمەندی پێکهاتووە کە بەهایەکی تەواو بە بوونی مرۆڤەکان دەدات بەشێوەیەکی گشتی ، نەك بە شێوەیەکی تایبەتی ، ئەمەش بەبێ جیاوازیکردن لەنێوان نێر و مێ ، کەواتە هیچ جیاوازیەکی نیە لەنێوان دەوڵەمەند و هەژارەکاندا ، لەنێوان خێزانەکانیشدا ، چونکە ماف تایبەت نیە بە کەسێك و ئەو کەسەش وا بزانێ کە هەموو شتێك تەنیا مافی تایبەتی خۆیەتی ، بۆ ئەمەش ئەرکی سەرشانی هەر تاکێکە کە مافی بەرامبەرەکەی بدات ، بەتایبەتی ئەو کەسانەی کە هاوژیانی پێکدەهێنن ، پێیانوایە کە تەنیا ماف بۆ نێر ڕەخساوە و مێینەش کۆیلەی ئەوە ، بەلاّم ئەمە دوورە لە یاساکانی ماف .

– مافی هاوژیانی چیە ؟

– بۆ پێدانی مافی هاوژیانی پێویستە . گەر هاوژیانەکەت دانیشت تۆش دابنیشی ، گەر پێکەنی تۆش پێبکەنی ، گەر گریا تۆش بگری ، ئەوکاتە تۆ مافی ئەوت پێشێل نەکردووە ، بۆ ئەمەش پێویستە لە هەموو شتێکدا لەگەڵ بارودۆخی ئەودابیت نەك تەنیا بۆ ڕابواردن و کەیف و خۆشیەکان ، بەڵکو پێویستە ناخۆشیەکانی ئەو ناخۆشی تۆش بن ، هەروەها ئەویش بەهەمانشێوە پێویستە ئەمانە لەبەرچاو بگرێت ، ئەمەش زیاتر بە هاوکاری هەردوو لا دەکرێت نەك لایەك .

خودا مافی مرۆڤەکانی داوەتە بەردەستی خۆیان . کەواتە خودا بۆ کەسانێکە کە ئەوان خۆیان بۆ خودان ، نەك دوور لە خودان .

– منیش لەو بڕوایەدام ، کە خودا مافەکانی خستۆتە بەردەستی مرۆڤەکان خۆیان ، لە هەمان کاتیشدا ئازادی کردوون ، بەلاّم خۆیان مافیان پێشێلکردووە .

– بێگومان . مرۆڤ هەر خۆی تاوانباری ڕاستەقینەیە بەرامبەر بە قۆرخکردنی مافەکان ، چونکە ماف کۆمەڵێك یاسایە و هەموو مرۆڤێکی ژێر ئەو یاسایانە دەزانێ ، کەواتە ئەمەش

دەگەڕێتەوە بۆ چۆنیەتی ئەو کەسەی کە چۆن لە مافەکان دەڕوانێ .

– بوردبار ، بەدیدی تۆ جیاوازیکردن لە نێوان ڕەگەزی نێرێ و مێ دا ، فۆرخکردنی ماف نیە لەلایەن ڕەگەزی نێرینەوە ؟

– ئەم ڕۆژگارەی کە ئێمەی تێداین و ململانێی تێدا دەکەین ، دەبینین مافی ڕەگەزی مێینە لەناو مافەکاندا شاردراوەتەوە . زەوتکردنی مافی ڕەگەزی مێینە ، فۆرخکردنی مافە لەلایەن ڕەگەزی نێرینەوە . هەموو کات ڕەگەزی مێینە بە چاوێکی تر سەیر دەکرێت لەلایەن ڕەگەزی نێرینە ، بەلاّم ئەوە مێینەکانن کە هەموو کات گرنگی بە نێرینەکان دەدەن .

– پێتوایە کە ڕەگەزی مێینە مافەکان پێشێل بکات ، گەر هاوشانی ڕەگەزی نێرینە مافەکانی پێبدرێت ؟

– نەخێر . هەموو کات ڕەگەزی نێر مافەکان زیاتر پێشێل دەکات نەك ڕەگەزی مێ ، ئەوەش بەهۆی لەبەرچاو نەگرتنی مافەکانە لەلایەن ڕەگەزی نێرەوە . ماف پێکهاتووە لە کۆمەڵە یاسایەك کە پێویستە ڕێزیان لێبگیرێت ، چونکە ماف شتێك نیە بتوانرێت بە مرۆڤەکان ببەخشرێت ، یان بازرگانی پێوە بکرێ ، بەڵکو کۆمەڵە یاسایەکە تایبەتە بە مرۆڤ و هیچ کەسێکیش مافی ئەوەی نیە دەستکاری بکات ، ئەم دەستکاریکردن و بازرگانی پێکردنەش زیاتر لەلای کەسە دەوڵەمەندەکان و  بێ ئەزموونەکانەوە سەرچاوە دەگرێت .

– کەواتە ئەوە ئەرکی من و تۆیە ، کە بەو کارە هەڵبستین ، تا بتوانین ژیانێکی یەکسان بۆ هەموو مرۆڤەکان بگێڕینەوە .

– ڕاستە ، من لەگەڵ ئەو ڕایەی تۆدام . ژیان تەنیا بۆ کەسانێك درووست نەبووە تا بە ئارەزووی خۆیان گوپی لێپڕ بکەن ، بەڵکو بۆ تۆش و بۆ ئەوانی تریشە . واتە تۆ چەندە لەسەر مافەکانی خۆت سووری ئەوەندەش سوور بە لەسەر مافەکانی خەڵکی تر ، چونکە مافەکانی ژیان بە تەنیا بۆ تۆ نیە یان بۆ کەسانێك درووست نەبوو ، بەڵکو مافەکان بۆ منیش و بۆ هەموو کەسێکە . ماف بۆ گشتێتیە .

– ئەی بۆ یەکسانی مافی نێوان کەمئەندامێك و کەسێکی تر کە لاشەی بێ کەموکوڕیە ، دەڵێی چی ؟

– یاساکانی ماف تەنیا مرۆڤە لەش ساغەکان ناگرێتەوە ، بەڵکو هەموو مرۆڤێك دەگرێتەوە

هەتا گەر شێتیش بێت یان نەخۆش و کەمئەندامیش بێت ، مافەکانیش بەزۆری لەسەر بنەمای ئازادی و گشتیەتی و ژیان کردن بە شێوەیەکی دادپەروەرانە وەستاون ، چونکە ئەمانە هۆکاری سەرەکین بۆ ماف . ماف پێدان تەنیا بریتی نیە لە هەناسەدان و بەس ، بەڵکو بریتییە لە هەموو یاساکانی بوون بە مرۆڤ ، کەواتە ئازادی و دادپەروەری و ژیان بۆ هەموو کەسێکە ، ئەمەش لە کاتێکدا کە ئازادی نەبوو یان دادپەروەری نەبوو ئەوا ژیانیش بوونی نابێت ، کەواتە لێرەدا مافیش بوونی نابێت گەر ئەم تێگە گرنگانە بەشێوەیەکی کرداری بوونیان نەبێت لە وڵاتدا ، کرداری درووست و ڕاستەقینە بوونی مافەکان دەردەخات ، نەك ڕەمز ، جێبەجێکردنی هەموو ئەمانەش دەگەڕێتەوە بۆ کردەوەی سەرکردەکان ، چونکە گەر سەرکردەکان بوونی ئەو مافانە لەبەرچاو بگرن ، ئەوا بچوکەکانی ناو جڤاکیش ناتوانن ئەو مافانە پێشێل بکەن ، ئەو مافانەش لەپێناو مانەوەی مرۆڤ و پاراستنی مرۆڤ سەریانهەڵداوە ، چونکە مرۆڤ سروشتی وا ڕەخساوە کە زیندەوەرێکی ئارەزووبازە ، ئەمەش زیاتر بۆ مانەوەی خۆی ئەو جۆرە ڕەفتارانە پەیرەو دەکات ، هەموو ئەو کێشەو ململانێیانەش وایکردووە کە مافەکانی مرۆڤ بشێوێنرێن . ئەمەش زیاتر بەهۆی ئارەزووەکانی مرۆڤ بۆ موڵکداری و لایەنی مادی و پۆست وپلەی بەرز ئەو پێشێلکاریانە سەرهەڵدەدەن کە ئەمانەش زیانگەیەنەرن بە مافەکانی مرۆڤ . ئەمەش دەبێتە تێکدانی مافی هەموو مرۆڤەکانی ناو جڤاك .

– بوردبار ، من پێموایە کە یەکێکیتر لە مافەکانی مرۆڤ ، ئەوەیە کە هەموو کەسێك سزاواری شوێنی دەسەڵاتە .

– جوانە . هەموو کەسێك مافی ئەوەی هەیە کە دەسەڵات بگرێتە دەست ، هەروەها بۆ هیچ کەسێك نیە کە دەسەڵات بۆ خۆی داگیر بکات و لەپێناو بەرژەوەندیەکانی خۆیدا بەکاریبهێنێ .

– کەواتە بە دیدی تۆ ، ژیان بەبێ ماف و ئازادی مانای چی دەگەیەنێت ؟

– ژیان بەبێ ماف و ئازادی مانای ئەوەیە کە تۆ تەنیا لەشێوەدا مرۆڤی و لەڕووی تایبەتمەندیەکانیشەوە تۆ ئاژەڵێکی و هیچ جیاوازیەکت نیە لەگەڵ ئاژەڵەکانی تر ، کەواتە مرۆڤ هیچ کاتێك بەبێ ئازادی ناتوانێت ببێت بە خاوەنی خۆی ، چونکە ژیان و ئازادی دوو بنەمای پەیوەست بە یەکن و ناتەواوی یەکێکیان کۆتایی بەویتر دەهێنێت .

گەر ئازادی نەبوو ئەوا ژیانیش بوونی نیە . بە هەمان شێوەش گەر ئازادی هەبوو ، بەڵام ژیانی

تاکەکانی ناو جڤاك لە ناخۆشیدا بوو ، ئەوا ئازادیش تەنها بە ناو بوونی هەیە و بەس ، کەواتە پێویستە مافەکانی مرۆڤ کە لە کۆمەڵێك یاسا پێکهاتووە ، لە بەرچاوبگیرێن ، چونکە پێدانی ماف تەنها بریتی نیە لە خەوتنێکی ئازاد و ئارام بۆ مرۆڤ ، بەڵکو بریتییە لە پێدانی ژیانێکی تەواو و بێ کەموکوڕی ، ئەمەش دادپەروەریە بەبێ جیاوازی ، هەروەها پێدانی ئازادیەکانی مرۆڤە بۆ ژیانێکی گونجاو ، ئەوکاتەش دەتوانین بڵێین ماف بوونی هەیە . گەر ئەمانەش نەبوون ، ئەوا ناتوانین بڕیار بدەین کەوا مافەکانی مرۆڤ بوونی هەیە .

مرۆڤ تەنیا بۆ پاراستنی لاشەی خۆی هۆشی پێنەدراوە ، بەڵکو بەزۆری بۆ هاولاٚتیانی ناو جڤاکەکەیەتی . هۆشی مرۆڤ جیاوازە لە هۆشی زیندەوەرانی تر ، هەربۆیەشە مرۆڤ پێویستە بۆ ساتێکیش بێت فکر لە خۆی بکاتەوە ، هەرچەندە زیندەوەرانی تر ناتوانن فکر بکەنەوە ، بەلاٚم بەهۆی هەستەکانیان پارێزگاری لەیەکتر دەکەن .

– بوردبار ، پێویستە نمونەیەك بهێنینەوە لێرەدا .

– چ نمونەیەك ، فرووزە ؟

– نمونەیەك لەسەر ئاژەڵە کێویەکان و چۆنیەتی پارێزگاریکردنیان لە یەکتر .

– زۆر باشە فرووزە . من ئەو نمونەیە دەهێنمەوە .

کاتێك ئاژەڵکی کێوی لەگەڵ بەچکەکەیدا تووشی مەترسی دەبێت ، ئەوا پێش پاراستنی خۆی هەوڵدەدات پارێزگاری لە بەچکەکەی بکات .

– منیش نمونەیەکی ئاوهام بۆ ئەوە گەرەك بوو . تاوەکو بڵێم : ئایا ئەو تایبەتمەندیە لە مرۆڤدا بوونی هەیە ؟

– ئەو تایبەتمەندیە کەمتر لە مرۆڤدا بوونی هەیە ، هەرچەندە مرۆڤ خاوەنی هۆشێکی فراوانە و توانای فکر کردنەوە و بڕیاردانی هەیە ، بەلاٚم ئەو تایبەتمەندیە جێبەجێ ناکات . گەر ئەم مەترسیە تووشی مرۆڤ ببێت ، بێگومان هەوڵدەدات پێش مندالەکەی پارێزگاری لە خۆی بکات ، کەواتە لێرەشدا مافی مندالەکەی خۆی پێشێلکردووە .

فرووزە ، دڕك هەرچەندە ناوی بەدناوە ، بەلاٚم لە گوڵ باشترە بۆ بەرگریکردن لە خۆی لە بەرامبەر مرۆڤدا . مرۆڤ هەموو مافێکی هەیە بەپێی ئەو یاسایانەی کە لە مافدا هاتوون ، بەلاٚم مرۆڤ خۆی هۆکارە بۆ پێنەدانی مافەکان بە خۆی ، چونکە کاتێك کە دەزانن کەسێك

مافەکانی مرۆڤی پێشێلکردووە ، لەبری ئەوەی بەرەنگاری ببنەوە و سنووری بۆ دابنێن ، بەڵکو دەبن بە پاڵپشتی و بەرگری لێدەکەن ، ئەمەش وایکردووە کە نەتوانێت هەم خۆی و هەم کەسانیتریش بە مافەکانی خۆیان بگەن .

– کەواتە مرۆڤ خۆی هۆکاری نەبوونی مافەکانە لەبەرامبەر خۆیدا .

– هەموو تاکێك لەناو جڤاکدا مافی تایبەتی خۆیەتی کە ئەو یاسایانەی کە لەمافەکانی مرۆڤدا هاتوون بۆی فەراهەم بکرێن ، ئەمەش زیاتر بەهۆی کەسانی بێ ئەزموونەوە ناتوانرێت مافەکانی خۆی بۆ فەراهەم بکرێت .

هەموو کات بۆ داهاتووی جڤاك بڕوانە ، نەك بۆ داهاتووی خواردن و بەرژەوەندی . گەر هات و تۆ بە تەنها فکرت لە مافەکانی خۆت کردەوە ئەوا نە پێی دەگەی و نە دەشتوانی مافی نەوەکانت دابینبکەی ، چونکە ڕوانین لە بەرژەوەندی گشتی دەتوانێت مافە تایبەتیەکان دابین بکات و بەرگریان لێبکات ، هیچ کەسێك ناتوانێت مافی کەسێکی تر کەم بکاتەوە ، تەنانەت دەسەڵاتیش ، چونکە هەر کەسێك کە لە وڵاتێك لەدایك دەبێت مافی تایبەتی خۆیەتی کە ئەو مافانەی پێبدرێت و بەچاوێکی ڕێزەوە لێی بڕوانرێت ، هیچ کەسێکیش مافی ئەوەی نیە مافی کەسێکی تر بۆ بەرژەوەندیەکانی خۆی بەکاربهێنێ تەنانەت دەسەڵاتیش ناتوانێت ئەوە بکات گەر هات و تووشی بارگرژیش بوو ، بەتایبەتی لە ڕووی ئابووری و سیاسی و ڕۆشنبیری .

– بە دیدی تۆ دەسەڵات نابێت مافی مرۆڤەکان کەم بکاتەوە ، گەر وڵات تووشی بارگرژی ئابووریش بۆوە ؟

– بەڵێ . پێویستە دەسەڵات پێشتر فکر لەو بارگرژیانە بکاتەوە کە تووشی وڵات دەبێت لە کاتێکی چاوەڕوان نەکراودا ، هەر کاتێکیش دەسەڵات مافی تاکەکانی بەکارهێنا بۆ مانەوەی خۆی یان بۆ ئەو بارگرژیانەی کە بەسەر وڵاتدا هاتوون ، ئەوا مافی تاکەکانی پێشێلکردووە و تاوانێکی گەورەی ئەنجامداوە ، ئەمەش تاوانێکە بەرامبەر بە مافی هەموو مرۆڤێك ، نەك تاکە مرۆڤێك . گەر بە خۆشی بێت یان بە ناخۆشی ، مافی هەموو کەسێکە لە وڵاتەکەی خۆیدا داوای مافی خۆی بکات .

– با ئەمە بەس بێت .

– بۆچی ؟

– ئەوەی هەبوو دەربارەی مافەکانی مرۆڤ زانیمن . زۆر بەداخەوە کە مرۆڤ خۆی هۆکاری پێنەدانی مافەکانی خۆیەتی و هەر خۆشی هۆکارە بۆ نەهاتنە ئارای ژیانێکی ئازاد و دادپەروەر ، ئەمەش زیاتر بە هۆی مرۆڤی دووڕوو و خۆفرۆشەوەیە ، بەتایبەتی ئەو مرۆڤانەی وەها خۆیان نیشاندەدەن کە پاکن و باس لە بەرژەوەندیەکانی مرۆڤ دەکەنەوە ، بەڵام لە ژێرەوە بۆ خۆیانی بەکاردەهێنن و گشت بەرژەوەندیەکان هەڵدەدەنە ناو کۆشی خۆیانەوە .

– هێشتا ماوە تێبگەیت ، فرووزە .

– هێشتا ؟

– بەڵێ . هێشتا ، چونکە گەر وانەبایە هێشتا من و تۆ بەمشێوەیە نەدەبووین و لەناو گۆڕستانێکدا گفتوگۆمان نەدەکرد .

– ئەی لەکوێ گوێم گرتبا ، تاوەکو بزانم مافەکان چین ؟

– مافەکان لەئاسمانەوە هاتن بەرەو زەوی ، لە هەوایەکی پاکەوە بەرەو هەوایەکی پیس .

ئێمە لەوکاتەدا سەرقاڵی دابەشکردنی بەجێماوی باوباپیرانمان بووین و ئاگادار نەبووین لە هاتنی . ئەوکاتەی کە سلاٚوی لێمانکرد ئێمە تەواو ببوین لە دابەشکردنەکەی خۆمان ، چاوەڕێی کڕیاری شمەکەکانمان بووین و هێشتا برا گەورەکەشمان بەمەی نەزانیوو .

لەناو کەلاوەکە هاتینە دەرەوە و سلاٚوێکی گەرممان لە کۆلکەداری پیری هەوارگەکە کرد و ماڵئاواییمان لێکرد ، بەلاٚم هیچ وەلاٚمێکی ئێمەی نەدایەوە . ئێمەش خۆمان بە سەر بەرز نیشاندەدا ، بەلاٚم سەر بەرزی ئێمە تەنها بە ڕەمز بوو نەك بە کردەوە . گۆزە کۆنەکەی باپیریشمان لەناو کەلاوەکە شکاندبوو ، چونکە باپیرە ماڵئاوایی لە ژیان کردبوو ، ئەمەش بۆ ئەوە بوو تا داپیرە بە ئاکارەکانمان نەزانێت .

مافەکانی خزم و کەس و کار تەنها لەنێوان ئێمەدا کۆتایی پێهات ، ئەویش بە نهێنی . بەلاٚم ماف خۆی بە نهێنی ڕازینەبوو ، بەلاٚم ئێمە هەرچۆنێ بێت ملکەچی فەرمانەکانی خۆمانمان کرد ، ئەویش بەبێ دەنگی مایەوە و چاوەڕێی برا گەورەکەمانی دەکرد تا بێتەوە و ناڕەزایی خۆی پێبڵێ ، بەلاٚم هێشتا زۆری نەمابوو بۆ هاتنەوەی ، ئێمەش ترسمان لێنیشتبوو .

کاتەکان بۆ ئێمە زۆر زوو تێدەپەڕین ، کاتژمێرێك ببۆوە چرکەیەك ، ئێمەش چاوەڕێی ئازاردان بووین لەسەر کردەوەکەمان ، چونکە نهێنی ببۆوە پێشێلکاری مافەکان . ئێمەش

**خۆمان بە مرۆڤی ڕاستەقینە لە قەڵەم دابوو ، هیچ کەسێکیش بۆی نەبوو بێتە ڕیزەکانی ئێمە و خۆی بە هاوشانی ئێمە بزانێ .**

**بوردبار لەدوای ئەم باسە ماڵئاوایی لە فرووزە کرد و ڕۆیشت . کاتەکەش دەمەو ئێوارە بوو ، ئەوەندەی نەمابوو تیشکی خۆر بە یەکجاری دیار نەمێنێ .**

**فرووزەش ئەوەندە ماندوو ببوو دەتوت تازە لە کۆڵەپشتی هاتۆتەوە . بۆیە لە جێگەی خۆی لەناو گۆڕستانەکەدا خەوی لێکەوت . ئەمجارە گوێی بە دەنگی تەیرەکان و هاشەی دارەکان نەدا ، لە ماندوویەتیان خەوی لێکەوت و تووشی خەونێکی قوڵ بوو . خەونێك کە تەنها ڕوویدەکردە هۆشە ماندووەکان . یان دەبوو بە مایەی خۆشحاڵی ، یان ئەوتا نەگبەتی دەهێنا و تەنانەت ئەو خەوەشی لێ تاڵ دەکرد .**

**زۆربەی کاتەکان ئەو خەونانە بۆ فرووزە دەبوون بە مایەی خۆشحاڵی ، بەڵام کاتێك کە بەخەبەر دەهات ئەوا ناخۆشی و بەدبەختیەك ڕووی تێدەکرد کە بۆ چەند ڕۆژێك بێ هیوای دەکرد لە ژیان . ئەمەش هەمان خەون بوو کە کۆیلەکانی سەردەمی فیرعەون (ئەخناتوون) دەیانبینی ، هەر لەپێش وەدەرکەوتنی خۆریش دەبوو هەموو تاوێرە گەورەکان بگەیەننە لووتکەی هەرەمەکان . فرووزەش هەمان کۆیلە بوو ، بەڵام کۆیلەیەك لەسەردەمی تازەگەریدا . فرووزە خەوتووە و لێوەکانیشی زەردەخەنەیان پێوەدیارە . ئاخۆ دەبێت ئێستا چ خەونێك بووبێتە میوانی جیهانە نادیارەکەی . ئاخۆ دەبێت چ خۆشبەختیەکی ئەفسووناوی خۆی نیشان دابێ . مەگەر ئەو ئەستێرە زۆرانەی کە لە شەودا دەدەرەوشێنە ڕووناکیەکەیان لە خۆر وەرنەگرتووە ، مەگەر مانگ نەبۆتە نوێنەری لە شەوەزەنگدا .**

**فرووزە لەم خەوە تاڵەیدا ، کەسێك هاتبۆوە ناو خەونی . شمشێرێکی ئاگرینی بەدەستەوە بوو کە دەم دەم دەیکرد بە ورگی فرووزەدا . فرووزەش لەبری گریان و هاوار ، زەردەخەنە دەهاتە سەر لێوەکانی . ئەمەش مانای ئەوە بوو کە فرووزە لەم ژیانە بێزار ببوو ، زۆر ئارەزووی لە مردن بوو ، ئارەزووی لەوە بوو کە لەپڕ ماڵئاوایی لە ژیان بکات و حەوت بەرد بە پشتی ژیاندا**

بدات . ژیانێك كه ئەمه تام و چێژەكەی بێت ، دەبێ چ خۆشیەكی بۆ فرووزە هەبێت ؟ تەنیا له داواكردنی ئارەزووی پڕوپوچ هیچی تر نیه .

فرووزە كەوتبۆوە ناو خەوێكی قوڵەوە ، دەتووت هەرگیز جارێكی تر بەخەبەر نایەتەوە ، لەملا بۆ ئەولا خۆی هەڵدەسوڕاند ، كاتژمێرێك لەسەر كەلەكەی ڕاست و كاتژمێرێكیش لەسەر كەلەكەی چەپ خۆی هەڵدەسووڕاند ، لەگەڵ هەر هەڵسوڕانێكدا زیاتر زەردەخەنەی دەهاتە سەر لێوەكان ، لەناو گۆڕستانێكی ئارام و دوور له جەنجاڵی .

فرووزە بەخەبەرهات . سەیری كرد ، ئێستا كاتی بەیانیه و ئەوەندەی نەماوە ڕۆژ سەر وەدەرنێ ، تومەز لەبەر ماندوویەتیان بەدرێژایی شەو له خەودا بووە تا سپێدەی بەیان .

سەیرێكی دارەكانی كرد و خەونی ئەم شەوی بە فكر هاتەوە ، بۆیە كەوتە ناو گومانەوە .

گومانەكەشی ئەوەبوو ، ئایا دەبێت لەناو لادێیەكە هیچ شتێك ڕووینەدابێ ؟

هێشتا فكری له ناو خەونەكەدا بوو ، دەتوت هێشتاش هەر له خەونەكەدایە و لەخەو هەڵنەستاوە ، لەو كاتەشدا كۆمەڵێك پەڵە هەوری چڵكن بەری ئاسمانیان گرتبوو ، ناوە ناوە دەیانچریكاند و مووی سەری فرووزەیان گرژ دەكرد ، بەڵام فرووزە ئەوەندە بێ هیوا ببوو له ژیان كه پێیوابوو هەرگیز ناتوانێت لەناو ژیاندا سەركەوتوو بێت . بۆیە بەرە بەرە هەندێك له ڕاستیەكانی بۆ دەردەكەوتن ، بۆیە فرووزە لێرەدا شتێكی بۆ دەركەوت ، كه ماوەیەك بوو لەناو هۆشی فرووزەدا دەهات و دەچوو . له دواجاردا لەسەر هۆشی فرووزە تۆمار بوو ، تۆمارەكەش دەیووت ؛ تەنیا شتێك كه له ئازادی پتر پێویستی به خوێن بێت لەناو دیكتاتۆرەكان ، دادپەروەریە . ژیان به هیچ شێوەیەك بەبێ دادپەروەری ئارام نابێت ، گەر وڵاتێك دادپەروەری تێدا نەبوو ئەوا وڵاتێكی دیكتاتۆریە و چاوەڕێی باشبوونی ناكرێت تەنیا به گۆڕانی كاربەدەستەكان نەبێت .

لێرەدا فرووزە پرسیاری له خۆی كرد ، چونكه كەسێك نەبوو لەلای تا ئەم پرسیارەی لێبكات ، بۆیە وتی ؛ فرووزە ئایا دادپەروەری چیه ؟

– وەڵامی خۆی نەدایەوە .

دواتر بەخۆی وت ؛ فرووزە تۆ زۆربەی كلتوورەكانت بینی و زۆربەی وڵاتەكانت بینی ، بەڵام هێشتا ماوتە فێری زۆربەی شتەكان بیت ، چونكه مرۆڤ هەرچەندە زانا بێت هێشتا نەزانە .

هەموو نەزانێکیش بەشی خۆی زانایە .

بۆ ئەم وەڵامی ئەم پرسیارەش ، فرووزە ڕووی کردە کێلی گۆڕەکان .

ئەوانیش وتیان ؛ فرووزە وەڵام بدەوە دادپەروەری چیە ؟

– ئەوەندەی کە لە دادپەروەری گەیشتووم وەڵامتان دەدەمەوە . فرووزە زۆر دەترسا لە باسکردنی دادپەروەری .

دادپەروەری بریتییە لە یاسایەکی ڕەوشتی کە لەناو هۆشی هەموو مرۆڤەکاندا سەرهەڵدەدات و دەروونی مرۆڤەکان دەهەژێنێت ، بریتییە لە پێدانی ماف بە شێوەیەکی ڕاست و درووست کە هەموو مرۆڤەکان بەیەك شێوە و بەیەك چاو سەیر بکات ، ئەمەش جیاوازی نیە لە نێوان کەسێکی کەم ئەندام و کەسێکی تردا ، چونکە دادپەروەری تەنها بۆ کەسانێ نیە کە بە لاشە تەواون ، بەڵکو بۆ ئەوانەشە کە ناتەواون . چونکە تەواوەکانیش لەناخدا کەم ئەندامن . بۆ ئەمەش بزانن ، ئەوەی کە خۆی بە شێتەکان و کەم ئەندامەکان دەهێنێتە پێکەنین ، ئەوا خۆی هەم شێتە و هەم کەم ئەندامە لە هۆشدا ، کەواتە دادپەروەری بۆ هەموو مرۆڤەکان وەك یەکە ، هەتا کەسێکیش کە تەنیا هەناسە بدات جیاوازی نیە لە گەڵ کەسێکی تەواودا لە پێدانی مافەکان ، ئەوانیش مافی ئەوەیان هەیە کە لە دام و دەزگاکانی دەوڵەتدا کاری خۆیان بکەن ، چونکە جیاکردنەوەی ئەوان لە کەسانی تر ئەوا بە هیچ شێوەیەك ناچێتە بواری دادپەروەریەوە ، مرۆڤی دادپەروەر هەمیشە دڵسۆزە و پاکانە دەکات لە کار و فەرمانەکانیدا ، لەتەك ئەمەشدا بەرژەوەندی کەسانی تر لەبەر چاو دەگرێت و هەموو شتەکان بەتەنیا بۆخۆی قۆرخ ناکات ، کەسی دادپەروەر هەموو کات چێژ لە خۆشی کەسانی تر وەردەگرێت .

مێروولەکان هەرچەندە نەزانیش بن ، بایی ئەوەندە دەزانن کە کەشی زستان و هاوین چۆنە ، هەرچی فەرمانی هۆزەکەیانە بە هاوکاری یەکتر ئەنجامی دەدەن و هەریەکە کاری خۆی ئەنجام دەدات ، واتە خۆ بەیەکترەوە گرێ نادەن بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانیان و بەبێ یەکتر کار نەکەن ، هەر بەیەکەوەن لەکاتی خواردنی بەروبومی کۆکراوەشیان لەکاتی زستاندا ، ئەمەش مانای ئەوەیە کە دادپەروەرترین زیندەوەرن و تەنانەت مرۆڤیش ناتوانێت بگاتە ئاستی دادپەروەری ئەوان ، تەنانەت گەورەی هۆزەکەشیان ناتوانێت لەم یاسایە لابدات و خۆی جیا بکاتەوە لە ئەوان تر ، چونکە گەر سەرپێچی بکات ئەوا لە هۆزەکە دەچێتە دەرەوە و کۆتایی بە

نیشتگەکەی دەهێنن ، ئەوەش زانستێکە کە مرۆڤ پێویستە لەبەرچاوی بگرێت و لەناو هۆشی خۆیدا فکری لێبکاتەوە ، گەر هات و گەورەیەك لەناو ئەوان لە یاساکان لایدا و بەردەوامی بە سەرپێچیەکانی خۆیبدات ، ئەوا گەورەی هۆز بە نا دادپەروەر و تاوانبار لەقەڵەم نادەن ، بەڵکو خۆیان بە نادادپەروەر لەقەڵەم دەدەن ، چونکە پێیانوایە کە خۆیان هۆکاری ئەوەن کە ئەو گەورەیە نادادپەروەر بێت ، ئەمەش بەڕوونی دیارە لەناو مرۆڤەکاندا ، بەڵام مرۆڤەکان بێدەنگی لێدەکەن ، ئەم بێدەنگیەش هۆکارە بۆ زیاتر پەلهاویشتن بۆ نادادپەروەری ، گەر گەورەیەك لەناو مرۆڤەکان نا دادپەروەر بوو ئەوا خۆی یەکەم تاوانباری نادادپەروەری نیە ، بەڵکو تاوانباری یەکەم جڤاکە ، چونکە خۆیان ئەو چانسەیان پێداوە نەك خۆی . گەر زوو لەدژی نەوەستنەوە ئەوا تاوانبار و نا دادپەروەری سەرتاپای جڤاك دەتەنێت ، گەر بەرەنگاریشی نەبنەوە ئەوا نەك جڤاکێکی نا دادپەروەرە ، بەڵکو جڤاکێکی بێڕەوشتیشە ، ئەمەش لەو کاتانەدا دەردەکەوێت کە بەشێکی زۆری جڤاك هەژارن و بەشێکی کەم دەوڵەمەندن ، هەروەها بەشێکی خەون بە ئارەزووەکانیانەوە دەبینن و بۆیان نایەتەدی ، بەشێکی تریش بەبێ ئەوەی ئارەزوویان هەبێت و چێژیان بۆ ژیان هەبێت ئەوا هەموو شتێك لەبەردەمیان ئامادەیە . بۆیە لە هەموو کاتێکدا ، هەوڵدە بە هەژاری بمێنیتەوە ، چونکە دەوڵەمەندی گەورەترین ڕیسواییە ، ئەمەش مانای ئەوەنیە کە تۆ هیچت نەبێت و کەسانێکی تریش هەموو شتێکیان هەبێت لەناو جڤاکدا ، بەڵکو مانای ئەوەیە کە دەوڵەمەندەکان با وانەزانن کە ڕێزدارن لەناو جڤاکدا ، بەڵکو ڕیسواترین کەسن لەناو جڤاکدا ، بەڵام خۆیان هەستی پێناکەن ، گەر بێت و ئارەزوویان بۆ هەژاری زیاتر بێت وەك لە دەوڵەمەندی ، ئەوا هیچ تاکێکی جڤاك بێبەش نابێت لە هاتنەدی ئارەزووەکان و کۆسپی نایەتە بەردەم بەهۆی دەوڵەمەندەکان ، چونکە ئەوکاتە دەوڵەمەندی بوونی نامێنێت و مرۆڤەکان تێیدا یەکسان دەبن ، دادپەروەری یاسای جڤاکە نەك یاسای تاکە کەس ، دادپەروەری یاسای پڕ بەهادار و گشتیەتیە و یاسای سرووشتی مرۆڤە ، نەك یاسای دەستکاریکراوی تایبەتی ڕۆژانەی مرڤ .

ئەو کەسانەی کە بەدوای دادپەروەریەوە وێڵن ، هەمیشە دەچەوسێنرێنەوە ، بەڵام لەکۆتاییدا سەربەرزی و دڵسۆزی بۆ ئەوانە .

ئەی کێلەکان ، ژیان فێریکردم کە هەرگیز لە تاوان بێدەنگ نەبم و هەرگیز پێنەکەنم ، تا لە

**دوارۆژدا شەرمەزار نەبم و گریان بەرۆکم نەگرێت ، بێدەنگ نابم لەبەرامبەر نادادپەروەری ، چونکە ڕۆژێك دێت بەرۆکم دەگرێ و ناهەڵوێستی من ئاشکرا دەکات بەرامبەر بە خۆی . مەرج نیە بەهۆی دادپەروەری دەوڵەمەند بم بە مادە ، بەڵام مەرجە بەهۆی دادپەروەری دەوڵەمەند بم بە ڕەوشت ، ئەمەش لەلای کەسانێك هەستیپێدەکرێت کە دڵیان بۆ دادپەروەری دەسووتێت ، هەموو کاتێکیش زۆربەی مرۆڤەکان سڵدەکەنەوە لە دادپەروەری ، ئەمانەش ئەوانەن کە بەهۆی نادادپەروەریەوە توانیویانە بگەنە هەندێك لە ئامانجە مادیەکانیان ، ئەمەش نەك نادادپەروەریە ، بەڵکو بێڕەوشتی و بێ هونەری و ناپاکیشە بەرامبەر بە جڤاك ، کەواتە هەرگیز یاساکانی دادپەروەری لە خۆم ناشارمەوە .**

**– ئەی مرۆڤەکان ، ئێوە بۆچی مردوون و هەریەکە و چەند شۆقاوێك زەویتان داگیرکردووە ؟ هیچ وەڵامێك نەهات . بەڵام لەپڕ یەکێك لە کێلەکان درزی دا .**

**فرووزە نزیك بۆوە ، سەیری نووسراوی سەر کێلەکانی کرد و بۆیدەرکەوت کە هەریەکەیان لەپێناو ئامانجێکدا مردووە .**

**هەندێکیان لەپێناو خاکدا خۆیان فیدا کردبوو ، ئەمەش بەهۆی بەرگریکردنیان لەبەرامبەر دووژمن کوژرابوون ، چونکە مردنیان پێ باشتر بوو لە سەیرکردنی دووژمن لەناو خاکەکەیان ، لەتەك ئەمەشدا لە داهاتوو ترسابوون ، تاوەکو بە چاوێکی نزم سەیریان نەکرێت ، ئەم هەڵبژاردنەشیان بۆنی مەرگی لێهاتووە ، کەواتە ئەوانە دادپەروەرترین کەس بوون کە لەپێناو خاکدا مەرگیان هەڵبژاردووە .**

**لەسەر یەکێك لە کێلەکانی گۆڕستانە چۆلەکە نووسرابوو ؛ ژیان بۆ ئەو کەسانە پێویستە کە لەخەم خاك و زمان و خوێن و ڕەوشتی نیشتمانەکەیانن ، نەك سامان و پادشایەتی و بە کۆیلەکردنی نیشتمانەکەیانن .**

**لەسەر کێلێکی تر نووسرابوو ؛ هەموو کاتێك نادادپەروەری لەلای کەسانێك سەرچاوەدەگرێ کە هیچ نازانن و دەڵێن زانستمان لە هۆشدایە . لەسەرەوە دەگرین ، بەڵام خەندە لە ناخیاندایە . باسی داهاتوو دەکەن ، بەڵام گێڕانەوەی ڕابردوویان لە بەرنامەدایە .**

**فرووزە بۆیدەرکەوت کە ، پێویستە ڕابردوو پەندی لێوەربگیرێت بۆ دانانی بناغەیەکی پتەو بۆ داهاتوو ، نەك گێڕانەوەی یاسا و مەرجە بێبنەماییەکانی ڕابردوو بکرێنە ناوەڕۆکی یاسایەکان**

بۆ داهاتوو ، چونكە دانانی بناغەی داهاتوو بە هەمان شێوەی بناغەی ڕابردوو ئەوا پێشكەوتن نیە ، كەواتە ئەمەش ئاكاری كەسانی نادادپەروەر و بێئەزموونە ، كەواتە دادپەروەری تەنها بۆ یەكسانی نیە لە نێوان تاكەكانی جڤاك ، بەڵكو داڕشتنی بەرنامە و یاساكانی وڵاتیش لە ئەستۆی خۆی دەگرێت ، لەگەڵ ئەوەشدا دادپەروەری پەیووەندی بە هەموو ژیانی مرۆڤەوە هەیە و ناتوانێت لە هیچ كارێكدا نكۆڵی لێبكات ، كەواتە دادپەروەری مانای ژیان دەگەیەنێت . هەرچی لە ژیاندا هەبێت و تەنها هەناسەش بدات پەیوەندی بە دادپەروەریەوە هەیە ، پێویستە لە هەموو كارێكیشدا كەسی لێهاتوو هەبێت ، چونكە كەسی ناشارەزا ناتوانێت كارەكان بە تەواوی بە ئەنجام بگەیەنێت ، گەر كەسی لێهاتوو هەبێت ، تایبەت بە هەر كارێك ئەوا كارەكانیش بەبێ كەم و كوڕی بە ئەنجام دەگەن ، ئەمەش دەبێت كەسی لێهاتوو خۆی تەرخانبكات بۆ فێركردنی كەسانی تریش ، چونكە ژیان تەنیا بۆ ئەو درووست نەبووە تا ئەو بتوانێت بەتەنیا ئەو پیشەیە بكات ، كەواتە دەبێت كەسانی تریش فێری كارەكەی بكات بۆ خزمەتكردنی جڤاك ، ئەمەش دادپەروەریە ئەو یاسایە دادەنێت بۆ فێركردنی كەسانی تر ، بۆ باشكردن و بەرەوپێشەوە چوونی جڤاك .

فرووزە ماوەیەك بێدەنگ بوو ، دواتر بەرەو لایەكی تری گۆڕستانەكە ڕۆیشت ، لەسەر كێلی یەكێك لە گۆڕەكان نووسرابوو ؛ ژیانی ئاوارەیەك هەزار خۆزگە بە ژیانی ڕێبەرێكی دادپەروەر . فرووزە ماوەیەك ڕاما ، دواتر فكری كردەوە كە ئەمە بەدوای دڵسۆزی و ڕەوشت بەرزیەوە وێڵ بووە و نەگەیشتۆتە ئامانجەكانی ، ئەمەش بەهۆی ئەوەوە بووە كە كەسانی تر هەمان فكرەی ئەویان نەبووە ، ئەمەش هۆكار بووە بۆ زوو مردنی ئەو . لەمەشەوە فرووزە بۆی دەركەوت كە دادپەروەری بە تەنیا ناگات بە ئەنجام ، بەڵكو بەهۆی زۆرینەوە بە ئەنجام دەگات ، هەروەها بەهۆی زۆرینەوە زووتر مەبەست و ئامانجەكانی دادپەروەری لەناو جڤاكدا بڵاودەبنەوە ، كەواتە مرۆڤ گشتی تاوانبارە لەبەرامبەر دادپەروەری ، بەڵام هەمیشە خۆی بە دادپەروەر لەقەڵەم دەدات . ڕێبەری دادپەروەر هەربۆیە ژیانی تاڵە ، چونكە بەرژەوەندی گەل دەخاتە پێش بەرژەوەندی خۆی و كەسە نزیكەكانی ، تەنها بە دەنگی كەسە نزیكەكانی خۆی نیشتگەی بەڕێوەبردنی وڵاتی بەدەست نەهێناوە ، بەڵكو زۆرینە كەسە دوورەكانی خۆی بوون كە بردوویانەتە سەر ئەو نیشتگەیە ، لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە مامەڵەیەكی دادپەروەرانە

لەگەڵ جڤاکدا بکات ، ئەگەر مامەڵەی دادپەروەرانە نەبوو ، ئەوا پێویستە یاسای چوونە سەر نیشتگەکەی هەڵبوەشێنرێتەوە ، چونکە یەکێك لەو یاسایانەی کە گەیانوویەتی بەو نیشتگەیە دادپەروەریە . دادپەروەریش مەرج نیە تەنیا سوودی بۆ کەسێك هەبێت ، بەڵکو مەرجە سوودی بۆ گشتیەتی هەبێت " ، کەواتە دادپەروەری گشتیە نەك تایبەتی .

فرووزە ماندوو بوو لە قسەکانی . هەربۆیە ناچار بوو تەنها بەبێ دەنگی لەگەڵ خۆیدا بکەوێتە گفتوگۆ ، لە تەنیشت کێلەکانەوە .

لەگەڵ خۆیدا کەوتە گفتوگۆ ، گفتوگۆیەکەش ئەمە بوو .

دادپەروەری لەپڕ هات بۆ لامان ، بەلاّم لەپڕ بەبێ ئەوەی ئاگاداربین سلاّوی لێکردین . منیش لەو کاتەدا لە گەڕاندا بووم بۆ دۆزینەوە ، بەلاّم دادپەروەری نەبوو تا بدۆزمەوە . منداڵێکیش بەهۆی مامەڵەی دایك و باوکیەوە سەرگەردان ببوو ، بەلاّم دادپەروەری نەبوو لە هێنانە دنیای ئەو منداڵەدا . دایك بەدوای ئارەزووەکانی خۆیەوە بوو تا ژیانێکی هاوسەری تر درووستبکات ، بەلاّم هێشتا لەخەمی منداڵە کۆنەکەیدا بوو . باوك لەبەردەم کانیاوەکان دانیشتبوو ، لەلای ئەو هێشتا هیچ منداڵێك لەدایك نەببوو . منداڵیش دەیووت هێشتا کاتی ماوە بۆ پێداچوونەوە ، منیش تا ماوەیەکی تر دەتوانم خۆم ڕابگرم لەبەر چۆڕاوکەکان .

دادپەروەری لەولاوە وەستابوو بە زەردەخەنەیەکەوە سەیری دەکردن ، بەلاّم کەسێك نەبوو خۆی پێ بناسێنێ و هۆکارەکەی بۆ باس بکات . دایك و باوك بە ئارەزووە تایبەتیەکانی خۆیان گەیشتن ، منداڵیش بوو بە لاو ، هێشتا دادپەروەری زەردەخەنەی لەسەر لێوەکان بوو .

پاش ماوەیەك دەنگ و باس لەناو جڤاکدا بلاّو بۆوە ، لاوەکەش هەواڵی ئەمەی بیست و ڕوویکردە چۆڵەوانی و پرسیاری لەخۆی دەکرد .

باوك تاوانی کرد و دایکیش لاسایی کردەوە ، دواتر باوك دایکی تاوانبار کرد بەم کارە .

تاوانباری ڕاستەقینە باوك دەرچوو ، بەلاّم لاوەکەش ئەمەی دەزانی ، چونکە پێش ئەوەی دادپەروەران لەمە بکۆڵنەوە ئەمەی زانیبوو .

پاش ماوەیەك لاوەکە هەڵدرایە ناو بەندیخانەوە ، بەلاّم ئەو دزی نەکردبوو ، هەروەها یاساکانیشی نەشێواندبوو . زیندان بوو بە ماڵ ، لاویش سەرەتا پەیکەری بۆ دایك درووستکرد و

کڕنووشی بە باوك برد . بەڵام دواتر باوك هەستایە سەر پێ و بەسەر پەیکەرەکەدا هاواریکرد . لاوەکە ماوەیەك فکریکردەوە و بۆیدەرکەوت ، دایك گەورەترین نیشتمانە ، پرسیارکردن گەورەترین دەروازەیە ، شکستهێنان گەورەترین فێرگەیە .
لاوەکە ماوەیەك بێدەنگ بوو ، دواتر خۆی خنکاند ، چونکە بەم یاسایانەی دادپەروەری ڕازینەبوو ، بەڵام هۆکاری خۆ خنکاندنەکەی تا ئێستا نەزانرا . لەکۆتاییدا دادپەروەری مرد ، دواتر بەرە بەرە ئەوانیش مردن و لە زەویدا کۆتاییان هات .

فرووزە بە چاوی پڕ لە گریانەوە سەری هەڵبڕی بۆ ئاسمان و وتی : ئەی خوداوەند ، من لێرە برسیمە و تەیرەکان هاتوون گەمەم پێبکەن ، بەڵام سکی برسیم وەك زەنگی کڵێساکان ناوە ناوە ئاگادارم دەکاتەوە و پێمدەڵێت بفڕە بەسەر لقی درەختەکانەوە ، لە هەر چڵە درەختێك گەڵایەك لێبکەوە و بیخۆ ، بەڵام گەڵاکان وەریوون و زیندەوەرەکان هەموویان خواردوون ، هیچ شتێك نەماوە تا بتوانم دڵنەوایی بدەمەوە بە هۆشی ماندووم و سکی برسیم .
کەسێك لەولاوە لەگەڵ تەیرەکان کەوتبۆوە گفتوگۆ ، هەندێك لە باڵندە دڕندەکانیش نەیاندەهێشت خۆشەویستی خۆیان بۆ یەك دەرببڕن ، هێشتا کاتی نیوەڕۆ نەهاتبوو .
پەیماننامەی زەوی و ئاسمانەکان خۆی نەخشاندبوو ، چونکە باران دەم دەم دەباری و دەم دەمیش دەوەستا .

فرووزە لەم ناوچەیە ڕایکرد و گۆڕستانەکەی بەجێهێشت ، ڕوویکردە ناوچەیەکی بەرز کە بەسەر هەموو لادێیەکەدا دەیڕوانی ، لە بەرزاییەوە سەیری لادێیەکەی کرد ، بینی کە مرۆڤەکان گشتیان جیاوازن لە فکرەی خۆشەویستیدا ، هەندێك خۆشەویستی دەکەنە ئامانج بۆ هێنانەدی خەونەکانیان . هەندێکیش بە ڕاستی بەدوای خۆشەویستیدا وێڵن . هەندێکیش دەیانەوێت خۆشەویستی بۆ شتەکان دەربڕن ، بەڵام ناتوانن ، چونکە خۆشەویستیەکە تەنها بە قسەیە و دڵ ئاگای لێنیە ، بۆیە ناتوانن بەو خۆشەویستیە بگەن کە خۆیان مەبەستیانە ، چونکە تەنیا ڕووخساریان لەگەڵ خۆشەویستیدایە نەك دڵ ، ئەم خۆشەویستیەش تەنیا بۆ

گەیشتنە بە ئامانجێکی بێ مانا و دوورە لە یاساکانی مرۆڤ بوون .

فرووزە ماوەیەك فکریکردەوە . پاشان پرسیاری لە دەوروپشتی خۆی کرد ، بەڵام هیچ مرۆڤێکی لێنەبوو تا وەڵامی فرووزە بداتەوە ، بەڵکو تەنیا کێوەکان لەبەردەمی وەستابوون .

پرسیاری لە کێوەکان کرد ئایا خۆشەویستی چیە ؟ ئایا خۆشەویستی بۆ مرۆڤ بوونە یان بۆ ئامانج ؟

کێوەکان گوێیان لە فرووزە بوو ، بۆیە ئەوان نەیانتوانی بەبێ دەنگی بمێننەوە ، بۆیە دەنگێك هاتە بەر گوێیەکانی فرووزە ، ئەو دەنگەش کێوەکان بوون کە بە فرووزەیان وت : خۆشەویستی چیە ؟

– نازانم .

کێوی گەورە هاتە قسە . خۆشەویستی دڵسۆزی و پاکیە بەرامبەر بە شتەکانی دەوروربەر . بریتییە لە پاکیەکی بێسنوور و لە ئارامی و خۆ بە سادە نیشاندانی مرۆڤ کە لەناو دڵدا خۆی دەنوێنێ ، لەلایەکی تر خۆشەویستی بریتییە لە بەیەك گەیشتنی دوو کەس بە پاکی و ڕاستی ، خۆشەویستی لەکاتێدا سەرکەوتوو دەبێت لەناو مرۆڤەکان کە لەمانای خۆشەویستی تێبگەن ، هەندێك جار خۆشەویستی دەگەڕێتەوە بۆ یەك دڵ ، هەندێکجاریش دەگەڕێتەوە بۆ دوو دڵ ، خۆشەویستی لەنێوان دوو کەسدا دەگەڕێتەوە بۆ دڵی هەردووکیان نەك بۆ دڵی یەکێکیان ، ئەمەش لێرەدا بە هاوکاری دوو دڵ سەرکەوتوو دەبێت نەك یەك دڵ ، بەڵکو خوداش لە شوێنێك میهرەبانی خۆی دەردەخات کە مرۆڤەکانی ئەو شوێنە لە بەرامبەر یەکتریدا میهرەبان بن . مرۆڤ هەمیشە خۆشەویستی خۆی بە قسەکردن دەردەبڕێت نەك بە دڵ ، خۆشەویستیش پێویستی بە کردارە نەك بە قسەکردن ، خۆشەویستی مرۆڤ بەهۆی ئاکارەکانیەوە دەردەکەوێت . کاتێك مرۆڤ دەتوانێت خۆشەویستی خۆی لەناو جڤاکدا بەدەستبێنێ کە خۆی تەرخانبکات لەپێناو خۆشەویستیدا ، خۆشەویستی تەنها بریتینییە لە زەردەخەنە ، بەڵکو بریتییە لە گریانی بەرامبەر بۆ پاراستنی . خۆشەویستیش تەنها جۆرێك نیە و بەس ، بەڵکو چەندەها جۆر لەخۆ دەگرێت ، ئەمانیش زیاتر لەناو مرۆڤەکاندا ئەو جۆرانە دەردەکەون ، هەر مرۆڤە و خۆشەویستی بەرامبەر بەشتێك هەیە ، کەواتە خۆشەویستی هەموو بواریکی ژیان و بنەمایەکی مرۆڤ بوون دەگرێتەوە .

– کەواتە جۆرەکانی خۆشەویستی چین ، ئەی کێو ؟

– کاتێك ئێمە باس لە خۆشەویستی دەکەین پێویستە بکەوینە ناو باسی جۆرەکانی خۆشەویستیەوە . بۆ ئەمەش پێویستە گوێ لە هەموو کێوەکان بگری .

– بۆچی هەموو کێوەکان ؟

– هەر کێوێك دڵی بەلای جۆرە خۆشەویستیەکدا ڕۆیشتووە .

– کەواتە با ئاشنایەتی لەگەڵ دڵی کێوەکانیش پەیدا بکەم .

– کەواتە هەر کێوێك ناوی خۆی هەیە تا گفتوگۆی لەگەڵدا بکەیت .

– گرنگ نیە ، چونکە من تەنها خۆشەویستی ناو دڵی ئەوانم گەرەکە .

فرووزە لەگەڵ کێوەکان کەوتە گفتوگۆ .

– کێوی یەکەم ، هاتە قسە . ئەی مرۆڤ گوێیەکانت ڕادێرە تا باسی خۆشەویستی ئافرەتت بۆ بکەم .

– ئەی کێو ، گوێیەکانم ئامادەن و هیچ شتێك نابیستن جگە لە گۆتەکانی تۆ .

خۆشەویستیەکەی تۆ چیە بەرامبەر بە ئافرەت ؟ خۆ مرۆڤەکانیش بە هەمان شێوە ئەم جۆرە خۆشەویستیەیان هەیە بۆ ئافرەت .

– هی من جیاوازە لە هی مرۆڤ . چونکە هی من لە دڵەوەیە ، بەلاّم هی مرۆڤ تەنها بە گۆتەیە .

– کەواتە بڵێ . سەرەتاش ئەوەم بۆ ڕوونبکەرەوە کە ئافرەت چیە ؟

– ئافرەت ، بریتییە لە دیارییەکی گرانبەها بۆ مرۆڤ ، بەتایبەتی بۆ پیاو لەسەر زەوی .

بریتییە لە تەواوکەری ژیان بۆ مرۆڤ ، بەلاّم مرۆڤ هەمیشە بەشێوەیەکی کەم لە ئافرەت دەڕوانێت ، لەگەڵ ئەوەشدا وادەزانین کە هەرچی کار و تێکۆشانە پیاو ئەنجامی داوە ، بەلاّم بەپێچەوانەوە ئافرەت گەر دوو ئەوەندە ڕۆڵی نەگێڕابێت لە کار و تێکۆشان ئەوا هیچی کەمتر نیە ، ئەمەش بەزۆری لەناو مێژووی جڤاکدا بە ڕوونی دیارە گەر پیاو چاوی خۆی بەرامبەر دانەخات ، لەگەڵ ئەوەشدا ئافرەت دوو ئەوەندەی پیاو خزمەتی بە خاك و زمان و نەوەی داهاتوو کردووە ، چونکە پیاو بەردەوام بەهۆی گەڕان و سەفەرکردنەکانیەوە لە جڤاك دوور کەوتۆتەوە ، بەلاّم ئافرەت کەمتر سەفەریکردووە و گەڕاوە ، ئەمەش هەم پیاوسالاریە بەرامبەر بە ئافرەت و هەم پیرۆزیەکە بۆ ئافرەت دەگەڕێتەوە .

– چ پیرۆزیەك ؟

– گەر بهاتبایە و ئافرەت بووایە ئەوا لێکجیابوونەوە ڕوویدەدا ، بەلاّم لەبەرئەوەی ئافرەت خۆڕاگرترە ئەوا لێکجیابوونەوە کەمتر بوونی هەیە ، ئەمەش بۆ خۆڕاگری و ئارامی ئافرەت دەگەڕێتەوە نەك پیاو ، ئەمەش پیرۆزی ئافرەت دەردەخات . هەروەها بوونی پیاو بە بوونی ئافرەتەوە بەستراوەتەوە .

– ئەم پێکەوە بەسترانە لەناو هەموو زیندەوەرێکدا بوونی هەیە .

– بەڵێ ، لەناو نێر و مێی هەموو زیندەوەرێکدا . هەربۆیە هیچ زیندەوەرێك بەبێ مێینە ناتوانێت ببێت بە نێرینە ، کەواتە مرۆڤ پێویستە ڕێز لە ئافرەت بگرێت وەك چۆن زیندەوەرانی تر ڕێز بۆ مێینەکانیان دادەنێن ، هەموو کاتێکیش پیاو لە کار و کردەوەکانیدا بەهۆی ئافرەتەوە سەرکەوتوو دەبێت . گەر دەستی ئافرەت بوونی نەبێت لە کارەکان ئەوا کارەکان بەهیچ شێوەیەك ناگەن بە ئەنجام و تاسەر بەردەوام نابن .

– ئەم جیاوازیە لەلای ئافرێنەرەوەیە یان لەلای مرۆڤ خۆیەوەیە ؟

– ئافرەت و پیاو لای خودا جیاوازیان نیە ، بەلاّم ئەوە مرۆڤەکانن ئەو جیاوازیەییان درووستکردووە بەتایبەتی پیاو ، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو خۆپەرستیەی کە پیاو هەیەتی ، چونکە سرووشتی نێرینە وا ڕەخساوە کە جۆرێك لە خۆپەرستی تێدایە ، ئەمەش لە نێرینەی هەموو زیندەوەراندا ئەو خۆپەرستیە بوونی هەیە ، بەلاّم گەر بێتە لایەنی ئەوەی کە ڕووبەڕووی مەترسی ببێتەوە ئەوا بێشك یەکەم جار پەنا بۆ مێینە دەبەن ، چونکە مێینەی هەموو زیندەوەرێك بە مرۆڤیشەوە هۆکاری هاندانن بۆ سەرکەوتنەکانی نێرینە .بۆنمونە لە جەنگدا ئافرەت دەتوانێ لە پێشەوەی پیاو بێ ، بەلاّم ناتوانێ لە بەرژەوەندیدا لە پێشەوەی پیاو بێ . خۆپەرستی و کلتور وایکردووە کە ئافرەت تەنیا وەك پێداویستیەکی ژیانی پیاو سەیر بکرێت ، ئەمەش بە زۆری لە ولاّتە نیمچە دواکەوتووەکان و ئەوپەڕی دواکەوتووەکاندا هەیە ، هەروەها ئەم جۆرە ڕەفتارە سەرتاپای ئەو ولاّتە دواکەوتووانەی تەنیووە ، لەوانەشە کەسانێك هەڵکەون لەو ولاّتانەدا کە ئەم جۆرە کلتوورە پەیڕەو نەکەن و هەندێك ماف بە ئافرەت ببەخشن ، بەلاّم ئەم کلتوورەی کە لە ولاّتەکەیدا بوونی هەیە ، هێشتا لەناو دڵیدا کاری خۆی دەکات ، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ چۆنیەتی و چەندێتی ئافرەتەکە لەلای پیاو .

– چی شتێك لێرەدا گرنگی پیاو دەردەخات ؟

– تەمەن و جوانی گرنگی پیاو دەرناخات ، بەڵكو ڕەوشتی ئەو بەرامبەر بە ئافرەت ئەو گرنگیە دەردەخات . هەموو كاتێك پیاو زیاتر گرنگی بە ئافرەتێك دەدات كە لە قەد و باڵادا جوان بێت ، بەڵام ئەوە هەڵەیەكە كە لەلایەن پیاوەوە سەرهەڵدەدات ، چونكە جوانی لە دەروونەوەیە نەك لە ڕووخسار ، ئەمەش وایكردووە كە پیاو لە بەرامبەر جوانی ئافرەت هەندێك ئاكار بنوێنێ كە دڵخۆشی بكات ، بەڵام ئەو ئاكارانە لە دڵەوە نین ، بەڵكو بڕیاری پێش هزرینن ، تەنانەت سۆزی دڵیشیان تێدا بەدیناكرێ . ئەم بڕیارانەش ناتوانن تاسەر بمێننەوە ، چونكە بەهۆی هەندێك هەڵسوكەوتی نابەجێ كۆتاییان پێدێت و پێچەوانە دەبنەوە ، ئەو خۆشەویستیەی كە پیاو بەرامبەر بە ئافرەت دەریدەبڕێت تەنیا ڕەمزیە ، چونكە گەر لە دڵەوە بێت ئەوا بەهۆی ڕەفتارێكی ناشرین كۆتایی نایەت ، لەگەڵ ئەوەشدا ئافرەت زۆر بەكەمی لە جوانی دەڕوانێت ، چونكە بەشێكی زۆری ئافرەت هزرینی هەیە بۆ ژیانێكی شیاو لەگەڵ پیاودا ، تەنانەت هەندێك ئافرەت نەبێت ، بەڵام ئەو هزرینە لەلای پیاو تەنیا بۆ جوانی و تەمەنەكەیەتی ، هەرچەندە ئافرەت لە دەروونەوە ئازاترە ، ئەمەش لە هەندێك كاتدا دەردەكەوێت كە پیاو ڕووبەڕووی كێشە و گرفت دەبێتەوە ، بەڵام پیاو ئەو توانایەی ئافرەتی شاردۆتەوە ، ئەمەش بەهۆی بە كۆیلەكردنی لەلایەن هەندێك كلتوورەوە ، ئەمەش ترسنۆكیە بۆ ئەو پیاوە و هەم بۆ ئەو كلتوورەش كە ئەم جۆرە ڕەفتارە لەخۆدەگرێت ، چونكە مافی پیاو چەندە بێت ئەوا مافی ئافرەتیش ئەوەندەیە ، چونكە خۆشیەكانی ژیان تەنیا بۆ پیاو نەهاتووە ، بەڵكو بۆ ئافرەتیشە . ترسنۆكترین پیاو ئەوەیە كە لەلای ئافرەت دەنگی بەرز دەكاتەوە و لە دووری ئافرەتیش دەناڵێنێ .

– كەواتە چی وایكردووە كە پیاو لە خۆشەویستی لەگەڵ ئافرەتدا بترسێنێ ؟

– لەناو مرۆڤەكاندا ، پیاوان لە خۆشەویستی ئافرەت دەترسن ، بەڵام خۆیان هۆكاری ئەو ترسەن ، چونكە كۆمەڵێك هۆكاری نابەجێی پیاو وایكردووە كە ئەو ترسە درووست بێت ، ئەمەش وایكردووە كە متمانەی لەلای ئافرەت نەمێنێت ، هەربۆیە نەبوونی متمانە بۆتە ترسێك لەنێوان هەردوولادا ، بەڵام زیاتر ئەو ترسە بەلای پیاوەوەیە نەك بەلای ئافرەتەوە ، چونكە زۆربەی گرفتەكان پیاو دەیڕەخسێنێت ، ئەمەش زیاتر بەهۆی هەڵسوكەوتی ئاسایی

ئافرەتەوە ئەم ئاکارە لەلای پیاو سەرهەڵدەدات ، لەوانەشە هەندێك ئافرەت لەناو جڤاکدا دەرکەون کە گرنگی بە سامان و جوانی پیاو بدەن ، بەلاّم ئەوەش هەر خۆی دەگەڕێتەوە بۆ ڕەفتارەکانی پیاو ، چونکە ئەو ئافرەتە بەهۆی باوکی یان برایەوە ئەو جۆرە ئارەزووەی بۆ درووستبووە ، ئەویش لەکاتی هاوژیانیدا .

– بەدیدی تۆ باوك و برا ئەو کەشە نا هەموارە بۆ ئافرەت دەرەخسێنن ؟

– بەڵێ ، ئەمە وایە . بۆنمونە کاتێك ئافرەتێك هاوژیانی پێکدەهێنێت ، پێش شوکردنەکەی برا و باوکی ئافرەتەکە لە سامان و جوانی ئەو کەسە دەکۆڵنەوە ئەوکات بڕیار بۆ ئافرەتەکە دەردەکەن کە  هاوژیانی پێکبهێنێت یان نا ، ئەم لێکۆڵینەوەیەش بەپێی داواکاری ئافرەتەکە نیە ، بەڵکو بەپێی داواکاری باوك یان برایە ، کەواتە لێرەشدا ئافرەت لە کۆیلەبوونێکی بالاّدایە و کۆیلەی دەستی برا و باوکە ، دواتر کە هاوژیانی پێکدەهێنێت ئەوا تووشی بە کۆیلەبوونێکی تر دەبێت ، ئەمەش خۆی لە خۆیدا زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کلتوورەی کە پێشتر هەبووە و ئێستا بۆی ماوەتەوە ، ئەو کلتوورەش کلتوورێکی بە کۆیلەکردنە و لە ولاّتە دواکەوتووەکاندا بەردەوام کاری خۆی دەکات ، کەواتە ئەم ولاّتەش خۆی ولاّتێکی بە کۆیلەکردنە .

فرووزە ڕوویکردە کێوی دووەم .

– سلاّو .

– سلاّو .

– ئەی کێو ، تۆش مەبەستی دڵی خۆت دەربڕە لەمەڕ خۆشەویستی .

– ژیان دڵی منی داگیر کردووە لە خۆشەویستی .

– کەواتە تۆ شەیدای ژیانی و بەس .

– بەدڵنیاییەوە .

– کەواتە بڵێ . با منیش لەو جۆرە خۆشەویستیەی تۆ کە بۆ ژیان هەتە ، پەندێك وەربگرم .

– بێگومان ، ژیان خۆی بریتییە لە کۆمەڵێك پەند .

– ئادەی بزانم خۆشەویستیەکەی تۆ سەبارەت بە ژیان چیە ؟

– ژیان بریتییە لە هەناسەیەکی کاتی بۆ زیندەوەرەکان . بریتییە لە سەرەتایەکی بێ ئاگا و

هەڵسوكەوتێكی ئاگادار و مردنێكی كتوپڕ . ژیان بۆ هەرچی زیندوویەك كە درووستدەبێت پێوویستە ، چونكە بێئاگا دەئافرێنرێت ، ژیان زیاتر بۆیە خۆشەویستە ، چونكە ترسی مردن هەیە ، ئەو مردنەش هیچ زیندوویەكی سەر زەوی نازانێ چۆنە ، گەر زانرابا ئەوا ژیان بەو ڕادەیە خۆشەویست نەدەبوو لەلای زیندووەكان ، چونكە مرۆڤ لە هەوڵداندایە بۆ بەدەستهێنان و كۆكردنەوەی بژێوی .

– ئەم كۆكردنەوەی بژێویەش بەپێی مرۆڤەكان دەگۆڕێت ؟

– دەگۆڕێت ، هەندێك فكر لەوە دەكەنەوە كە كەمێك كۆبكەنەوە تا مردن ، چونكە پێیانوایە كە دەبێت بەجێیبهێڵن ، بەڵام فكر لە نەوەكانی دوای خۆیان ناكەنەوە ، ئەمەش دوورە لە خۆشەویستی بۆ ژیان ، چونكە پێویستە ئەوەندە بەجێبهێڵن تا نەوەكانی داهاتوو بتوانن ماوەیەك سوودی لێوەربگرن تا دەگەنە قۆناغێك و بتوانن فكر لەوە بكەنەوە كە خۆیان ببنە خاوەنی خۆیان ، بەڵام هەندێك مرۆڤ فكر لەوە دەكەنەوە كە هەرچی دەكرێت بەدەستی بهێنن ، بۆ ئەوەی كە مردیشن كەسانی تر یان نەوەكانی داهاتووی خۆیان سوودی لێوەربگرن ، ئەمەش دوورە لە خۆشەویستی بۆ ژیان ، چونكە بەجێهێشتنی زۆری داهات وادەكات كە نەوەكانی داهاتوو نەتوانن فكر لە بوونی خۆیان بكەنەوە ، هەروەها نەبنە خاوەنی خۆیان ، ئەمەش لە كۆتاییدا بەرەو ڕیسوابوونی دەبات ، ژیان بۆ ئەو كەسانە پێویستە كە خۆیان خاوەنی فكرەی خۆیانن نەك خاوەنی فكرەی كەسانی ترن و لە پێناو ڕابردوودا دەژین ، چونكە نەبوونی فكرەی تازە لە ژیاندا بریتییە لە تاوانی گەورە ، ئەمەش دواكەوتن و ڕووخانی ژیانە بۆ ئەو كەسانە .

– بە دیدی تۆ ، ژیان هاوڕێی ئەو كەسانەیە كە دەفكرن و ناتوانن لە بینینی تاوان بێدەنگ بن ، كەواتە تاوان چیە لێرەدا ؟

– تاوانكردن یەكێكە لەو خاڵە جەوهەریانەی كە دەبێتە هۆی دواكەوتنی بنەماكانی خۆشەویستی ژیان ، كە ئەم خۆشەویستیەش زۆر گرنگە بۆ ژیانی مرۆڤ ، بەڵام نەبوونی پێشكەوتن بەتایبەتی لە وڵاتە دواكەوتووەكان بۆتە هۆكاری ئەوەی كە لەناو مرۆڤەكاندا بێ هیوایی درووستدبێت ، ژیان لە وڵاتە دواكەوتووەكاندا بۆ هەموو زیندووەكان بۆتە مەرگ ، بەتایبەتی بۆتە هۆكاری ئەوەی كە مرۆڤەكان هیچ ئومێدێكیان بە ژیان نەمێنێت ، كەواتە

**لێرەدا هیچ خۆشەویستیەك بۆ ژیان نیە ، ئەمەش زیاتر بەهۆی فەرمانڕەوای تەمبەڵەوە دروستدەبێت و دواتر سەراپای جڤاك دەگرێتەوە .**

**– چێژ بینینی مرۆڤ چیە لە ژیاندا ؟**

**– مرۆڤ هەمیشە چێژ لە ژیان دەبینێت ، بەڵام هیچ خۆشەویستیەکی بۆی نیە ، ئەمەش زیاتر بەهۆی تێکدانی سروشت و ژینگەوە ئەو خۆشەویستیە لەناو دەچێ ، چونکە خۆشەویستی بۆ ژیان پێویستی بەڕەچاوکردنی هەموو بنەمایەك هەیە تاوەکو درووستببێت. ژیان هەرچەندێك مەودای پێدای خزمەتی هەژارانی پێبکە ، نەك نان خوساندن بۆ دەوڵەمەندەکان .**

**– لەبەرچی ؟**

**– هەژاران کەسانێکن زۆر فکر لە ژیان دەکەنەوە ، ئەمەش وایکردووە کە هەرچی هەیە بۆ ژیانی بگێڕنەوە ، بۆیە زیاتر ژیان لەلای ئەوان بۆتە مەرگێکی کاتی نەك خۆشیەکی کاتی ، کەواتە چێژ وەرگرتن لە ژیان پێویستی بە یەکسانی نێوان مرۆڤەکان هەیە ، ئەوکاتە خۆشەویستی بۆ ژیان درووستدەبێت کە هەموو مرۆڤەکان یەکسان بن ، بەڵام لەبەرئەوەی یەکسانی نیە ئەوا هەرگیز خۆشەویستیەکی تەواو بۆ ژیان نیە لەناو مرۆڤەکاندا .**

**– بە دیدی من لێرەدا دەگەینە پێناسەیەکی تر بۆ ژیان .**

**– بەڵێ ، ژیان وەك ئەڵقەیەك وایە ، گەر بۆ پەنجەکانت بەکاری نەهێنی ، ئەوا ئەو تۆ بۆ پەنجەکانی خۆی بەکاردەهێنێ .**

**– یانی چۆن ؟**

**– کاتێك کە مرۆڤەکان نەتوانن بەسەر نەهامەتیەکانی ژیاندا زاڵ بن ئەوا ناشتوانن چێژ لە ژیان ببینن . مرۆڤ هەمیشە لە فکری ئەمڕۆدایە نەك سبەی ، بەڵام خۆشی ژیان لە سبەیدا دەردەکەوێت نەك ئەمڕۆ ، کۆمەڵێك کەسیش هەن کە تەنیا چێژ لە مڕۆ دەبینن نەك سبەی ، بەڵام چێژی ژیان لە سبەیدا خۆی نیشاندەدات .**

**– کەواتە مرۆڤ خۆی هۆکاری ئەو چێژەیە کە دەکرێ پێی بگات یان پێی نەگات .**

**– ژیان هەلی بۆ هەموو مرۆڤەکان ڕەخساندووە ، بەڵام مرۆڤەکان بۆخۆیان خۆیان بێ هیوا کردووە ، ژیان بۆ هەموو مرۆڤەکان بواری ڕەخساندووە ، بەڵام خۆیان جیاوازی دەخەنە ناو ئەو بوارانەوە ، چونکە مرۆڤەکان هەرچەندێك هەوڵبدەن ناتوانن فکرەیان وەك یەك بێت ،**

**هەر ئەمەش وایکردووە کە خۆشی ژیان لەناو مرۆڤەکاندا جیاواز بێت ، کە ئەمەش زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ هۆشی مرۆڤەکان ، مرۆڤ هەیە ئاوەزی چالاکترە لە ئاوەزی مرۆڤێکی تر ، کەواتە ئاوەزی چالاك زیاتر دەتوانێت شتەکان وەربگرێت ، لەناو ئەم شتانەشدا خۆشەویستی یان ڕقلێبوونەوە بۆ ژیان هەیە ، ئەمەش زیاتر پەیووەندی بە کەش و هەواوە هەیە .**

**– ئیدی کەش و هەوا چ پەیووەندیەکی بەم بابەتەوە هەیە ؟**

**– زەوی وەك مرۆڤ ژیانیش هەڵدەسووڕێنێ ، وەك مرۆڤ گۆڕانکاریشی بەسەر دێنێ ، بەڵاَم وەك مرۆڤ نایمرێنێ ، ئەمەش پەیووەندی بە وەرزەکانەوە هەیە ، مرۆڤ هەیە لە وەرزێکدا خۆشەویستی بۆ ژیان نامێنێت ، بەڵاَم لەوەرزێکی تردا خۆشەویستی بۆ ژیان ڕوو لە زیادبوون دەکات ، وەك هەژاری و دەوڵەمەندی ، هەژارەکان لە وەرزی زستاندا خۆشەویستیان بۆ ژیان کەمدەبێتەوە ، چونکە هەژاری بەرۆکی گرتوون و ناتوانن لەم وەرزەدا بژێوی خۆیان دابین بکەن ، بەڵاَم دەوڵەمەندەکان خۆیان بە مرۆڤ خودا لەقەڵەم دەدەن لەم وەرزەدا و توانای بەرگەگرتنی چەندەها وەرزی تری وەها لەم شێوەیان هەیە ، لەگەڵ ئەوەشدا بیروڕایان وایە کە ژیان بۆ ئەوان هەر بەم شێوەیە دەمێنێتەوە و خۆشیەکانی ژیان تەنیا بۆ ئەوانە و بەس .**

**– مەبەستەکەت ئەوە دەگەیەنێت کە ، ژیان بۆ مرۆڤەکان ناگۆڕێت ، بەڵکو ئەوە مرۆڤەکانن گۆڕانی بەسەردادێنن ، بەڵاَم هەستی پێ ناکەن .**

**– مەرج نیە کەسانێك بتوانن هەموو کات خۆشەویستی ژیان بەدەستبهێنن ، بەڵاَم مەرجە هەموو کاتێك بتوانن نەهامەتیەکانی ژیان بەدەستبهێنن ، کەواتە ژیان دوو ڕووە ، ئەمڕۆ خۆشی بۆ تۆیە و سبەی بۆ ئەو ، بەڵاَم هەرچۆنێك هاتە بەردەمت ئەوا ڕووی لێ وەرمەگێڕە و پێی ڕازیبە ، چونکە سبەی گۆڕانکاری بەسەردادێت ، بەڵاَم گرنگ ئەوەیە کە تۆی مرۆڤ بتوانی هۆشی خۆت بخەیتە کار لەبەرامبەری ، چونکە ئەویش وەك خۆشەویستی نێوان دوو دڵدار وایە ، ئەمڕۆ لێت زیور بووە و تووڕەیە ، بەڵاَم سبەی لەگەڵتدا ئاشتدەبێتەوە ، بەڵاَم هەرچۆنێك مەودای پێدای بە سەر بەرزی مامەڵەی لەگەڵدا بکە . ژیان بۆ ئەو کەسانەی کە دووڕوون ، هەم مردنە و هەم دۆزەخ ، چونکە لە داهاتوویەکی نزیکدا مەبەستەکانیان ئاشکرا دەبن .**

**– پێموایە بابەتەکەت بە لایەکی تردا برد .**

**– نەخێر ، هێشتا لەناو بابەتەکەم .**

– مەبەستم دووڕووییە کە لەپڕ هێناتە ناو بابەتەکەوە .

– ئەمەش یەکێکە لەو هۆکارانەی کەپێویستە مرۆڤ مانای بزانێت .

– چ مانایەکی هەیە ، دووڕوویی ؟

– دووڕوویی ، واتە نا مرۆڤ بوون .

– تەنیا ئەم وشەیە ؟

– بەڵێ تەنیا ئەم وشەیە .

– ئادەی ئەم وشەیەم بۆ شیبکەوە .

– مرۆڤ تا ماوەیەکی کەم دەتوانێت دوو ڕوویی لە ژیاندا بکات ، چونکە ژیان خۆی کاتیە و بۆ مرۆڤیش هەر کاتیە ، کەواتە دووڕوویی هیچ ئامانجێکی نیە و مرۆڤ دەخاتە ناو شەرمەزاریەکی گەورەوە ، بەڵام دووڕوویی بە شێوەیەی جیاواز خۆی دەنوێنێ لەنێوان مرۆڤەکان ، مرۆڤ هەیە دووڕوویی دەکات و پێوەی دیارنیە ، هەرچەندە دووڕووییەکەی گەورەش بێت ، بەڵام مرۆڤ هەیە دووڕوویی دەکات و بە هەموو جڤاکدا بڵاو دەبێتەوە ، بەڵام دووڕووییەکەشی بچوکە .

– بەدیدی تۆ چی بکەین باشە ؟

– لەو ماوە کەمەی کە لە ژیاندا بوونت هەیە ، با زیانەکانت زیاتر بۆ خۆت بن ، نەك بۆ دەوروبەر ، چونکە مرۆڤی پاك زیانەکانی خەڵك لەبەرچاو دەگرێت ، نەك زیانەکانی خۆی .

– پێموایە ، فکرەی وەها لەمشێوەیە تەنیا لەناو هەژارەکاندا بوونی هەیە ، چونکە دەوڵەمەندەکان تەنیا فکر لە زیانەکانی خۆیان دەکەنەوە و زیانەکانی کەسانی تر دەخەنە ژێر پێیەکانی خۆیانەوە .

– کەواتە فرووزە ، خۆشەویستی ژیان لەلای هەژارەکانەوە سەرچاوەدەگرێ نەك دەوڵەمەندەکان ، بەڵام لەبەرئەوەی دەسەڵاتیان نیە ئەوا ناتوانن سەرتاپای خۆشەویستیەکانی ژیان بۆ مرۆڤەکانی دەوروبەریان دابینبکەن ، ئەمەش کەسانێکی بەرژەوەندی خوازن کە ڕێگری ئەم کارە پیرۆزەی هەژارەکان دەکەن ، ئەمەش پەیووەندی بە درۆکردن و ڕاستی وتنەوە هەیە .

– بۆچی درۆ و ڕاستی ؟

– یەکێك لە گەورەترین پیرۆزیەکانی ژیان بریتیە لە دانپیانان بە ڕاستیەکاندا ، چونکە

گەورەترین کێشەی مرۆڤ بریتییە لە وتنی ڕاستی ، لەناو مرۆڤەکاندا کەسانێك هەن خۆیان بە دوور دەگرن لە ڕاستیەکان ، چونکە پێیانوایە کە ڕاستی لە ژیاندا بریتییە لە تاوان ، هەروەها فکر لەوە دەکەنەوە کە ڕاستی بڵێن سامانەکەیان بە هەدەر دەڕوات ، بەڵام نازانن کە تەنیا ڕیسوا بوونی ئەوانی لێدەکەوێتەوە .

– پێموایە ڕیسوا بوونیش بۆ مرۆڤ ، واتە مردن .

– بەڵێ . ڕیسوابوون ، بریتییە لە مردن بۆ مرۆڤەکان . ڕیسوا بوون ، واتە خۆشەویستی لە ژیاندا نامێنێت و ماڵئاوایی دەکات . کەواتە ڕۆژێك زیاتر ژیان کردن ، بریتییە لە ڕۆژێك تاوانی زیاتر بۆ مرۆڤ ، چونکە مرۆڤ سروشتی وا ڕەخساوە کە ناتوانێت بە تەواوی خۆی لە تاوان بە دوور بگرێت ، بەڵام تاوان هەرچەند بچوکتر بێت ئەوا باشترە بۆ کەسەکان ، چونکە لەوانەیە تاوانی گەورە ژیان تاڵ بکات ، ئەوکاتەش بێزاری لە ژیاندا سەرهەڵدەدات و دواتر لەوانەیە خۆ کوشتن ڕوودەدات .

– کەواتە پێم بڵێ ، خۆشترین ژیان ، چ ژیانێکە ؟

– خۆشترین ژیان ئەوەیە کە کەم بژیت و تاڵ بژیت ، نەك زۆر بژیت و بە شیرنی خۆت خەڵکی بێزار بکەیت ، زۆر ژیانکردن لەوانەیە هەم تاوانی زۆر و هەم بێزاری زۆر و هەم ڕکلێبوونەوە بێت بۆ مرۆڤ ، چونکە شتەکان زۆر دووبارە دەبنەوە بۆ مرۆڤ ، کەواتە خۆشەویستی ژیان بە هۆی تەمەنی زۆرەوە بەرەو کەم بوونەوە دەچێت . فکرەی نەمان و ڕۆیشتن لە دنیادا لەناو ئاوەزدا دروستدەبێت و سەراپای ئاوەز داگیر دەکات ، ئەمەش هیچ خۆشەویستیەك بۆ ژیان لەناو هۆشدا ناهێڵێت .

– ئیدی مرۆڤ چی بکات باشە ، ئەی کێو ؟

– باشترین شت بۆ مرۆڤ ئەوەیە کە ژیان بکات بۆ مردن ، نەك خۆی بمرێنێ لە پێناو ژیاندا ، ژیان ماوەیەکی کاتیە و مرۆڤ تێیدا بە هەواو ئارەزووەیەکی کەم دەگات ، ژیان مرۆڤی پێ ناپارێزرێت و پێشی لەناو نابردرێت ، بەڵکو ئەوە مرۆڤە دەبێت ژیان بپارێزێ بەهۆی ڕەفتارەکانیەوە .

بێ ئەوەی فرووزە هیچ شتێك بڵێت ، كێوی سێیەم وتی ؛ مردن .

– فرووزە لەگەڵ كێوی سێیەمدا كەوتە گفتوگۆ .

– ئەی كێو ، بۆچی مردن ؟

– فرووزە ، ئایا فكرت لەوە نەكردۆتەوە كە مردنیش گرنگی خۆی هەیە ؟

– نا .

– كەواتە گوێیەكانت ڕادێرە ، چونكە من خۆشەویستیم بۆ مردن هەیە .

– لەبەرچی ، خۆشەویستی بۆ مردن ، ئەی كێو ؟

– مردن بریتییە لە یەكێك لە دەستكەوتە گرنگەكانی مرۆڤ و بەردەوامبوونی ژیانی مرۆڤ ، مردن بریتییە لە درێژترین خەوی مرۆڤ و ئارامبوونی گیانی مرۆڤ لە زەویدا . كەواتە تۆ یەكێك بە لەو زیندەوەرانەی كە خۆشەویستیت بۆ مردن هەبێت و گاڵتە بە پیربوون مەكە . فرووزە ، گشت زیندەوەرەكان گاڵتە بە پیر بوون دەكەن ، بەڵام گشتیان ترسیان لە مردن هەیە . مرۆڤ هەمیشە ترسی هەیە لە مەرگ ، بەڵام نازانێت كە سوودی هەیە .

– سوودەكەی چیە ؟

– گەر مردن نەبێت ژیانیش سوودی نامێنێت بۆ زیندەوەرەكان ، چونكە گەر مردن نەبێت ئەوا زەویش ناتوانێت بەتەنیا هەموو مرۆڤەكان لەسەر پشتی خۆی هەڵبگرێت ، نەبوونی مردن دەبێتە هۆی پاڵەپەستۆیی لە زەویدا ، ئەو كاتەش زەوی ناتوانێت ئەو پاڵەپەستۆیە لەسەر پشتی خۆی ڕابگرێت ، چونكە پێویستی بە بژێووی زۆر هەیە و زەویش ناتوانێت ئەو بژێویە زۆرە دابینبكات .

– كەواتە مردن بریتییە لە سوودێكی نەبڕاوە ، هەربۆیەشە ژیان بەشێوەیەكی كاتیە ؟

– گەر ژیان كاتی نەبووایە ئەوا دەبوو زاوزێ زۆر بەكەمی چێببێت ، هەربۆیەشە مردن هەیە تا ئەو مرۆڤانەی تریش كە لە ڕێگەن بتوانن چێژ لە خۆشی و ناخۆشیەكانی ژیان وەربگرن ، لەگەڵ ئەوەشدا گەر مردن نەبووایە ئەوا داهێنانی تازەش بوونی نەدەبوو .

بۆ ئەمەش بزانە كە ، مردن درێژترین خەوە ، ڕەوشت تیژترین شمشێرە ، ئەزموون درێژترین ڕێگەیە .

**– هۆكەی چی بوو ڕەوشت و ئەزموون هاتنە ناو بابەتەكەوە ؟**

**– لەگەڵ ئەوەی كە مردن باوكی خەوی كاتی سەر زەویە ، بەڵام پێش مردن ڕەوشت هەیە كە لەدوای مردنیش بەهۆی ناو و نازناوەوە دەمێنێتەوە ، ئەمەش هۆكارە بۆ پەروەردەكردنی مرۆڤە تازەكان ، كە زیاتر بەهۆی ئەزموونی مرۆڤەكان كاری لەسەر دەكرێت و لایەنە باشەكانی دیاریدەكرێت ، بەڵام لەگەڵ سەرهەڵدانی فكرەی باشتر لەسەر ڕەوشت پێویستە ئەو فكرەیە كۆتایی پێبێت و فكرەی تازە ئافرێنراوی باشتر هەڵبگیرێت بۆ پەروەردەكردنی مرۆڤی تازەتر . ئەوەشت لە فكر نەچێت ، مرۆڤەكان جیاوازن هەتا لە شێوەی ژیان و مردنیشیان ، وەك كای بیابان وانە و ڕۆژگار هەریەكەیان بۆ شوێنێ هەڵدەدات .**

**– مردن لە هەر شوێنێك بێت هەر مردنە ؟**

**– بەڵێ . هەر مردنە ، ئەوە ئارەزووە بێبنەماكانی مرۆڤ ئەو شوێنانەی لەیەكتر جیاكردوونەوە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مردن لە وڵاتی خۆدا پێویستترە لە وڵاتی ناخۆ ، چونكە مرۆڤ كە مرد لاشەی چەوری دەردەكات و ئەو چەوریەش دادەداتە ناو زەوی ، بەمەش مادەی خاو درووستدەبێت ، ئەوكاتە سوودی بۆ وڵاتەكەی خۆی دەبێت و لە هەندێك كەموكوڕی كانزایی ڕزگاری دەكات ، ئەو چەوریەش كە لاشەی مردوو دەریدەكات زۆر بەناو زەویدا ناڕواتە خوار ، چونكە زەوی شیرنە ، بەڵام چەوری لاشەی مرۆڤ تاڵە ، هەر بۆیە زۆر بەكەمی تێكەڵ بە یەكتری دەبن ، مردن هۆكارێكی تری هەیە كە ئەویش هەموو مرۆڤەكان دەیزانن ، ئەویش پەیووەندی بە هەڵسوكەوتەوە هەیە ، ئەویش دوو شێوەیە ، هەڵسووكەوتی ناجوان و هەڵسوكەوتی جوان ، هەرچەندێك هەڵسووكەوتت جوان بێت پێش مردن ئەوا لەدوای مردنیش جوانی هەڵسوكەوتەكەت لە فكر ناكرێت ، هەرچەندە ئەمەش دەچێتە بواری پاشملەوە ، چونكە پێش مردن پێویستە فكر لە هەڵسووكەوتی مرۆڤەكە بكرێتەوە نەك دوای مردن ، بەهەمان شێوەش هەڵسووكەوتی ناشرین كاریگەری دەبێت لە دوای مردن ، بەڵام ئەمەش پێویستە پێش مردن خاوەنەكەی ئاگادار بكرێتەوە تاوەكو پاشملە بە ناشرینی باسی نەكرێت ، ئەمەش هەر تاوەكو ماوەیەك تێدەپەڕێت و لە فكری مرۆڤەكاندا نامێنێت ، بە هەمان شێوەش هەڵسووكەوتی جوان لە دوا مردن بۆ ماوەیەكی كاتی لە هۆشی مرۆڤەكاندا دەمێنێتەوە ، بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە ، مردن بۆ كەسانێك شەرمەزاریە كە ناتوانن بەسەر ژیاندا زاڵ بن ؟**

– پێموایە ئەوە پەیووەندی بە ئاکارەکانی مرۆڤەوە هەیە ، دوور لە سامان .

– بێگومان ، زاڵبوون بەسەر ژیاندا تەنها بەدەستهێنانی سامان نیە ، بەڵکو نواندنی ئاکاری جوان و بەدەستهێنانی ڕەوشتە .

مردن بۆ هەموو مرۆڤێکە ، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە پێش مردن چ ئاکارێکت نواندووە ، ئەوەش زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ توانای کەسەکە ، گەر بێت و ئاکارەکانی دادپەروەرانەبن ، ئەوا لە کاتی مردندا بە ئاسوودەیی دەمرێت ، نەك بە غەمباری و نائارامی ، بەڵام گەر پێچەوانە بوو ئەوا لەکاتی مردندا هەست بە نا ئارامی دەکات و ناتوانێت تاوانەکانی بسڕێتەوە ، چونکە سڕینەوەی تاوانەکانیش بەپێی کات پێویستی بە کردەوەیە نەك بە گۆتە ، ئەمەش زیاتر بۆ مرۆڤ بوون دەگەڕێتەوە ، چونکە هەرکارێك کە دەکرێت زیاتر بۆ مرۆڤ بوونە نەك بۆ خود ، ئەمەش زیاتر لەلای مرۆڤە بە ئەزموونەکان دەرکی پێدەکرێت .

– بۆچی لەلای ئەوان زیاتر دەرکی پێدەکرێت ؟

– لەلای ئەوان ، خۆشترین شت ئەوەیە کە بەسەر بەرزی و بە مەردی بمریت ، نەك بە سەرشۆڕی و ترسنۆکی . مرۆڤەکان زۆرجار ڕووبەڕووی کۆمەڵێك گفتوگۆی سەیر دەبنەوە وەك باسکردنی کەسایەتی مردوو ، گەر بێت و لە ژیانیدا چۆکی بۆ نامەرد و نان خوسێنەرەکان دانەدابێت ئەوا لەلای خەڵکی بە کەسایەتیەکی سەربەرز لەقەڵەم دەدرێت ، بەڵام پێچەوانەی ئەمە بە نامەرد و ترسنۆك لە قەڵەم دەدرێت ، ئەمەش زیاتر بۆ ئەو مردووانەیە کە لەپێناو خاکدا کوژراون یان لە کارێکی پیرۆزدا یان بەهۆی ڕووداوێکی سەربەرزانە یان هەڵوێستێکی دادپەروەرانە مردوون ، لەگەڵ ئەوەشدا بۆ مرۆڤ بوون بێت نەك بۆ کەسایەتی ، چونکە مردن لە پێناو کەسایەتیدا ئەوا ناچێتە بواری سەربەرزیەوە .

– پێتوانیە کە کەسانێك هەن ، پێیانوایە مردن تەنها بەرۆکی ئەوان دەکرێت ؟

– من بە ئەو کەسانە دڵێم کە ئەم جۆرە بیرکردنەوەیان هەیە ؛ مەی گەورەترین دەرمانە بۆ هۆشی کەسانێك کە پێیان وایە مردن تەنها بەرۆکی ئەوان دەگرێت . مردن بەرۆکی هەموو کەسێك دەگرێت ، بەڵام گەر بێت و کەسانێك فکرە و هەڵوێستیان تەنیا بۆ خۆیان بوێت ئەوا پێویستە مەی بخۆنەوە تاوەکو بێنەوە هۆش خۆیان ، ئەمەش دەرمانێکە کە دڵیان ئارام دەکاتەوە ، هەروەها دەچنەوە سەر باری پێشووی خۆیان کە هەستکردنە بە تاوان لە بەرامبەر

**به مرۆڤ بوون ، لەگەڵ ئەوەشدا گەر مردنێك كە لەپێناو هەژاراندا بێت ئەوا هەرگیز لە فكر چوونی نیە لەناو مرۆڤەكاندا .**

**– مردن لە پێناو هەژارەكان ؟**

**– هەرچەندە لەوانەشە خۆیان هۆكاری ئەوە بن ، یان لەوانەش نیە ، بەڵام مردن لەپێناو كۆتاییهێنان بە برسیەتی و تینوێتی ، مردنێكە هەرگیز ناتوانرێت لە هۆشی مرۆڤەكان بچێتە دەرەوە .**

**– بە گوێرەی سەفەرە دوور و درێژەكەم بێت ، ئەمە لە هەموو شوێنێك هەیە ، بەتایبەتی هەر شوێنێك كە پێی دەڵێن خاك و نیشتمان .**

**– بێگومان هەر مرۆڤە و بە وڵاتی خۆی دەڵێت خاك و نیشتمان .**

**– كەواتە نیشتمان پێناسەیەكی گشتی پێویستە ، نەك تایبەتی .**

**– بێگومان ، خاك یان نیشتمان پێناسەیەكی گشتی بووە و هەر گشتیشە .**

**– كەواتە با ئەم گشتی و تایبەتیە لێك جیابكەینەوە .**

**– ئەم جیاكردنەوەیەش خۆم دەیكەم فرووزە ، نەك تۆ .**

**– بزانم چۆن جیاوازیەك دەكەی .**

**– خاك بریتییە لە شوێنی نیشتەجێبوونی زیندەوەرەكان ، هەروەها بریتییە لە شوێنی مانەوە و گەشەكردنی مرۆڤ و زیندەوەرانی تر ، ئەمەش بریتییە لە خاكی گشتی . بەڵام خاكی تایبەتی ، بریتییە لە پیرۆزیەك كە لە هەست و هۆشی مرۆڤەكانی ئەو شوێنەوە سەرهەڵدەدات . بریتییە لە پیرۆزیەك كە هەرگیز ناتوانرێت بە هەزاران وشە پێناسە بكرێت ، خۆشەویستی بۆ خاك خۆشەویستیەكی بێسنوورە و تەنیا لە هۆشی مرۆڤە پاكەكاندا بە تەواوەتی بوونی هەیە .**

**– بەرژەوەندی مرۆڤەكان لێرەدا بوونی هەیە ؟**

**– ئەمە خۆشەویستیەك نیە تەنیا بۆ گەیشتن بە ئامانج و مەبەستە تایبەتیەكانی مرۆڤ بێت ، بەڵكو خۆشەویستیەكە دوور لە ئامانج و سوود و بەرژەوەندی كەسەكان ، ئەم خۆشەویستیەی كە بۆ خاك یان نیشتمان هەیە ، خۆشەویستیەكی كاتی نیە ، بەڵكو خۆشەویستیەكی هەمیشەییە و كەسیش ناتوانێت نكۆڵی لێبكات ، تەنیا مرۆڤە بێئاگاكان نەبن . تەنیا مردنیش**

ناتوانێت پێناسەی ئەو خۆشەویستیە بکات ، چونکە بوونی جڤاك و بوونی زمان و هۆز و تیرە و نەتەوایەتی لەسەر بوونی خاك وەستاوە ، گەر خاك نەبێت ئەوا هیچ کام لەمانە بوونیان نیە ، هەربۆیە خۆشەویستی بۆ خاك لە هەموو خۆشەویستیەك پیرۆزترە ، مرۆڤەکان بە هۆی خاکەوە هەن ، لەبەرئەوەی مرۆڤەکان لێك دابڕاون و هەریەکە و شوێنێکی لە زەوی داگیر کردووە و پێی دەڵێت خاك و نیشتمانی خۆم . کەواتە گەر خاك نەبێت ئەوانیش مرۆڤ نین ، چونکە نەبوونی خاك واتە ژیانێکی ئاژەڵی ، ئاژەڵ لە هەر خاکێکدا بێت هەر ئاژەڵە و بەیەك شێوە سەیری دەکرێت لەگەڵ ئاژەڵەکانی تر ، بەلاّم مرۆڤ بەهۆی گۆڕینی خاکەکەی وەك مرۆڤەکانی تر سەیری ناکرێت ، ئەمەش زمان و کلتوور و ئایین جیایکردوونەتەوە ، کەواتە نەبوونی خاکی تایبەتی ئەوا مرۆڤەکان بەرەو کۆیلەیی و چەوساندنەوە دەبات .

– چۆن دەڕوانیە ئەو کەسانەی کە لەپێناو خاکدا دەمرن ؟

– مردن لە پێناو خاکدا ، خوێنەکەی ئەوەندە پیرۆزە هەرگیز وشك نابێتەوە . هەرچەندێك خوێن بڕژێت لەپێناو سەربەخۆیی خاکدا هێشتا کەمە ، چونکە خاکی تایبەت بە خۆ دەبێتە هۆی خاوەنی خۆ ، گەر خاکی تایبەت بە خۆ نەبوو ، ئەوا خاوەنی خۆش بوونی نیە و ژیانێکی ئاژەڵی چاوەڕێیەتی ، چونکە خاك بوونی زمان و نەتەوە و مێژوو و سنووری جوگرافی دەسەلمێنێت ، گەر ئەمانەش نەبوون ئەوا بوونی خاکیش ئەستەمە . کەواتە جوانمێری بۆ خواردن و نووستنی ڕۆژانەی ژیانت نیە ، بەڵکو جوانمێری مردنە لەپێناو خاکەکەت و هەژارانی ناو نیشتمانەکەت . مەرج نیە تەنیا بۆ خۆت بژی لەناو خاکەکەتدا ، بەڵکو مەرجە کەسانیتری خاکەکەت وەك تۆ تێیدا بژین و یەکسان بن لەگەڵ تۆدا .

– بە دیدی من ، هۆشی مرۆڤانێکی کەم ، ئەم بابەتەیان لەخۆ گرتووە .

– مرۆڤ هەمیشە چاوی لە تایبەتیە نەك گشتیەتی ، ئەمەش وایکردووە کە نادادپەروەری لەخاکدا چەکەرە بکات ، لەگەل ئەوەشدا ئارەزوو کردن بۆ خاکی بێگانە زۆر بێت .

– نمونەت چیە بۆ ئەمە ؟

– ئێمە سنووری خاکەکەمان تەنیا شوێنی خۆمانە ، هەر گۆڕانکاریەکیش لە زەویدا ڕوودات ئێمە هەر لە شوێنی خۆمانین جا بەشێوەی بەرد بێت یان بەشێوەی گڵ ، بەلاّم بۆ ئێوەی مرۆڤ خاك سنووری نیە لە زەویدا ، مرۆڤ هەر شوێنێك کە بیەوێت دەتوانێ بۆی بچێت و ببێتە

**کەسایەتیەك لەو خاکەدا و بەردەوام لەویٚ بژی ، دەشتوانیٚت خاکەکەی خۆی بگۆڕیٚت لە ولاٚتیٚکەوە بۆ ولاٚتیٚکی تر ، بەلاٚم لە فکرت نەچیٚت کە هەموو نیشتمانی بیٚگانە بدە بە پیٚلاٚویٚك و بیکە بەر پیٚی منداڵیٚکی نیشتمانەکەی خۆت ، سەراپای نیشتمانی بیٚگانە ناگاتە دلۆپیٚك خویٚنی کەسی خاکەکەی خۆت ئەگەر تاوانکاری گەورەش بیٚت ، چونکە هیٚشتا کاتی ئەوەی ماوە تاوەکو خۆی چاك بکات ، بەلاٚم نەفرەتی بیٚگانە لەو کەسانە بکە کە هاولاٚتی خاکەکەی خۆیان ئاوارە دەکەن .**

**– چارەسەر چیە بۆ ئەمە ؟**

**– دادگایی هاولاٚتی ولاٚتی خۆت بکە لە جڤاکەکەی خۆتدا ، بەلاٚم هەوڵمەدە بیٚزارییبکەیت تاوەکو پەنا بەریٚت بۆ ولاٚتانی تر ، چونکە ئەمە دەبیٚتە هۆی کەمکردنەوەی دانیشتوانی ولاٚتەکەت . ناپاکی بەرامبەر بە خاك و نیشتمان تەنها لەسەر خاڵیٚك نەوەستاوە ، بەڵکو هەر هەنگاونانیٚکی هەڵە لە خاکەکەی خۆتدا بریتییە لە تاوان ، وەك ئەوەی تووتیەکان ئەنجامی دەدەن .**

**– نمونەی تووتیەکان زۆر دەبیستم ، بەلاٚم نازنم تاوانی ئەوان چیە ؟**

**– تووتیە گەورەکان گەر بە یەکسانی سەیری تووتیە بچوکەکان بکەن ، ئەوا خەیاڵی زۆربەی مرۆڤەکان ئاسوودە دەبوو .**

**– مەبەستت ئەو باڵندانەیە کە مرۆڤەکان بۆ جوانی دەیانکڕن ؟**

**– نەخیٚر ، ئەمانە مرۆڤن . مرۆڤانیٚکی ناحەق بین . ئەمانە هەموو شتیٚك بۆ خۆیان و بۆ نزیکەکانی خۆیان دەبەن . لەلای ئەوان کەسی تر بوونی نیە جگە لە خۆیان و نزیکەکانی خۆیان . ئەمەش تاوانیٚکی گەورەیە ، هەرچەندە تاوانباری گەورەن لەبەرامبەر خاك و نیشتمان ، بەڵکو بوونەتە هۆی بیٚ هیوایی مرۆڤەکانی تریش .**

**– بیٚ هیوایی مرۆڤەکانی تریش ؟**

**– بەڵیٚ فرووزە ، ئەمانە وایانکردووە کە داهیٚنان بچیٚتە گۆڕەوە نەك لە گۆڕ بیٚتە دەرەوە ، چونکە بەدوای ماڵ و سامانی دنیاوەن نەك پیٚشخستنی جڤاك و هۆشیارکردنەوەی تاکەکانی ناو جڤاك ، هەربۆیە ئەمەت پیٚدەڵیٚم ؛ داوای مردن بکە لەپیٚناو خاکەکەتدا ، بەلاٚم هەرگیز داوای مردن مەکە لە پیٚناو ماڵی دنیا .**

**– لە مەبەستەکەت تیٚنەگەیشتم .**

– ئەوەی بۆ تۆ دەمێنێتەوە تەنها سەربەرزی خۆتە ، ئەویش بەهۆی سەربەرزی نیشتمانەکەتەوەیە ، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ خۆشەویستی تۆ بەرامبەر بە خاك و نیشتمانەکەت ، لەگەڵ ئەوەشدا . مەکەوە ژێر کاریگەری کەسانێك ، کە بە چاوێکی دووژمنانە لە نیشتمانەکەی خۆیان دەڕوانن ، ئەوەی گرنگە تۆی نەك ئەو کەسانەی کە بە چاوێکی دووژمنانە لە خاك و نیشتمانەکەی خۆیان دەڕوانن . کەسێك بە ، بۆ خۆت بوونی خۆت بسەلمێنە لەناو خاکەکەی خۆتدا نەك بەهۆی کەسانی ترەوە . هەرگیز سەیری کەسانێك مەکە کە ناتوانن خزمەت بە نیشتمانەکەی خۆیان بکەن ، ئەمەش بەهۆی بێتوانایی و ترسنۆکی خۆیانەوەیە نەك بەهۆی ئازایەتی و چاو نەترسی . نیشتمان پشت بەکەسی پاك دەبەستێت نەك بە کەسی ناپاك و تاوانکار . هەموو کاتێکیش بە داهاتووی وڵاتەکەی خۆت گەشبینبە ، هەموو کاتێك وابزانە کە وڵاتەکەت بەرەو پێشکەوتنی گەورە هەنگاو دەنێت ، لەتەك ئەوەشدا وابزانە کە خاکەکەت پێویستی بەتۆیە تاوەکو بیپارێزی لە شتی ناهەموار و دەستی بێگانە و کلتووری بێگانە .

– کلتووری بێگانەش هۆکارە بۆ دواکەوتنی وڵات ؟

– نەك هۆکاری دواکەوتنە ، بەڵکو بە هاتنی کلتووری بێگانە بۆ وڵاتەکەت وادەکات کە تاکەکانی جڤاك لە داهاتوودا ببنە بێگانە پەرست . بۆیە هەردەم بە داهاتووی وڵاتەکەت گەشبین بە ، نەك بە داهاتووی وڵاتانی تر . ئەوەی بە داهاتوو گەشبین نەبێت ، ئەوا ڕەشبینێکە ئەگەری خاك فرۆشتنیشی لێدەکرێت ، داهاتووی وڵات لەسەر توانای تاکەکانی ناو جڤاك وەستاوە ، کەواتە لەتەك ئەوەی کە پێویستە بەداهاتوو گەشبین بیت ئەوا پێویستیشە فکر لە داهاتوو بکەیتەوە و لە هەوڵی داهێنان و تازەگەریدابیت بۆ وڵات ، ئەمەش دەبێتە هۆی پاراستنی کلتوور و ئەدەبی نیشتمان ، هەرچی بەکارهێنراویش هەیە ئەوا پێویستە داهێنراوی ناوخۆ بێت نەك دەرەکی .

– داهێنراوەکان ناوخۆیی بن یان دەرەکی ، چ جیاوازیەکی هەیە ؟

– جیاوازیەکەی ئەوەیە ، گەر ناوخۆیی بن ، ئەوا ئەو کاتە هیچ دەستێکی دەرەکی و فکرەیەکی دەرەکی ناتوانێت زەفەر بە وڵاتەکەت بگەیەنێت .

– چی تر پێویستە ئەنجامبدرێت ؟

– هەوڵبدە هەڵەی مرۆڤەکان ڕاستبکەیتەوە لەناو جڤاکەکەت بەبێ لەکەدارکردن ، چونکە مرۆڤ وا ڕاهاتووە کە لەناو خۆیاندا یەکتر لەکەدار بکەن ، ئەمەش دواکەوتنی پێدەوترێت نەك باشکردن و پێشکەوتن . بەلاّم مرۆڤێك بکوژی باشترە لەوەی کە مرۆڤێك لەکەدار بکەی لەناو جڤاکەکەیدا ، هەتا گەر هاولاّتی ولاّتەکەی تۆش نەبێت پێویستە تۆ بەشێوەیەکی باش مامەڵەی لەگەڵدا بکەیت بەبێ گوێدانە کلتوور و ئایین و نەتەوە ، چونکە ئەمە وادەکات کە ئەو بە چاوێکی پیرۆزەوە سەیری فکرە و کلتوور و نەتەوایەتی تۆ بکات ، بەلاّم گەر لەبەر کلتوور و ئایینیش نەبێت ئەوا پێویستە لەبەر مرۆڤ بوون ئەو کارە پیرۆزە بەئەنجام بگەیەنیت ، مرۆڤ هەمیشە بەپێی ئایین و کلتوور مامەڵە لەگەڵ یەکتردا دەکەن ، بەلاّم ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە نەك چاکەیەکی گەورە بۆ کلتوور و ئایینەکەت ، چونکە چاکەکردن بۆ مرۆڤ بوون هیچ پەیووەندیەکی بە کلتوورەوە نیە ، هەرچەند ئازار بکێشی بۆ خاك و نیشتمانەکەی خۆت هێشتا کەمە ، بەلاّم ئەوەش بزانە کە بە هۆی ئاکاری ناشرین ولاّتەکەت ئازار دەدەیت . هەرگیز هەست بە ئازارەکانی خۆت مەکە لە بەرامبەر ئازاری خاك و نیشتمانەکەت ، پاراستنی خاك بەهۆی یەکگرتنی تاکەکانی ناو جڤاك دەبێت ، بەلاّم گەر یەکگرتوویی نەبێت ئەوا خاکیش هەرگیز ناتوانرێت بپارێزرێت .

– بەلاّم ئازارێکی زۆری پێویستە تا ئەم یەکگرتنەش چێدەبێت .

– گرنگ نیە ئازاری زۆر ، چونکە گەر برایەتی بوونی نەبێت ، ئەوا شتێکیش نیە بەناوی هاوڕێیەتی و نیشتمان پەروەری ، هەموو شتەکانیش بەیەکەوە جوانی دەئافرێنن و پێدەگەن ، نەك بە تەنیا و جیا جیا . یەکبوون و یەکگرتووییش واتە برایەتی ، ئەم برایەتیەش لە دەروونەوە سەرهەڵدەدات ، دڵ بۆی هاوار دەکات ، برایەتی واتە یەکگرتنی هەموو تاکەکانی ناو جڤاك ، ئەم برایەتیەش نابێت بۆ بەرژەوەندی تایبەتی بێت ، بەڵکو دەبێت بۆ بەرژەوەندی گشتی بێت .

– بۆ ئەمەش نابێت سەرمایە پەرست بین .

– بەڵێ ، شۆڕشگێڕ ئەو کەسەیە کە سەروەت و ماڵی خۆی لە پێناو جڤاکدا وەگەڕ دەخات ، نەك لە پێناو بەرژەوەندی خۆی . گرنگیدان بە خاك گرنگیدانە بە خۆ ، گرنگیدانە بە ڕەوشت و کلتوور و زمانی خۆ . ئەو کەسەی تەنیا گرنگی بە خۆی بدات ، ئەوا کەسێکە لەلایەن

نیشتمانەوە نەفرەتی لێکراوە ، کەسێك تەنیا گرنگی بەخۆی بدات ئەوا دۆستی خاك نیە ، بەڵکو مشەخۆری خاکە ، بۆیە پێویستە مرۆڤ هۆشیاری خۆی بخاتەگەڕ بۆ بەرژەوەندی نیشتمان .

– کاتێك من لە وڵاتێکدا بژیم ، ئەوا خاکی ئەو وڵاتە بۆ من و بۆ کەسێکی تری ڕێبوار هەرماڵە؟

– خاك بۆ کەسانێك ماڵە کە ئەوان وەك ماڵی خۆیان سەیری بکەن .

– پێتوانیە کە مرۆڤ دڕندەترین زیندەوەرە لەناو خاکدا ؟

– خودا مرۆڤی وەك زیندەوەرێکی هۆشیار درووستکرد ، بەڵام دڕندەترین زیندەوەر دەرچوو .

— مرۆڤ ئەم تایبەتمەندیەی هەر تێدایە ، یان خۆی دەیئافرێنێت ؟

– خۆی دەیئافرێنێت . مرۆڤ سروشتی وا ڕەخساوە کە هەمیشە بەرژەوەندی خۆی خستۆتە پێشەوەی بەرژەوەندیەکانی تر ، ئەم بوونی بەرژەوەندیەش  زیاتر بەرەو دڕندەبوونی بردووە نەك بەرەو هۆشیار بوونەوە . خستنە پێشەوەی بەرژەوەندیەکانی خۆ ، دڕندەبوون دەئافرێنێت .

– لێرەشدا ناگەینەوە بە کێشەی سەرمایە پەرستی ؟

– لەناو جڤاکی سەرمایە پەرستدا هەمیشە داوای مەرگی خۆت بکە لە خواوەند ، چونکە ناگەی بە ئازادی و دادپەروەری ، سەرمایە پەرستی تەواوی هۆشی مرۆڤەکان بەرەو خاك وێرانکردن دەبات ، نەك بەرەو باشبوون . هەر سەرمایەشە کە مرۆڤەکان لە ئەدەب و خۆشەویستی دوور دەخاتەوە ، هەتا زیاتر مەیلت بەلای سەرمایەدا بڕوات ئەوا زیاتر لە خۆشەویستی و ڕەوشت دوور دەکەویتەوە . سەرمایە پەرستەکان وەك دەرۆزەکەرەکان وانە و جگە لە سامان هیچ شتێکی تر لەلای ئەوان بوونی نیە ، سەرمایە وایکردووە کە مرۆڤەکان زۆرجار بەرەو خۆ فرۆشی بەرێت ، خۆ فرۆشیش تەنها بریتینییە لە کاری سۆزانی(لەشفرۆشی) ، بەڵکو هەموو ئاکارەکانی وەك سەرمایە پەرستی و خۆپەرستی و بێگانە پەرستی و خاك پشتگوێخستن دەگرێتەوە ، هەموو کارێکی سەرمایە پەرست ناگاتە کاری منداڵێك کە هەوڵدەدات فێری زمانی دایك ببێت لە دوای وەسەرپێکەوتن .

– زۆرجار مرۆڤەکان بەهۆی سرود یان مۆسیقا ، خاك و نەتەوە و کلتوورەکانی خۆیان بە فکر

**دێتەوە و تەواوی هۆشیان داگیر دەکات .**

**– ئەمە ڕاستە فرووزە ، مۆسیقا یەکێکە لەو دەرمانانەی کە تووڕەیی و ئارامی زۆربەی کەسەکانی بەدەستە ، دەرمانێکە پیرۆزیەکانی نیشتمان دەهێنێتەوە یادی مرۆڤەکان ، چونکە زۆربەی خۆشەویستیەکان لەلای موسیقاوە سەرچاوە دەگرن بەتایبەتی خۆشەویستی خاك . هەتا دەتوانی دوورکەوە لە خۆ پەرستی و سەرمایە پەرستی ، بەڵام هەتا بۆت دەکرێت خاك پەرست و کلتوور پەرستی خۆت و نەتەوە پەرستی خۆت بە تاوەکو دووژمن نەتوانێت لەبەرامبەرت بوەستێت .**

**– گۆتەکەت ئەوە دەگەیەنێت کە ؛ سەربازێکی ڕەوشت بەرز بە ، تا نیشتمانەکەت پڕ بە دڵ خۆشی بوێیت .**

**– سامان پەرستی لە زۆربەی خاکی وڵاتەکاندا شانازی پێوەدەکرێت ؟**

**– لەناو هەموو وڵاتێکدا ئەمە هەیە ، بەڵام لەناو خاك پەرستیدا سامان شتێك نیە تا مرۆڤ بتوانێ شانازی پێوەبکات و سەربەرزی خۆی پێ بسەلمێنێت ، بەڵکو ئەزموونی هۆش شتێکە کە هەموو کات شانازی پێوە دەکرێت ، پاراستنی خاك و نیشتمانیش پێویستی بە ئەزموونی ڕەوشتە نەك ئەزموونی سامان و سەرمایە پەرست .**

**– بۆچی هەموو کاتێك  مرۆڤەکان لاشەیان گرانە لە پێناو ڕزگارکردنی وڵات لە کەموکوڕی ، بەڵام لاشەیان سووکە بۆ ئەنجامدانی تاوان لە دژی وڵات .**

**– ئەمە بۆ جیاوازی نێوان مرۆڤەکان دەگەڕێتەوە .**

**– چ جیاوازیەکی نێوان مرۆڤەکان ؟**

**– هەندێك مرۆڤ هەن خۆیان بە مرۆڤ خودا لەقەڵەم دەدەن ، هەندێکیش لەولاوە دەچەوسێنرێنەوە .**

**– ئەو چەوساندنەوەیەش هەر لەلای ئەو مرۆڤانەوە سەرچاوەناگرێ ؟**

**– بە دڵنیاییەوە ، لەلای ئەوانەوە سەرچاوەدەگرێ ، بەڵام مرۆڤ نابێت ئەوەشی لەفکر بچێت کە خۆ بەختکردن لەپێناو خاك و وڵات خۆ بەختکردنێکە جیاوازی نیە لە نێوان سەرکردەیەك و هاوڵاتیەکی سادە ، چونکە خاك ناڕوانێتە پلە و پایەی کەسەکان ، بەڵکو دەڕوانێتە ژمارەی دەروونەکان و لاشەکان . دەڕوانێتە خۆشەویستی تۆ بەرامبەر بە خۆی ، هەروەها جیاوازی**

ناكات لەنێوان خوێنی مرۆڤەكان .

– زۆرێك لە كاتەكان گوێم لەوە دەبێت كە گوایە دایك نیشتمانە . تێڕوانینی تۆ چیە بۆ ئەمە ؟

– فرووزە ، دایك لە نیشتمان گەورەترە .

– كەواتە بیسەلمێنە ؟

– سەرەتا پێویستە پێناسەیەكی دایك بۆ تۆ بكەم .

– فەرموو پێناسەكەت .

– دایك بریتییە لە ژیان ، ژیانیش واتە گشت زیندەوەرە زیندووەكان . دایك بریتییە لە بەردەوامبوونی ژیان ، گەر دایك بوونی نەبێت ژیانیش بوونی نیە ، دایك بریتییە لە پیرۆزترین شت لەناو هەموو ئەو شتانەی كە لەناو نیشتماندا بوونیان هەیە ، چونكە نیشتمان چاوی لە دایكە تا دانیشتوانی زیاتری بداتێ ، دایك گەورەترین هۆكارە بۆ سەركەوتن و گەیشتن بە ئامانج ، گەر دایك نەبێت ئەوا نە سەركەوتن و نە پێشكەوتن و نە داهێنان بوونیان نابێت ، چونكە ژیان بەبێ دایك بوونی نیە ، بوونی دایك واتە بوونی هەموو شتێكی زیندوو لەسەر زەوی ، مرۆڤ و هەموو زیندەوەرەكانی تر بەهۆی دایكەوە دەئافرێنرێن و بەهۆی دایكەوە دەتوانن گەشە بكەن و بوردەوام بن لە ژیان ، مانەوەی هەموو شتە زیندووەكان بە مانەوەی دایك بەستراوەتەوە ، بۆیە پێویستە دایك لەسەرووی هەموو شتەكانەوە دابنرێت ، ئەمەش بە پیرۆز ڕاگرتنی پێگەی دایكە و هەم دڵسۆزیە بۆ زیندەوەرەكان بە مرۆڤیشەوە .

كەواتە دایك نیشتمانە ، گەر لێی بتوێژیتەوە ئەوا لە نیشتمانیش گەورەترە .

– كەواتە بۆ دایك ژێردەستەی باوكە ؟

– ڕەگەزی نێر بە گشتی ئەم كارە ڤێزەونەی ئافراندووە . چونكە گەر لەناو ماڵدا دەسەڵاتداری یەكەم دایك بووایە ، ئەوا نیشتمان لەلای هەموو مرۆڤێك خۆشەویست دەبوو .

– خۆشەویستی نیشتمان بۆچی گرێدەدەیت بە دەسەڵاتی دایك ؟

– دایك بۆ نیشتمان بە پەرۆشترە لە باوك . هەرچەندە مرۆڤ هەمیشە دایك وەك پێویستیەك بۆ خۆی بەكاردەهێنێت ، بەڵام ئەوەش گەورەترین هەڵەی مرۆڤە ، چونكە پێویستە مرۆڤەكان خۆیان خۆیان بەكاربهێنن بۆ دایك و گرنگی بدەن بە ژیان و پێگە تایبەتیەكانی دایك ، ئەو تایبەتمەندیانەی كە لە دایكدا بوونیان هەیە ئەوا لە باوكدا بوونیان نیە .

**– نمونەیەك لەسەر دایك بهێنەوە ، بزانم چۆن ئەو گرنگیە دەسەلمێنیت .**

**– باوك دەتوانێت خۆشەویستی كۆرپەلە لە هۆشی خۆی دەربكات ، بەڵام هەرگیز دایك ناتوانێت ئەو خۆشەویستیە لە دڵی خۆی دەربكات ، كەواتە دایك پیرۆزترە لە باوك ، ئەو خۆشەویستی و سۆز و میهرەبانیەی كە لە دایكدا بوونی هەیە ئەوا وەك پێویست لە باوكدا بوونی نیە .**

**– میهرەبانیەكەی ئەو لەچیدایە ؟**

**– میهرەبانی دایك لەوەدایە كە هەمیشە ژیانی خۆی دەخاتە مەترسیەوە لە پێناو كۆرپەكەیدا ، بەڵام هەرگیز ئەو هەڵوێستە لەلای باوك بوونی نیە ، ئەمەش پەیووەندی بە دڵەوە هەیە نەك بە جەستەی بزوێنراو . باوك مەرگی كۆرپەلە لەبیر دەكات پاش ماوەیەكی كەم ، بەڵام دایك ناتوانێت بۆ ماوەیەكی درێژیش لەبیری بكات ، لێرەشدا دەگەینە ئەوەی كە دایك مرۆڤێكی ڕاستەقینەترە لە باوك ، ئەو خۆشەویستیەشی كە لەلای باوك هەیە بەهۆی دایكەوەیە نەك بەهۆی خۆیەوە .**

**نێرینە خۆشەویستیەكی كەمی لە دڵدایە بەرامبەر بە مێینە ، ئەو خۆشەویستیەشی كە دەریدەبڕێت لە دڵەوە نیە ، بەڵكو لە هۆشی خۆیدا بۆ ماوەیەكی كاتی بە زمان دەریدەبڕێت تاوەكو بەهۆی ئەو خۆشەویستیەوە بگات بە ئارزووەكانی خۆی ، ئەو ئارەزووانەش یان بۆ بەیەكگەیشتنە یان بۆ چەند مەبەستێكی ترن . بۆیە هەموو كاتێ گوێ بۆ وتەكانی دایك بگرە ، چونكە ئەزموونەكانی كۆتاییان نایە . هەموو كاتێك دایك هەوڵدەدات منداڵەكانی یان كۆرپەلەكانی بەرەو ڕێگەی ڕاست پەروەردە بكات ، بگرە لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی كاتەكانی خۆی بۆ ئەم پەروەردەكردنە تەرخان دەكات ، بەڵام باوك دەورێكی زۆر كەم دەگێڕێت لە پەروەردەكردنی منداڵەكانیدا .**

**وەك چۆن گەشەكردن و سەوزایی باخ بە هێزی باخەوانەوە بەستراوەتەوە ، گەشەكردن و مانەوەی كۆمەڵگەش بە ئازادی مێینەوە بەستراوەتەوە ، بەڵام لە هەندێك كاتدا وا دەردەكەوێت كە دایك تاوانبارە ، ئەمەش بەهۆی نەمانی باوكە ئەو تاوانە دەكات ، تاوانەكەشی بریتییە لە وازهێنان لە منداڵەكەی لەپێناو هاوژیانیەكی تردا ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا كە تاوانی كردووە بەرامبەر بە منداڵەكەی بەڵام هێشتا هۆشی هەر لەلایەتی ، بەڵام كاتێك باوك ئەو تاوانە**

**دەکات ئەوا منداڵەکەی لەبیر نامێنێت .**

**– ئەمە لەوانەیە پەیووەندی بە ئازاریشەوە هەبێ .**

**– چۆن پەیووەندی پێوەنیە فرووزە ، پەیووەندی پێوە هەیە . کاتێك دایك منداڵی دەبێت ئەوا ئازارێکی زۆر دەچێژێت ، بەڵام باوك هیچ پەیووەندیەکی بەو ئازارەوە نیە و لەو کاتەدا فکرەی لەلای ئەوەیە کە منداڵەکە نێرە یان مێیە ، چاوی شینە یان ڕەشە ، بەڵام بەداخەوە چاوی منداڵەکە ڤاوەییە و مێیە ، ئەمەش تاکە ئازارێکە کە لەو کاتەدا تووشی باوك دەبێت ، لە هەمان کاتیشدا فکر لە ئازاری هاوسەرەکەی ناکاتەوە .**

**– کەواتە دایك بریتیشە لە باوك ، بەڵام باوك جێگەی هیچ کام لەم پێناسانەی نابێتەوە .**

**– ڕاستە فرووزە . دایك باوکیشە ، گەر دایك نەبوو باوکیش نیە ، منداڵ بەبێ دایك مەرگی خۆی دەبینێت نەك بە بێ باوکی ، زۆر جاریش هەڵە دەکرێ لەناو جڤاکدا کە گوایا منداڵ باوکی نەمێنێت ئەوا هەتیووە ، بەڵام منداڵ هەرگیز بە مردنی باوك هەتیوو نابێت ، چونکە گەر دایك نەمێنێت ئەوا منداڵیش لەلای باوك بوونی نامێنێت و کۆتایی بە ژیانی خۆش و ناخۆشی پێشووی دێت .**

**ئەو ژیانەی کە بۆ مرۆڤ ڕەخساوە لە زەویدا ئەوا بە هاوکاری دایکەوە ڕەخساوە نەك باوك ، دایك هۆکاری یەکەمە بۆ منداڵ و باوکیش هۆکاری دووەمە . دایك سەرچاوەی یەکەمی نیشتمانە ، باوك لێرەشدا سەرچاوەی دووەمە ، چونکە هەموو شتەکان سەرەتا لەلایەن دایکەوە سەرچاوەدەگرن و دواتر لەلای باوك و دواتریش لەناو جڤاك .**

**– پێموایە لێرەدا گەرەکە هێز و توانای خوداش باسبکەین .**

**– گەرەکە .**

**– لەبەرئەوەی پیرۆزیەکانی دایك گەرەکە باسبکرێن ، ئەوا خوداش لێرەدا گەرەکە باسبکرێت .**

**– بەڵێ ، لەسەرووی هەمووشیانەوەیە . بەڵام گەرەکە لە ڕوانگەی مرۆڤەوە پێناسەیەکی بۆ بکەین .**

**– تەنها لە ڕوانگەی مرۆڤەوە ؟**

**– لەبەرئەوەی هێزی خودا لە هەموو شتێکدا خۆی دەبینێتەوە . بۆ ئەمەش گرانە باس لە هەموو شتەکان بکرێت .**

**– کەواتە هێزی خودا لە ڕوانگەی مرۆڤەوە باس دەکەین .**

**– خودا هێزێکە لە هۆشی مرۆڤەکانەوە بڕیاری بوونی لەسەر دەدرێت و ترس و خۆشەویستی دەدرێتە پاڵ . هێزێکی ئافرێنەرە و فکرەکەی لەسەرووی هەموو شتەکانەوەیە .**

**مرۆڤەکان هەمیشە لێکدانەوەی جیاوازیان بۆ خودا هەیە ، هەندێك لە مرۆڤەکان دەڕواننە شتەکانی دەوروپشتیان و دەڵێن خودا ئافراندوونی و خۆشەویستی خۆیانیان بۆ دەردەبڕن ، هەندێکیش دەڵێن ئەو شتانە بە سروشتی خۆیان ڕەخساون و هیچ دەستکردێکیان نیە ، هەندێکیش بیرۆکەی کەسەکانی تر وەردەگرن و دەیکەنە بڕیاری خۆیان ، هەندێکیش خودا دەکەنە بەردێك و کڕنووشی بۆ دەبەن ، هەندێکیش ئاسمان دەکەنە جێگەی خودا و دەستەکانیان بۆ ئاسمان بەرز دەکەنەوە بۆ پاڕانەوە ، بەڵام نازانن کە خودا نە بەردە و نە شتەکانی دەوروپشتمانە و نە ئاسمانە ، چونکە مرۆڤ لەسەر زەوی دەژیت ، زەویش خۆی وەك هەسارەکانی تر لە ئاسمانە و بەردەوام لە پیسبوون و تێکچوون دایە و مرۆڤ هەستی پێناکات .**

**– کەواتە خودا چیە ؟**

**– خودا بیرۆکەیە ، ئەو بیرۆکەیەش تەنیا لەناو هۆشی مرۆڤەکان درووستدەبێت ، لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵێك تایبەتمەندی بۆ بڕیار دەدرێت وەك : ژیان پێدەر ، ترسێنەر ، میهرەبانی ، زانا ، ئافرێنەر ، سووتێنەر ، خۆشی هێنەر ، ناخۆشی هێنەر ، سەرلێشێوێنەر ، گومڕاکەر ، ڕۆزی پێدەر ، ڕۆزی گرەوە ، پێدانی دەوڵەمەندی ، پێدانی هەژاری ، مرێنەر ، گیان کێش ، زیندووکەرەوە ، بەڵام باشترین شت ئەوەیە کە لەپێناو خۆشەویستی ڕووبکرێتە خودا و بەشێوەیەکی خۆشەویستیانە سەیری بکرێت .**

**–ئەو خۆشەویستیەی تۆ باسی لێوەدەکەی ، وەك چۆن ؟**

**– وەك چۆن دوو کەس ئەڤینداری یەکترن و دڵیان ئازار دەچێژێت بۆ یەکتر ، دەبێت ئەو خۆشەویستیەش بەم شێوەیە بێت لەنێوان مرۆڤ و خودادا ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو خۆشەویستیە زۆر بە توووندی نەگیرێت ، چونکە ئەگەری ئەوە هەیە ئەو خۆشەویستیە بەهۆی توند وەرگرتنەوە کۆتایی پێبێت .**

**– هۆکاری ئەم ترسەی خودا چیە بۆ مرۆڤەکان ؟**

**– مرۆڤ تەنها بەهۆی ترسەوە ڕوودەکاتە خوا ، گەر بۆ خۆشەویستی بوایە ، ئەوا کەسێکت**

نەدەبینی لە خودا بپارێتەوە ، ئەگەر ترس نەبوایە ئەوا بنچینەی خۆشەویستی بە ئاشکرا دەردەکەوت ، گەر خۆشەویستیش نەبووایە ئەوا ترس سەراپای دەروونی مرۆڤی دادەپۆشی .

– کەواتە ترس باشە .

– بەڵێ ، ترس شتێکی باشە .

– باشی ترس لە کوێدایە ؟

– بۆ نەکردنی هەندێك ئاکاری ناشرین بەرامبەر بە مرۆڤ و دەوروبەری مرۆڤ ، بەلاّم ئەو ترسە پێویستە زۆر بەکەمی بوونی هەبێت لەناو مرۆڤەکاندا ، چونکە ترسی زۆر هۆکارە بۆ نەکردنی هەندێك شت کە لەوانەیە سوودی بۆ مرۆڤ و دەوروبەری خۆی هەبێت ، بۆنمونە زۆربەی مرۆڤەکان بازرگانی بە ناوی خوداوە دەکەن ، لە هەمان کاتدا ناشتوانن بە دڵ چاکەیەك لەپێناو خودا ئەنجام بدەن ، مرۆڤ بەردەوام فکری لەو ڕۆژەیە کە لەپای کارەکانی پاداش وەربگرێت لەلای خودا ، بۆ ئەمەش زیاتر فکری لەلای پاداشتەکانیەتی نەك تا چەند خۆشەویستی خودای بەدەستهێناوە ، هەر کارێکیش کە دەکات دەڵێت لەپێناو خودادا ، بەلاّم فکر لەوە ناکاتەوە کە ئایا ئەو بڕیارەی کە لەپێناو خودادا داویەتی درووستە یان نادرووستە ، سوود بە مرۆڤ دەگەیەنێت یان نا . لەو کاتەشدا هەر فکری لەوەیە کە لەپای ئەو بڕیارەی پاداشت وەربگرێت ، لەوانەیە ئەو بڕیارەی کە ئەو داویەتی زەرەر بە مرۆڤەکانی تر بگەیەنێت ، هەندێك لە مرۆڤەکان هەوڵی ئەوە دەدەن کە بەناوی خودا هاولاّتیان فریو بدەن ، بەبێ ئەوەی هیچ شارەزاییەکیان لە یاساکانی خودادا هەبێت ، بەلاّم خودا داواکاری کەسانێك وەرناگرێت کە بەناوی وشەکانیەوە خۆیان کردووە بە ئەژدیهای سەر زەوی . وشەی خودا لەلای هەموو مرۆڤێك ئاشنایە ، بەلاّم یاساکانی خودا لەلای هەموو مرۆڤێك ئاشنا نیە ، ئەوانەی کە بەو یاسایانە ئاشنان ئەوا تەنیا بەرژەوەندی جڤاك لەبەرچاو دەگرن ، بەلاّم ئەوانەی کە بەو یاسایانە ئاشنانین بەرژەوەندی تایبەتی خود لەبەرچاو دەگرن ، چونکە ئەوانە تەنیا لەلای خۆیان زانان ، بەلاّم شاگردی زاناش نین ، خودا لە هەر سەردەمێکدا بێت هەر خودایە ، کۆتایی پێنایەت و نامرێت ، هەرکاتێك مرۆڤ هۆشی نەما ئەوا تەنیا لەهۆشی ئەودا نامێنێت ، چونکە خۆی کۆتایی پێهاتووە لە هۆشەوە ، خودا شتێك نیە تەنیا چاوی لە تۆ بێت ، بەڵکو بەپێی هۆشی مرۆڤەکان چاوی لەهەموو کەسێکە تەنیا مێرووولەیەکیش ، گەر وا نەبووایە ئەوا مرۆڤ

دەبوو چەندین خودا لە هۆشی خۆیدا درووستبکات ، وەك لە هەندێك شوێن كە تائێستاش چەندین خودای تێدا دەپەرسترێت و هیچیشیان باوەڕیان بە خودای ئەویتر نیە .

فرووزە چاكە لەگەڵ خەڵكیدا بكە ، بەڵام لە چاكەكردنی خەڵك خۆ بپارێزە .

– ئەمە یانی چی ؟

– ئەو چاكەیەی كە تۆ دەیكەیت با لەپێناو ئارامبوونەوەی دڵی خۆتدا بێت نەك ئارامكردن و دڵخۆشكردنی چەند كەسانێكی نا مرۆڤ ، چونكە تۆ ئەو كەسەی كە چاكەكە دەكەیت نەك ئەو كەسانەی كە دێنە بەر دەمت ، چاكەكردنیش بە كردەوەیە نەك بە ڕەنگی ڕدێن و تەمەن .

چاكە كردەوەی پێویستە نەك قسەكردن .

– بۆچی لە چاكەكردنی خەڵك بترسم ؟

– لە چاكەكردنی خەڵك بترسە ، لەوانەیە لەبەرامبەر شتێكدا ئەو چاكەیەت لەگەڵدا بكەن ، یان بەهۆی شتێكەوە ، ئەو مرۆڤانە زۆر كەمن كە چاكە بەبێ بەرامبەر دەكەن . چونكە مرۆڤەكان لە خەیاڵی ئەوەدان كە خودا هەموو شتێكیان بەسەر بكاتەوە ، بەڵام خۆیان هەوڵی ئەوە نادەن كار ئاسانی بۆ خۆیان بكەن ، شتەكانیش بەهۆی كردەوەی مرۆڤەكانەوە پەیدادەبن نەك بە خەیاڵ و بۆچوون و قسەكردن ، زۆرێك لە مرۆڤەكان پێیان وایە گەر دابنیشن لەناو هەوارگەكانیان و داوا بكەن و بپاڕێنەوە ، ئەوا داواكاریەكانیان وەردەگیرێت و ئارەزووەكانیان و داواكاریەكانیان جێبەجێ دەكرێت ، بەڵام هەرگیز جێبەجێكردنی ئەو ئارەزووانەی كە هەیانە بە خەیاڵیش نایانبینن كە بێنەدی ، هەرچەندە خۆی خەیاڵیشە ، چونكە ئەو خەیاڵانە كردەوەیان لەگەڵدا نیە .

فرووزە . مرۆڤ ئەوەندە هیچە لەبەرچاوی ئافرێنەرەكەی بازرگانی بە ئافرێنەرەكەیەوە دەكات . پێویستە مرۆڤ هەمیشە وەك مرۆڤ خۆی نیشانبدات ، نەك وەك زیندەوەرە بێ هۆشەكان ، نكۆڵی لە شتێكیش نەكات كە ناتوانێت پاساوی بۆ بهێنێتەوە ، مرۆڤ گەر هۆشی خۆی بخاتە كار و بهزرێت ئەوا دەتوانێت زۆرترین زانین بزانێت و شیكردنەوەیان بۆ بكات .

– بوونی وشەی خودا شتێكی زەروورییە .

– بڕیاردان بۆ درووستكردنی خودایەك شتێكی زەروورییە ، بەڵام بڕیاردان بۆ خۆشەویستیەكەی لەویش زەروورترە . كاتێك مرۆڤ بڕیار لەسەر شتێك دەدات و بوونی ئەو شتە دەسەلمێنێت ،

**ئەوا پێویستە خۆشەویستی خۆشی بۆ ئەو شتە بسەلمێنێت ، چونکە بوونی شتەکان بە خۆشەویستیەوە بەستراوەتەوە نەك بەهۆی رك و کینەی نێوان مرۆڤەکان ، هەروەها هەموو شتەکان پێویستیان بە خۆشەویستی هەیە .**

**– مەبەستی گۆتەکانت ئەوەیە کە مرۆڤ ترسی لە خودا هەیە ، بەلاَم خۆشەویستی بۆ خودا نیە ، چونکە پێشڕەوانی بەرنامەکانی خودا ئەژدیهایەکی گەورەیان لە دەروونی مرۆڤەکاندا درووستکردووە .**

**– لەوانەیە ، مەبەستم ئەوە بێت . خودا هێزێکە بەردەوام لە هۆشی مرۆڤەکاندا بوونی هەیە ، ئەم بوونەش لە هۆشێکەوە بۆ هۆشێکی تر دەگۆڕێت ، چونکە هەر مرۆڤە و بە هۆشی خۆی لێکدانەوە بۆ هێزی خودا دەکات ، ئەم هێزەش لەلای مرۆڤەکان تەواوی شتەکانی جیهانی هەستپێکراو و جیهانی هەستپێنەکراوی بەدەستە ، هەروەها هەموو زانین و زانیاریەکانی بە دەستە ، بەلاَم خودا هۆشی بە مرۆڤ داوە بەلاَم زانینی پێنەداوە ، بەلکو مرۆڤ خۆی لە ئەنجامی نەشونمای خۆی و تێکەلاَوبوونی لەگەلْ کەسانیتردا ئەو زانین و زانیاریانەی وەرگرتووە ، ئەمەش لە ژیانی مرۆڤدا بەڕوونی دیارە ، لێرەشدا ئەوە ڕووندەبێتەوە کە مرۆڤ خودی خۆی خاوەنی زانیاریەکانی خۆیەتی نەك خودێکی تر ، گەر وابووایە ئەوا هەموو مرۆڤەکان دەبوو سەرەتا تەواوی زانیاریەکانیان زانیبایە و پێویستیان بە گەڕان و تێکەلاَوبوون نەدەبوو بۆ پەیداکردنی زانیاریەکان .**

**مرۆڤ بە هۆشی خۆی باوەڕ بەو هێزە دەکات کە خودایە ، ئەو هێزەش لە ئەنجامی ڕامان و هزرینی هۆشی مرۆڤەوە درووستدەبێت ، ڕاستە سەرەتا لەلایەن دایك و باوکەوە ئەو هێزە بە منداڵ دەناسێنرێت ، بەلاَم تەواوی زانیاریەکان دەربارەی ئەو هێزە بە منداڵ ناوترێت ، تەنیا بوون و نەبوونی هێزەکەی بە منداڵ دەناسێنرێت ، منداڵیش سەرەتا ئەو ناوە وەردەگرێت لەهۆشی خۆیدا و دواتر ئەوە منداڵەکە خۆیەتی کە بەرە بەرە بەو هێزە ئاشنا دەبێت و شتەکانی جیهان دەهێنێتە بەرچاوی خۆی ، دواتر بڕیار لەسەر بوون و نەبوونی ئەو هێزە دەدات ، لەتەك باوەڕەکەی بۆ ئەو هێزە خۆشەویستیشی بۆ بڕیار دەدات و خۆی پابەند دەکات بەو هێزەوە ، ئەمەش زانیاریەکە کە لەلایەن مرۆڤەوە پەیداکراوە نەك زانیاریەك بێت کە بە مرۆڤ درابێت و هەر لەسەرەتاوە بە مرۆڤ بەخشرابێت .**

گەر هێزێك هەبێت و بەو هێزەش بووترێت خودا ، هەروەها مرۆڤیش باوەڕی تەواوی بەو هێزە هەبێت ، ئەوا پێویستە لەتەك باوەڕەكەیدا خۆشەویستی تەواویشی بۆ هەبێت ، گەر خۆشەویستی بۆ نەبێت ئەوا باوەڕیشی پێنیە ، چونكە باوەڕ بە خۆشەویستیەوە دەسەلمێنرێت .كەواتە فرووزە ، خودا مرۆڤ نیە ، هەروەها هەوریش نیە ، هەروەها سەرما و گەرماش نیە تا لاشە هەستی پێبكات ، بەڵكو هێزێكە تەنیا بە هۆش دەتوانرێت  بناسرێت .

فرووزە ، خودا هاوڕێی ئەو كەسانەیە كە دەروونیان بەبێ دەربڕین پاكە ، نەك ئەوانەی تەنها لە كاتی قسەكردندا و دەروونیان پاكە .

– باشە ، ئەی هاوڕێیەتی نێوان مرۆڤەكان چی ؟

– فرووزە ، هاوڕێیەتی نێوان مرۆڤەكان شتێكە و هاوڕێیەتی نێوان مرۆڤ و خودا شتێكی ترە .

– من تەنیا هاوڕێیەتی نێوان مرۆڤەكانم گەرەكە باسی بكەی .

– هاوڕێیەتی لەنێوان مرۆڤەكاندا ؟

– بەڵێ .

– هاوڕێیەتی نێوان مرۆڤەكان ، بریتییە لە بەرژەوەندیەكی بە ئەدەبی نێوان مرۆڤەكان ، واتە برایەتیەكی كاتی لەنێوان مرۆڤەكان بۆ بەرژەوەندی ، ئەمەش زۆر بە زوویی كۆتایی پێدێت ، چونكە بەرژەوەندی تێیدا دەورێكی بالاّ دەبینێت نەك خۆشەویستی ، برایەتی بوونی هەیە بەلاّم هاوڕێیەتی بوونی نیە ، چونكە برا بۆ داهاتووی برا بە پەرۆشە ، بەلاّم هاوڕێ بۆ داهاتووی هاوڕێ بە پەرۆش نیە . لە نێوان هاوڕێیەتیدا گەر یەكێك شتێك بڵێت و لە بەرژەوەندی و ئەویتردا نەبێت ئەوا هاوڕێیەتیەكە لەو كاتەدا كۆتایی پێدێت ، هەرچەندە بە قسەكردن دەیانەوێت خۆشەویستی خۆیان بۆ یەكتر دەربڕن ، بەلاّم ئەو دەربڕینانە لە دڵەوە نین ، بەڵكو لە هەواوەن و وەك بایەكی تۆزاوی وانە ، هەمیشە مرۆڤ درۆیەكانی زیاترن لە ڕاستیەكان ، ئەمەش تاوانی نێوان هاوڕێیەتی نیە ، بەڵكو بێ پەروەردەیی وایكردووە كە ئەو درۆیانە بە شێوەیەكی ڕاستی دەربڕێت ، لەو كاتانەی كە دوو هاوڕێ بەیەكەوەن ، زۆرترین قسە لەگەڵ یەكتر دەكەن ، بەلاّم ئەو قسانە یان باسكردنی كەسێكیترن یان گاڵتەپێكردنن بە شتێك یان كەسێك ، هەروەها یان باس لە شتێك دەكەن كە بەبێ ئەوەی زانیاریان لەسەری هەبێت ، هەموو ئەوانەش تاوانن ، چونكە هاوڕێ وادەكات كە تۆ مەیلت بۆ ئەو شتانە بچێت

که خۆی لەخۆیدا ئەو شتانە تاوانن ، هەربۆیە زۆر بەکەمی هاوڕێی باش پەیدا دەبێت ، باشترین شت ئەوەیە کە تۆ خۆت لە زۆریك لە هاوڕێ بپارێزی ، لەوەش باشتر ئەوەیە کە تۆ پێش ئەوەی لەگەڵ کەسێکدا پەیمانی هاوڕێیەتی ببەستی تاقیبکەیتەوە لە زۆربەی شتەکان ، چونکە ئەوکاتە هەڵوێستی ئەوت بۆ دەردەکەوێت بەرامبەر بە خۆت .

– چ تاقیکردنەوەیەك ؟

– بۆنمونە . گەر لە ڕێگا پیاسەتکرد لەگەڵ هاوڕێکەتدا و لەو کاتەدا دڕکێك چوو بە قاچتدا ، بێگومان لەو کاتەدا تۆ هەوڵدەدەیت دڕکەکە لە قاچت دەربهێنی ، لەو کاتەشدا تۆ هەستیاربە ، گەر لەسەرت وەستا تا دڕکەکە دەردەهێنی ئەوا هاوڕێیەکی باشە و لە زۆر ناخۆشی دیکەدا لەگەڵتدا هاوڕێیە و پارێزگاریت لێدەکات ، بەڵام گەر لەسەرت نەوەستا و هەر لە سەر ڕۆیشتنەکەی خۆی بەردەوام بوو ئەوا بزانە دووژمنتە نەك هاوڕێی تەنگانە و ناخۆشی ، چونکە گەر بۆ دڕکێك لەسەرت نەوەستا ئەوا دڵنیابە لەوەی کە لەکاتی ناخۆشی گەورەدا پێتپێدەکەنێ و هەوڵی ئەوەش دەدات بتفرۆشێ بۆ بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی خۆی . یەکەمین یاسای هاوڕێیەتی بریتیە لە پارێزگاریکردن لەیەکتر ، هەرچەندە هاوڕێیەتی کاتیە و زوو بوونی نامێنێت ، ئەم نەمانەش بەهۆی سەفەرکردنەوە دەبێت یان بەهۆی پێکهێنانی هاوژیانیەوە یان بەهۆی چەند قسەیەك دەبێت کە ئەویتر ئەو قسەیەی بەدڵنیە یان هەر هۆکارێکی تر لە هۆکارەکان ، چونکە لەو کاتانەدا هەوڵی ئەوە دەدات کە تۆ لەفکر خۆی بەرێتەوە ، یان ئەو خۆی لە تۆ بە گەورەتر دەزانێ ، هەموو ئەمانەش ناچنە بواری هاوڕێیەتی باشەوە ، بەڵکو ئەوە خراپی هاوڕێیەتی پێدەگووترێت . با تۆ بگەیتە ئاستێکی بەرزتر لە ئەو یان با تۆ زووتر هاوژیانی پێکبهێنی ، بەڵام هەموو ئەوانە ناچنە بواری باشتر بوون و ئازاتر بوونی تۆ ، چونکە لەوانەیە ئەو هەلی ئەوەی بۆ نەڕەخسابێت ، یان خۆی ئارەزووی لێنەبێت .

– کەواتە  گەر هاوڕێی باشت هەبێ ئەوا داهێنانی باشیشت دەبێ .

– هاوڕێی باش واتە داهێنان و فکرەی باش ، چونکە گەر هاوڕێیەکەت باش بێت ئەوا خۆشی بێ توانا بێت هەوڵدەدات تۆ هانبدات بۆ دەرخستنی تواناکانت ، ئەمەش نیشانەی دڵسۆزی و وەفاداری ئەوە بۆ تۆ ، بەڵام ئەم جۆرە هاوڕێیانە زۆر بە دەگمەن پەیدادەبن ، چونکە هەموو کاتێ هاوڕێکان بە لاشە لەگەڵ یەکتردان نەك بە دڵ ، ئەو هاوڕێیانەی کە بە دڵ لەگەڵ

**یەکتردان زۆر بەکەمی هەن لەناو مرۆڤەکاندا .**

**گەر هاوڕێیەتی وەك برایەتی بێت ئەوا تۆ دەتوانی کەمێك لە نهێنیەکانی خۆتی بۆ دەربخەی ، بەڵام هەموو نهێنیەکی تۆ نابێ زانراو بن لەلای ئەو ، پێش ئەوەی بزانی کە هاوڕێکەت چۆنە ئەوا هەوڵی ئەوە مەدە زۆرترین نهێنی خۆتی بۆ دەربخەی ، بەڵام گەر هات و دڵسۆزترین و کۆنترین هاوڕێش دەرچوو ، ئەوا هێشتا کەمێك لەنهێنیەکانی خۆتی هەر بۆ مەدرکێنە ، چونکە هێشتا ئەگەری ئەوە هەیە تاوانت بەرامبەر بکات . زۆربەی هاوڕێکان هەوڵی ئەوە دەدەن کە دەرفەتێکیان بۆ بڕەخسێ تۆ بۆ بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی خۆیان بەکاربهێنن ، بەڵام دەرفەتی ئەوەیان بۆ نەڕەخساوە ، هەربۆیە ئەو جۆرە کەسانە تا ماوەیەکی زۆر لەگەڵتدا دەمێننەوە بەناوی هاوڕێیەتیەوە ، لەوانەشە وانەبێت و تۆ بە کەسێکی باش بزانن و هاوڕێیەتی تۆیان پێ خۆشبێت ، بەڵام گەرەکە تۆ لە هەموو کاتێکدا هەستیار بیت ، چونکە هاوڕێیەتی گریمانەیە لە هەموو کاتێکدا .**

**گەر تەیرەکان زانیان هەبووایە ، ئەوا بێشك ئەوانیش هاواریاندەکرد . ئاخۆ چ هاوارکردنێك ؟ هاوارکردنێك کە هۆشی مرۆڤەکانی دەلەقاند .**

**– بۆچی تەیرەکان زمانیان نیە ؟ ئا ئەوەتا هەموو سپێدەیەکی زوو گوێم لە جریوە جریویانە .**

**– ئەم زمانە نا .**

**– چ زمانێك ؟ و چ تەیرێك ؟**

**– ئەو مرۆڤانەی کە دەڵێن زمانمان دندوکی تەیرەکانە و زۆربەی ئاوازەکان دەزانێت .**

**– ئەو مرۆڤانە کێن ؟**

**– ئەو مرۆڤانەن کە زمانیان هەیە ، بەڵام زانینیان نیە . دەنگیان هەیە و کردەوەیان نیە .**

**– ئیدی بەسە ، با منیش لەو ناوەدا تێبگەم . کە زمان چیە و کردەوەی زمان چیە .**

**– زمان گرنگی خۆی هەیە ، مرۆڤیش گرنگیەکەی دەسەلمێنێت .**

**– کەواتە زمان چیە ؟**

**– زمان ئامرازێکی دەنگیە ، لەلایەن هۆشەوە دەبزوێنرێت . ئامرازێکی گەیەنەرە بە هاوکاری ژێیەکان کە بەیەکەوە دەنگ درووستدەکەن ، ئەم دەنگەش بۆ تێگەیشتن و گەیاندن و پەیووەندی دەردەبڕدرێت ، ئەویش بەشێوەی وشە ، ئەو وشەیەش لەچەند پیت پێکدێت . ئەو**

**وشەیەش یان مانا دارە یان بێ مانایە .**

**– بەڵام هەموو زیندەوەرێك زمانی هەیە .**

**– فرووزە ، هەموو زیندەوەرێك زمانی هەیە . بەڵام هەموو زمانێك ئاخافتنی باشی نیە . هەموو زمانێك زانینی لە پشتەوە نیە .**

**– زمانی مرۆڤەکان ، زانینی لە پشتەوەیە ؟**

**– نەخێر . هەمووی نا .**

**– دەنگی مرۆڤەکان و زیندەوەرەکانی تر چ جیاوازیەکی هەیە ؟**

**– جیاوازی دەربڕین و زانین لە نێوانیاندا هەیە . ناساندنی مرۆڤەکان و جیاکردنەوەیان لە یەکتر بە هاوکاری ئەم دەنگەوە دەبێت .**

**– بەڵام زیندەوەرەکانی تریش بە هۆی دەنگ یەکتر دەناسنەوە .**

**– بەڵێ ، بەڵام هی مرۆڤ جیاوازە .**

**– چ جیاوازیەك ؟**

**– زمانی مرۆڤ زانین و مەبەستی لە پشتەوەیە . بەبێ هۆ دەرینابڕێت . بەڵام هی زیندەوەرانی تر تەنها بۆ ناسینەوەی یەکترە .**

**– گەر زمان ئامرازی هۆش بێت . کەواتە هەموو شتەکان لەخۆ دەگرێت .**

**– بێگومان . هەموو شتەکان بە بوونی زمانەوە بەستراونەتەوە . بگرە چالاکیەکانی مرۆڤیش .**

**– مرۆڤ گەرەکە چۆن زمانی خۆی چۆن بەکاربهێنێ ؟**

**– زمان بە فەرمانی هۆش بەکاربهێنێ .**

**– لە دوای فەرمانەکانی هۆش چی ؟**

**– گەرەکە مرۆڤ خۆشەویستی تایبەتی بۆ زمان هەبێت ، زۆربەی زانینەکانی مرۆڤ بە هۆی زمانەوەیە ، چونکە هۆشی مرۆڤ بەبێ زمان هیچ چالاکیەکی نیە .**

**– مرۆڤ تاکە زیندەوەرە دەربڕینی زمانی هەیە ؟**

**– مرۆڤ تاکە زیندەوەرە هونەری دەربڕینی هەیە بە زمان ، زیندەوەرەکانی تر ئەو هونەری دەربڕینە زمانیەیان نیە . کەواتە زمان ئامرازێکە لەلایەن هۆشەوە دەبزوێنرێت بۆ گەیشتن بە شتە نەزانراوەکان . زۆربەی بنەما تایبەتیەکانی مرۆڤ بە زمانەوە بەستراوەتەوە . گەر مرۆڤ**

دەربڕینی زمانی نەبووایە ئەوا مرۆڤیش زیندەوەرێك دەبوو هاوشێوەی زیندەوەرەکانی تر لە ڕووی پێشکەوتن و داهێنانەوە ، چونکە ئەو کاتە بە هەمان شێوەی زیندەوەرەکانی تر تەنیا زمانی بۆ تامکردن بەکاردەهێنا ، یەکێك لەو تایبەتمەندیانەی کە مرۆڤ لە زیندەوەرانی تر جیادەکاتەوە زمانە ، ئەم زمانەشە وایکردووە کە مرۆڤ چەندەها شارستانیەت و کلتووری جۆراوجۆر بنیاتبنێ ، ئەم خۆشەویستیەش گەرەکە بەشێوەیەکی ڕەوشتی و لە دڵەوە بێت نەك بەشێوەیەکی ڕۆتینی ، ئەوە زمانە بڕیار و هزرینی هۆشی مرۆڤەکان کۆ دەکاتەوە و کێشە و گیروگرفتەکان چارەسەر دەکات .

سەربەخۆیی وڵات و ئازادی مرۆڤ چەندە پێویست بێت ئەوا زمانیش ئەوەندە پێویستە ، چونکە یەکەمین شت کە مرۆڤ دەناسێنێ زمانە نەك باڵا و ڕەنگی مرۆڤەکان ، هەرچی داهێنانیش هەیە بەهۆی زمان دەناسێنرێت ، کەواتە زمان پێویستیەکی کرۆکی مرۆڤایەتیە . گەر زمان نەبوو ئەوا شارستانیەتیش نیە ، گەر شارستانیەتیش نەبوو ئەوا هیچ زیندەوەرێك نیە بەناوی مرۆڤەوە . یەکێك لەو شتانەی کە مرۆڤ لە زیندەوەرانی تر جیادەکاتەوە زمانە نەك دوو پێ ، چونکە زۆربەی زیندەوەری تر هەیە کە دوو پێی هەیە وەك مرۆڤ ، جگە لەمەش هەر شوێنێك زمانی تایبەت بەخۆی نەبوو ئەوا شارستانیەتیشی نیە و خاوەن کلتوور و ئایینی تایبەتی خۆی نیە ، گەرەکە مرۆڤ هەموو کاتێك و پێش هەموو شتێك ڕەچاوی زمانی خۆی بکات و بیپارێزێت لە زمانی بێگانە .

لەناو مرۆڤەکاندا چەندەها زمان هەیە ، ئەمەش لەیەکتری جیاکردوونەوە . گەر لە شوێنێك ژیای پێویستە گەشە بە زمانی خۆت بدەی نەك زمانی بێگانە بهێنیتە ناو زمانە ڕەسەنەکەی خۆتەوە .

– هەوڵی ئەوە نەدات بە وشەی بێگانە زمانەکەی خۆی دەوڵەمەند بکات ؟

– نا ، چونکە گەر بێت و لە زمانەکەی خۆی بکۆڵێتەوە ئەوا دەوڵەمەندترین زمانی هەیە ، بەڵام لەبەر ئەوەی بەدواداچوونی بۆ نەکردووە وادەزانێت کە زمانەکەی خۆی لاوازە لەبەرامبەر زمانەکانی تردا ، هەموو زمانێك خاوەنی کۆمەڵێك تایبەتمەندی خۆیەتی ، بە هاتنی وشەی زمانی بێگانە زمانی دایك بەرەو کاڵبوونەوە دەچێت ، پێویستە لەسەر هەموو دایك و باوکێك منداڵەکانی خۆیان وا پەروەردە بکەن کە خۆ بە دووربگرن لە زمانی بێگانە و

**هەوڵی تەواو بدەن تا گەشە بە زمانەکەی خۆیان بدەن . زمانی دایك واتە زمانی ڕاستەقینەی وڵات ، ئەو زمانە ڕاستەقینەیەش تەنیا لە هۆشی مرۆڤی خاوەن ڕەوشت و ڕاستەقینەدایە و دوورە لە مرۆڤی پۆخڵەوات و چڵێس و چاونزێر و نان خوسێنەر .**

**– چ هۆکارێك وا لە چاونزێرەکان دەکات ، ئەم ڕەفتارە بنوێنن ؟**

**– چاونزێرەکان و سەرمایە پەرستەکان هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدانە کە زمان و کلتووری خۆیان بفرۆشن لە پێناو بەدەستهێنانی خۆشیەکی تایبەتی خۆیان یان سوود و قازانجێکی کەمی خۆیان ، بۆیە زۆرتر خۆیان بەوە خەریك دەکەن کە زمانی بێگانە بهێننە ناو زمانە ڕەسەنەکەی خۆیانەوە .**

**فرووزە ، ئاساییە گەر کەسێك بیەوێت فێری زمانی بێگانە ببێت ، بەڵام کاریگەری ئەوەی لەسەر دانەنێت کە زمانە ڕەسەنەکەی خۆی لە فکر بباتەوە ، بەڵکو پێویستە هەوڵی ئەوە بدات کە زمانەکەی خۆی پێبپارێزێت و بەو زمانە بێگانەیە فێری ئەوە ببێت کە ڕێز لە زمانەکەی خۆی بگرێت ، چونکە هیچ بێگانەیەك ڕێز بۆ زمانەکانی تر دانانێت گەر لە زمانەکەی خۆشی دەوڵەمەندتر بێت ، کاریگەر بوون بە زمانی بێگانە زمانی دایك بەرەو لەناوچوون دەبات ، کەواتە پێویستە هەموو کەسێك ئاشنایی تەواو لەگەڵ زمانی دایکدا پەیدا بکات و هەوڵی ئەوە بدات بەرەو پێشەوەی بەرێت و فراوانتری بکات ، هەروەها هەوڵی ئەوە بدات زمانەکەی خۆی بەراورد بکات بە هەموو بوارەکانی ژیانی خۆی و ژیانی جڤاکەکەی خۆی . لە کاتی هەر توێژینەوەیەکیشدا هەوڵی ئەوە بدات بە زمانەکەی خۆی توێژینەوە بکات نەك بەزمانی بێگانە ، چونکە گەر وانەبێت ئەوا ئەوکاتە دەچێتە بواری بێگانە پەرستیەوە و ناچێتە بواری بە زانابوونەوە لە جڤاکەکەی خۆیدا . زانای وڵات ئەو کەسەیە کە بە زمانە تایبەتیەکەی خۆی باس لە وڵاتەکەی خۆی دەکات و ئامۆژگاری دەکات .**

**ئەو زمانە بێگانەییەی کە تۆ فێری دەبیت با بۆ گەیاندنی مامەڵە و هەڵسوکەوتی کەسەکانی وڵاتی خۆت بێت لەگەڵ کەسێکی بێگانەدا ، نەك بۆ پشتاوخستنی زمانەکەی خۆت و سەپاندنی زمانی بێگانە بەسەر زمانە خۆماڵیەکەی خۆتدا ، گەر تۆ خاوەنی زمانی تایبەتی خۆت نەبیت ئەوا تۆ خاوەنی خۆشت نیت و بێبەشی لە شارستانیەت و کلتوور و ئەدەب .**

**– گەر ئەوەی تۆ باسی دەکەی وابێت ، ئەوا زمان دەچێتە بواری مامەڵەشەوە .**

**– زمان بریتییە لە هەموو مامەڵەیەکی سیاسی و ئابووری و ئایینی و کۆمەڵایەتی ، چونکە زمان هەموو تایبەتمەندی و ئەرکەکانی وەك فێرکردن و گفتوگۆ و هاریکاری و زانین و خۆشەویستی و بگرە زۆربەی ئەرکەکانی تر لەخۆدەگرێت . ئەوە زمانە دەنگەکان بە هەستی بیستن دەگەیەنێت و دواتر هەستی بیستنیش دەیانگوازێتەوە بۆ هۆش ، دوای ئەمەش هۆش لەناو خانەکانی خۆیدا هەڵیاندەگرێت و دواتر تۆکمەیان دەکات و لەیەکتر جیایان دەکاتەوە ، جارێکی تریش هەوڵدەدات بەرێگەی زمانەوە گۆتەیەکی باشیان لێدەرببڕێت .**

**– گرنگی زمان لە فێرگەوە دەستپێدەکات .**

**– بەڵێ فرووزە لە دوای دایك و باوك لە فێرگەوە دەستپێدەکات ، چونکە فێرگە ئەو شوێنەیە کە مرۆڤەکانی تێدا پەروەردە دەکرێت هەر لە منداڵیەوە تاوەکو قۆناغی کامڵبوون ، شوێنێکە مرۆڤەکان دەتوانن تێیدا خۆیان بناسن و خۆیانی تێدا ببیننەوە ، فێرگە بریتییە لە شوێنی دووەمی مرۆڤەکان لەدوایماڵەوە ، چونکە سەرەتا مرۆڤ لەماڵەوە لەلایەن دایك و باوکیەوە فێردەکرێت و دواتر لە فێرگەدا ، بۆیە مرۆڤ پێویسە خۆشەویستیەکی تایبەتی بۆ فێرگەی ماڵەوە هەبێت .**

**– ئەم خۆشەویستیەی ماڵەوە بۆ لە فێرگە جیا دەکەیتەوە ؟**

**– چونکە دەروازەیەکە بۆ چوونە ناو زمانی خۆماڵی و چوونە ناو جڤاکەکەی خۆی و چوونە ناو ڕەوشت و جوانی و هەموو بنەماکانی جڤاکی خۆی ، ئەمەش جیاوازە لە فێرگەی دەرەوەی ماڵەوە ، چونکە لە فێرگەی دەرەوە هەوڵی ئەوە دەدرێت زیاتر شتەکان بناسێنرێت بە مرۆڤ ، واتە درێژەپێدەری فێرگەی ماڵەوەیە ، بەڵام ئەو فێرگانەی دەرەوەش جیاوازیان هەیە لەگەڵ یەکتردا ، بەڵام بەهۆی فێرگەی دەرەوە زیاتر مرۆڤ دەتوانێت پێناسە بۆ خودی خۆی بکات .**

**– بەڵام زۆربەی مرۆڤەکان رکیان لە فێرگە دەبێتەوە .**

**– زۆربەی مرۆڤەکان رکیان لە فێرگە دەبێتەوە ، بەڵام نازانن کە ئەوە فێرگەیە بوونی ئەوان دەسەلمێنێت ، هۆی ئەم رکلێبوونەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە فێرگەکان زیاتر وانەی قسەکردنن و وانەی کردەوەییان تێدا کەمە ، ئەمەش وایکردووە کە مرۆڤ هەمیشە رکلێبوونەوەی زیاتر بێت لە خۆشەویستی بەرامبەر بە فێرگە ، بەڵام فێرگە تەواوکەری هەموو ئەو شتانەیە کە مرۆڤ هەنگاوی بۆ دەنێت و دەیەوێت پێیبگات ، هەرچەندە زۆرێك لە**

**فێرگەکان بوونەتە مەیدانی تووتیەکان و فێرکارەکان مامەڵەی تووتی لەگەڵ شاگردەکاندا دەکەن ، بەڵام ئەوە ناچێتە بواری رکلێبوونەوە ، بۆیە شاگرد لەو کاتەدا پێویستە هەوڵی ئەوە بدات خۆی بەدوای شتەکاندا بگەڕێت و فێری شتەکان ببێت ، لەوانەیە ئەو جۆرە فێرکارانە خۆیان ئارەزوویان لەو جۆرە فێرکردنەبێت ، یان خۆشیان بەو شێوەیە گەیشتبن بە ئامانج و مەبەستە پوچەڵەکانیان ، بەڵام مرۆڤ سەرەڕای ئەوەش پێویستە فێرگەی خۆشبوێت و ڕێزی لێبگرێت ، چونکە فێرگە کۆتایی پێهێنەری نەزانی و دواکەوتوویە ، فێرگە نەزانی و یاساکانی نامرۆڤ بوون ناهێڵێت و مرۆڤ هۆشیار دەکاتەوە بەرەو زانین و پێشکەوتن و ناساندنی مرۆڤ ، هەرچەندە زمان دەبێتە هۆی دەربڕینی وشەکان ، بەڵام ئەو دەربڕینانە لە هۆشەوە ئاراستە دەکرێن و زمانیش بەیارمەتی ژێیەکان وەك ئامرازێکی خولانەوە دەیانگەیەنێت بە دەرەوە و دەنگیان لێ درووستدەکات ، ئەم دەنگانەش لە ئەنجامی چەند بارەبوونەوەی زمان ، باری خۆی دەدۆزێتەوە و لەیاسا دەنگیەکەی خۆی لانادات ، ئەم دەنگانەش زیاتر بەهۆی لاساییکردنەوەی دەنگەکانی تر یان ئەو دەنگانەی کە لەلایەن مرۆڤەکانی ترەوە دەردەبڕدرێن ، درووستدەبن .**

**هیچ مرۆڤێك سەرەتا ناتوانێت قسەبکات ، بەڵکو بە هۆی هەستکردن بە دەنگ لە خۆیدا و گوێگرتن لە دەنگی کەسانی تر وردە وردە دەتوانێت فێرببێت و دواتر بە زمانی خۆی قسە بکات . سەرەتا هۆش بەتاڵە و هەموو دەنگێك وەردەگرێت ، ئەو دەنگانەش لەناو هۆشدا جێگیر دەبن و دواتر لەڕێگەی زمانەوە دەردەبڕدرێن ، هەموو مرۆڤێکیش جۆرە خۆشەویستیەکی تایبەتی بۆ ئەو زمانە سەرەتاییە هەیە کە پێی دەگات ، ئەم خۆشەویستیەش زیاتر لەلای منداڵە نەك گەورەکان ، چونکە منداڵ زیاتر هەستی پێدەکات و دەشزانێت کە بەهۆی ئەو وشانەی فێری بووە دەتوانێت داواکاریەکانی خۆی بگەیەنێت و مەبەستەکانی خۆی پێ بپێکێت**

**— کەواتە زمان ئامرازێکیشە لە وەرگرتنی زانیاریدا بۆ مرۆڤ . لەپاڵ ئەوەی کە زانیاریش دەگەیەنێت .**

**– بەڵێ ، ئامرازێکە زانیاری وەردەگرێ و زانیاریش دەداتەوە . ئەویش بە هاوکاری هەستی بیستنەوە ئەو زانینە وەردەگرێت و دواتر هەر بەهۆی هەستی بیستنیشەوە دەگات بە هۆش . کەواتە فێرگە یەکێکە لە گەورەترین شوێنی فێربوونی مرۆڤ بۆ پاراوکردنی زمان و فێربوونی زمانێکی تۆکمە و سەنگین ، چونکە مرۆڤ زۆربەی وشە تۆکمە و سەنگینەکان لە فێرگەوە**

فێردەبێت نەك لەدەرەوەی فێرگە ، بەتایبەتی ئەو فێرگانەی كە كردەوەیان زۆرترە لە قسەكردن .

– چی دەبوو گەر زمانی هەموو مرۆڤەكان وەك یەك بووایە ؟

– گەر زمانی هەموو زیندەوەران یەك بوویایە ، ئەوا زەوی بریتی دەبوو لە هەرێمێكی خوێناوی بۆ مرۆڤەكان ، چونكە هەرماڵێك پێویستی بە فەرمانڕەوایەك دەبوو ، بۆ ئەمەش ملیارێك فەرمانڕەوا لەیەك كاتدا لەسەر زەوی دەردەكەوتن و یەك ملیار هەرێمیش لەیەك كاتدا درووست دەبوون ، بۆ ئەمەش ئارەزووەكان زۆرتر دەبوون و سنووریش نەدەما بۆ مرۆڤ . زمانەكان تەنیا لە مرۆڤدا خۆیان دەرخست ، ئەوانیش بریتیبوون لەناوی شتەكان ، كە مرۆڤ بەشێكی كەمی لە سرووشتەوە وەرگرتن و بەشە زۆرەكەی تریشی خۆی ناوی بۆ دانان و بەرە بەرە زمانەكانی بە هۆشی خۆی فراوان كردن و چاكسازی تێدا كردن ئەوانیش بەهۆی فێرگە و كرانەوی هۆشی بەرامبەر بە بوونی شتەكان و نەبوونی شتەكان ، وەك چۆن مرۆڤەكان جیاوازن لەگەڵ یەكتر ئاوهاش زمانەكان جیاوازن لەیەكتر ، ئەم جیاوازیەش مرۆڤەكانی كردۆتە بەش بەش و چەند شارستانیەتێكی بەدوای خۆیدا هێناوە و كۆمەڵێك كلتووری جۆراوجۆری درووستكردووە .

مرۆڤەكان بەهۆی هۆش و زمانەوە دەتوانن پێناسە بۆ خۆیان بكەن و لەیەكتر تێبگەن ، بەهۆی زمانیشەوە دەتوانن شارستانیەت بۆ خۆیان بنیادبنێن .

– هاوژیانیش هۆكارێكە بۆ فراوانبوونی زمان .

– فرووزە ، ئەوەی زیاتر زمان فراوان بكات هاوژیانییە ، چونكە دوو كەس تێكەڵ بەیەكتر دەبن . لەوانەیە یەكێكیان زمانی دەوڵەمەندتر بێت لەوی تر ، ئەمەش وادەكات كە بە هەردووكیان زمانێكی دەوڵەمەند پێكبهێنن . بەتایبەتی هەردوو كەسەكە سەر بەهەمان زمان بن .

– مەرجە هەردووكیان سەر بە هەمان زمان بن ؟

– مەرجە .

– بۆچی مەرجە سەر بە هەمان زمان بن ؟

– لەوانەیە یەكێكیان بكەوێتە ژێر كاریگەری ئەویتر و زمانەكەی خۆی وەلا بنێت ، بەمەش زمانی دایك لەلای ئەو كەسە بەرە بەرە لەناودەچێت .

– کەواتە با بێینە سەر بابەتی هاوژیانی و پێناسەیەك بۆ هاوژیانی بکەین .

– زۆر باشە ، فرووزە . هاوژیانی ، واتە پێکهاتنی خێزان و بەردەوام بوون و درێژەپێدانی ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤ . بریتییە لە درووستبوونی خێزانێکی نوێ لەسەر زەوی و فراوانبوونی جڤاك .

– ئەم هاوژیانیە لەناو مرۆڤەکاندا بۆ ئەم مەبەستە ئەنجام دەدرێت ؟

– ئەم هاوژیانیە لەناو مرۆڤەکاندا بەپێی ئارەزووە تایبەتیەکانی مرۆڤ و بوون بە خاوەنی کەسایەتی لەقەڵەم دەدرێت ، ئەمەش مانای هاوژیانی و خۆشەویستی هاوژیانی لەناوبردووە ، چونکە هاوژیانی لەناو مرۆڤەکاندا تەنها بۆ تێرکردنی لایەنی جووت بوون بەکاردەهێنرێت لەنێوان نێر و مێ دا ، ئەمەش وایکردووە کە خۆشەویستی هاوژیانی لە ئاستێکی باڵاوە بەرەو ئاستێکی نزم بەرێت ، چونکە تەنها فکر لە جووت بوون و خستنەوەی وەچە دەکرێتەوە لە هاوژیانیدا . فکر لەوە ناکرێتەوە کە دوو کەس یەکتریان خۆشدەوێت و دەیانەوێت بەیەکەوە ژیان بەسەربەرن . فکر لەوە ناکرێتەوە گەر وەچەش بخەنەوە هیچ گۆڕانکاریەك لە ژیانی ئەواندا ڕوونادات ، چونکە پاش ماوەیەك مەرگ بەرۆکی هەردووکیان دەگرێت و ئەو کاتە هیچ کام لەنەوەکانیان بە دڵ پەرۆشی خۆیانیان بۆ دەرنابڕن ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خستنەوەی وەچە شتێکی پێویستە ، بەڵام پێویستیشە تەنها فکر لە خستنەوەی وەچە نەکرێتەوە ، بەڵکو فکر لە خۆشەویستی نێوانیان بکرێتەوە زیاتر ، چونکە گەر خۆشەویستی نێوانیان لەسەر بنەمای وەچە خستنەوە بێت ئەوا ئەگەری لێکجیابوونەوە هەیە ، بەهۆی ئەو لێکجیابوونەوەش کۆمەڵێك وەچە سەرگەردان دەبن ، دوای ئەم سەرگەردانبوونەی وەچەکانیش ژینگە بەرەو وێرانبوون دەبات .

– ئەم جیابوونەوەیە چ پەیووەندیەکی بە ژینگەوە هەیە ؟

– دوای ئەم جیابوونەوەیە وەچەکان بێ پەروەردە و بێ دایك و باوك دەمێننەوە ، لە ئەنجامی ئەو بێ پەروەردەیەش ئاکاری قێزەون سەرهەڵدەدەن لەلایەن وەچە بێ لانەکانەوە . یان بە شێوەیەکی تر ، گەر خۆشەویستی بۆ هاوژیانی نەبێت ئەوا خۆشەویستی بۆ وەچەکانیش بوونی نابێت . زۆر خستنەوەی وەچەش دەبێتە بارێکی گران بەسەر زەویەوە ، چونکە مرۆڤ بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدایە کە وەچە بخاتەوە بۆ ناو و ناوبانگی خۆی نەك بۆ خۆشەویستی ، زۆر

وەچە خستنەوە بریتینیە لە خۆشەویستی بۆ مرۆڤ بوون ، بەڵکو بریتییە لە تێکدانی ژینگەی مرۆڤ ، چونکە وەچە پێویستی بە پەروەردە هەیە ، ئەم پەروەردەیەش پەیووەندی بە کاتەکانی دایك و باوکەوە هەیە ، گەر کاتیان کەم بوو ئەوا وەچەش کاتێکی کەم پەروەردە دەبینێت ، بۆ ئەمەش بەرەلأیی بەدوادا دێت و دواتر ڕوودەکاتە ناو جڤاك ، ئەمەش دوورە لە خۆشەویستی هاوژیانی ، بەلأم گەر وەچە خستنەوە کەم بوو لەلایەن دایك و باوکەوە ، ئەوا خۆشەویستی هاوژیانی لە ئاستی لوتکە دایە ، چونکە ئەو کاتە هەم خۆشەویستی هەیە و هەم کاتیش هەیە ، گەر کاتیش هەبوو ئەوا پەوەردەیەکی باش هەیە ، گەر پەروەردەیەکی باشیش هەبوو ئەوا ژینگەیەکی باش هەیە ، ئەو کاتەش خۆشەویستی بۆ مرۆڤ بوون هەیە .

خۆشەویستی بە قسەکردن ئامانجی هەموو کەسێکە ، بەلأم کردەوەی خۆشەویستی ئامانجی هەموو کەسێك نیە ، چونکە ئەو مرۆڤانە کەمن کە کردەوەی خۆشەویستیان هەیە .

– چی دەبوو گەر خۆشەویستی بە قسەکردن بوایە ، بەلأم کردەوەی لەگەڵ نەبووایە ؟

– خۆشەویستی گەر بە قسەکردن بووایە ئەوا تاڵە موویەك لەسەر زەوی بزر نەدەبوو ، چونکە هەر زوو خاوەنەکەی دەیدۆزیەوە و هەڵیدەگرتەوە تاوەکو زەوی پیس نەبێت . خۆشەویستی هاوژیانی خۆشەویستیەکە هەموو کەسێك ناتوانێت لە ماناکەی تێبگات ، چونکە ئەم خۆشەویستیە یاسای تایبەت بەخۆی هەیە و پێویستە هەموو مرۆڤێك چ نێر بێت یان مێ پێش هاوژیانی ئەو یاسایانە ڕەچاوبکات ، چونکە پەیووەندی بە داهاتووی جڤاکەوە هەیە ، زۆرێك لە مرۆڤەکان ئەم هاوژیانیە پێکدەهێنن بۆ سەلماندنی کۆمەڵێك کاری نەخوازراو ، بەتایبەتی لەلایەن نێرەوە کە پێیوایە تەنها بەهۆی ئەم هاوژیانیەوە نێرایەتی خۆی دەسەلێنێت ، بەلأم ئەم هاوژیانیە تەنها بۆ سەلماندنی نێرایەتی نیە ، بەڵکو بۆ سەلماندنی بەها و بەردەوامبوونی یاساکانی ژیانی مرۆڤە ، چونکە هەموو زیندەوەرێکی نێرینە توانای ئەوەی هەیە نێرایەتی خۆی بسەلێنێت ، هەربۆیە پێویستە لە هاوژیانیدا فکر لە ژیانێکی پڕ بەها بکرێتەوە نەك فکر لە جووت بوون و تێرکردنی ئارەزووەکان بکرێتەوە .

– ئەی مێینە گەرەکە چۆن بێت لەو ناوەدا ؟

– گەرەکە مێینە فکربکاتەوە پێش ئەوەی هاوژیانی پێکبهێنێت . چونکە لەلایەن مێینەشەوە وا فکر دەکرێتەوە گەر هاوژیانی لەگەڵ نێرینەدا پێکنەهێنێت ئەوا ناتوانێت بەردەوام بێت لە

**ژیان و بوونی مێیەتی خۆی بسەلێنێت ، هەموو ئەم فکرانەش کە لەلایەن نێرینە و مێینە دەکرێتەوە هەڵەیەکن بۆنی تاوانیان لێدێت ، چونکە تاوانکردن تەنها بریتینیە لە کوشتنی مرۆڤ و دزی و کارە قێزەونەکانی تر ، بەڵکو هاوژیانی هەڵەش تاوانە لەڕووی مرۆڤەوە ، ئەم تاوانانەش بەهۆی نەبوونی خۆشەویستی هاوژیانیەوە دەئافرێنرێن و دواتر وەك ئاگری ناو پاوان نەشونمادەکات بەرەو تاکەکای ناو جڤاك ، ئەمەش دەبێتە ڕێچکەیەك بۆ نەوەکانی داهاتوو و درێژەی پێدەدرێت ، کەواتە هاوژیانی پێویستی بە خۆشەویستی هەیە لەپێش وەچە خستنەوە .**

**– بەلاّم نێر و مێی هەموو زیندەوەرێك پێویستی بە یەکترە بە مرۆڤیشەوە .**

**– ئەمە ڕاستە فرووزە ، نێر و مێ پێویستان بە یەکترە ، چونکە بەبێ یەکتر ناتوانن هەڵبکەن و بەردەوامی بە ژیان بدەن ، بۆیە پێویستە خۆشەویستی تێدا بکرێتە ئامانج لەگەڵ وەچە خستنەوەی کەم ، تاوەکو ژینگەی گشتی مرۆڤەکان تێکنەچێت و تاوانی خۆشەویستی لەسەر زەوی کەم ببێتەوە .**

**نێر و مێ چەند پێویستیان بە یەکتر بێت ، ئاوهاش وەچەکان پێویستیان بە کاتی تەرخانکراوە بۆ پەروەردەیەکی دەگمەن ، تا بتوانن لە داهاتوودا خۆیان ببنە خاوەنی خۆیان نەك کەسێکی تر ببێتە خاوەنی پەروەردەی ئەوان .**

**هەموو ئەم گۆتانەی کێوەکان بۆ فرووزە بەس نەبوون ، بەڵکو ئەمانە هەم خۆشەویستی بوون بۆ شتەکان هەم یاساش بوون بۆ مرۆڤ بوونێکی تەواو .**

**فرووزە کاتێکی زۆری لەگەڵ کێوەکان بردە سەر ، هەربۆیە فروزە تەواو ماندوو ببوو ، بۆئەمەش خەو بەسەر چاوەکانیدا هات و لە چاڵێکی سەر بەرزاییەکە خەویلێکەوت ، بەشێوەیەك کە دەتوت تەواوی ئەو ڕۆژە لە ولاّتێکی هەژاردا لە گەڕاندابووە بۆ دۆزینەوەی کار . بۆ ماوەی هەشت کاتژمێر خەویلێکەوت . کاتێك کە لەخەو هەڵسا بینی تازە تیشکی خۆر خەریکە وردە وردە بەرەو سەرووی کێوەکان بەرز دەبێتەوە ، دواتر ئاوڕی دایەوە بۆ پشت خۆی**

بینی کابرایەکی زۆر پیر کە سەر و ڕیشی وەك بەفری زستان سپی بوو لەپشتیەوە وەستاوە و بە زەردەخەنەیەکەوە سەیری دەکات ، فرووزە لەو کاتەدا هۆشسام بوو ، بەشێوەیەك سەیری کابرای پیری دەکرد دەتوت لەناکاو ترسێنراوە .

– سلاّو فرووزە .

لەوانەیە کێوەکان تۆشیان بێزار کردبێت بەهۆی قسەکردنی زۆرەوە .

– نا ، بێزار نەبووم .

– بە چاوەکانتدا دیارە کە سوور بوونەوە . بە لاشەشت ڕادیارە کە لاشەت ڕەق بووە . فرووزە خۆشەویستیش پێویستی بە ماندووبوونە تا پێی دەگەی .

– ماندووبوونێکی چۆن ؟

– تۆ تەواوی خۆشەویستیەکانت نەبیست ، هەر زوو خەو چاوەکانی بردیەوە و کێوەکانت لە خۆت تووڕە کرد ، چونکە بەدەستهێنانی ئەو جۆرە خۆشەویستیانە پێویستی بە نەخەوتنە . پێویستی بە ماندوو بوونە ، چونکە خۆشەویستی هەموو شتەکان پەیووەندی بەیەکەوە هەیە و تەواوکەری یەکترن ، هەربۆیە کێوەکان لەتۆ ئارامتر و خۆڕاگرتر بوون ، هەربۆیەش ئارامیانگرت تا تۆ لەخەو هەڵسیت و خۆشەویستیەکانی تریشت پێ بناسێنن .

فرووزە لەوکاتەدا کەوتە گومانەوە ، چونکە ئەو کابرا پیرە بە تەواوی گفتوگۆی نیوان ئەو و کێوەکان دەزانێت ، بە قسەکانیشی وا دەردەکەوت کە لەو کاتەدا یان لە نزیك ئەو شوێنە بووە یان لەو کاتەدا لەلای کێوەکان بووە ، بەلاّم پاش قسەکردنێکی زۆر لەنێوان فرووزە و کابرای پیردا فرووزە بۆی دەرکەوت کە ئەوە ئەو کابرا پیرە بوو کە باسی خۆشەویستی شتەکانی بۆ کردووە نەك کێوەکان .

– من ئێستا دەبێت لەگەڵ کێوەکان بکەومەوە گفتوگۆ ، تا خۆشەویستیەکانی تریشم پێ بناسێنن .

– فەرموو فرووزە ، بەلاّم لەلای من دەست بە گفتوگۆی نێوانتان بکەن .

– ئایا هێشتا خۆشەویستیەکان ماون پێم بناسێنن ؟

کابرای پیری سەر و ڕیش سپی لەولاوە دەستیپێکرد ؛ بەڵێ ، هێشتا ماویەتی ، فرووزەش لە جێگەی خۆی بەبێ دەنگی دانیشت و دالّغەی لە ڕیشی سپی کابرای پیر دا ، کابرای سەر و ڕیش

سپیش دەستیپێکرد بە وتە و ئامۆژگاریەکانی .

– فرووزە لەوانیە من بووبم کە ئەمشەو قسەم لەگەڵ تۆدا دەکرد .

– کەواتە ئەوە تۆ بووی !

– بەڵێ من ئەمشەو لەبەر چاوەکانی تۆدا ببومە کێو ، چەندەها کێو .

– کەواتە هەموو کێوەکان ئێستا لەلامن .

– بەڵێ لەلاتن .

– هێشتا ماوە پێمبڵێی ؟

– هێشتا نەگەیشتوویتە نیوەی .

– ئادەی با کێوەکان شتەکانم زیاتر بۆ ڕوونبکەنەوە .

– کەواتە بێدەنگ بە تا خۆم دەتهێنمە قسە . ئەوەشی پێتی دەڵێم فکری لێبکەوە ، ئەو کاتە قسە بکە یان پرسیار بکە .

– بەڵێ ، تا خۆت دەمهێنیتە قسە .

– ئیدی تەمەنی من بەرەو کۆتاییە فرووزە .ئەمانەشی باسی دەکەم ، هەموو بینی .

لاوەکانی وڵات دەیانوویست بە داهاتوویەکی خۆش و هەڵوێستێکی ئازاد بگەن ، ئەسپەکانیش لە خۆشی وەرزی بەهار کەتبوونە سەما و لەم چیا بۆ ئەو چیا چوار ناڵەکیان دەکرد . گوڵەکانیش بەهاتنەوەی هەنگەکان بێزار ببوون ، چونکە هەر دەم نا دەمێك هەڵیاندەکووتایە سەر سەر و گوێلاکیان و نەیاندەهێشت بە ئارامی هەوای سازگار هەڵمژن کە مافی خۆیان بوو .

خێزانەکان شاری مێرووەکانیان وێرانکردبوو ، مێرووەکانیش پۆل پۆل کۆچیاندەکرد بەرەو زەویەکان ، خاوەن زەویەکانیش هاتن و تەواوی ماڵەکانیان وێرانکردن ، دواتریش بەرەو کەناری دەریا ڕۆیشتن و شارێکیان درووستکرد ، بەڵام لافاوی زستان هات و هەموویانی بە دایك و باوك و خوشك و براوە خستە ژێر خۆیەوە و بەتەواوی لەسەر زەوی کۆتایی پێهێنان .

لاوەکانی وڵات هەڵوێسیان وەرگرت لەسەر کوشتنی سالۆر ، سالۆریش ئاواتەکانی سنووردار کرابوون و لە هەلێکی کتوپڕ دەگەڕا تا بتوانێت بڕیارەکان لە خۆیەوە دەربچن ، بەڵام تا ڕۆژگار دەهات ئەویش زیاتر دەچۆوە ناو زیڤینگ ، تەلبەندی بەندیخانەکەشی ڕەقتر دەبوو .

منداڵەکان کرابوون بە ئامانج  و مەبەستی داهاتوو ، چەندەها تاوانیش ڕۆژانە بەرۆکی دەگرتن

، خێزانەکانیش لە دوورەوە بۆ داهاتوو دەگریان و بە نهێنی پەروەردەی منداڵەکانیان دەکردن .
خیزانەکانی ناو کۆلان هەواڵی گەڕانەوەی ڕۆژی تەندووریان بۆ هاتبوو ، منداڵانیش یەکە یەکە کۆ دەبوونەوە و خۆیان ئامادە دەکرد بۆ پێشوازیکردنی داپیرە دار ، قارچکەکانیش لەو ڕۆژەدا لەناو ماڵی داپیرە دار یەکە یەکە دەهاتنە دەرەوە بۆ ئەوەی سەیری ئاسمان بکەن داخۆ هێشتا هەڕەشەکانی بەردەوامن لەسەر داپیرە ، یان دەیەوێت پەیمانی ئاشتی لەگەڵدا ببەستێت . بۆیە منداڵەکان لەناو فێرگەدا فێرکرابوون کە هەرچی وترا مەرج نیە ڕاست بێت ، چونکە زۆربەی وتنەکان هەڵەنە و کەمێکیان ڕاستن . هۆش لەو ناوەدا گومانی بۆ درووست ببوو ، چونکە نەیدەزانی باوەڕ بە کام لەم هەواڵانە بکات کە دەوتران .
لاوەکان نەدەوێران بێنە ناو دەنگوباسی بەساڵاچووەکانەوە ، هەر هەڵەیەکیش کە دەکرا بە هەڵە لەقەڵەم نەدەدرا ، چونکە ئەزموونی پێشینەییان هەبوو لەسەر هەموو شتەکان ، بەڵام هەموو کاتێ دەیانگووت ئێمە تەنیا پێشنیارەکان دەدرکێنین و نایانسەپێنین بەسەر ئێوەدا ، لەو کاتانەشدا داپیرە ئەزموونەکانی تەواو دەبوون لەناو خێزانەکان و چاوەڕێی ماڵئاوایی بوو .
تا وایلێهات کۆترەکانی ئاشتی سینگیان سوور بوو ، لاوەکان و منداڵەکان دەستیانکرد بە ڕاپەڕاندنی کارەکانی هاوینە ، تاوەکو بتوانن لە فێرگەکان بە ئاسوودەیی وانەکانیان بخوێنن ، بەڵام هەرچەندی هەوڵیاندەدا نەیاندەتوانی لە سنووری خۆیان ئاودیوو بن و بگەن بە زانیاری تەواوەتی ، چونکە سنووری هۆش تەلبەند کرابوو لەناو گۆزەیەکی ئێسکدا . فێرکارەکان دەهاتنە ناو فێرگە و هاواریاندەکرد ، شاگردەکانیش لەولاوە ترسیان لێ نیشتبوو ، شاگردەکانیش لەگەڵ ئەم دەنگە بەرزەدا ڕاهاتبوون ، جڤاکیش شەوانە هەمان هاواری لێ بەرز دەبۆوە ، بەڵام ئەو وەك فێرکارەکان شاگردیان نەبوو ، بۆیە لەدوای هاوارەکەی دەستیدەکرد بە گریان ، مرۆڤەکانیش لەولاوە خۆیان کردبوو بە خاوەنی ڕاستەقینەی جڤاك ، بەڵام جڤاك شایستەی ئەوە نەبوو بەم شێوەیە ببێتە شوێنی ئەم جۆرە مرۆڤانە . چونکە مرۆڤەکان خۆشەویستی خۆیان بۆ پیشەکەیان دەرنەدەبڕی ، هەربۆیە پیشەکان لەپێش مرۆڤەکان ناڕەزاییان دەربڕی و هاتنە بەردەم دادگا ، بەڵام دادگا خۆی تاوانباری ڕاستەقینە دەرچوو ، سەرەنجام دادگا و مرۆڤەکان بەیەکەوە لەسەر پیشەکان ڕێککەوتن .
پزیشکەکان هاتنە ناو لادێیەکە ، پاش چەند چرکەیەك هاتن سەیری نەخۆشەکان بکەن ، بەڵام

نەیانزانی کە تاعوون بڵاوبۆتەوە لەناو لادێیەکەدا ، کاتێك هەستیانپێکرد کە خۆیان تووشی تاعوون بوون ، ناچار لە لادێیەکە نەگەڕانەوە و وەسیەتنامەیەکیان بۆ ماڵەوە نووسی .
برایەکان بە خوشکەکانی خۆیان دەوت مرۆڤ گۆڕانکاری بەسەر زەویدا دەهێنێ ، ئەوانیش دەیانپرسی ئەم وتەیە یانی چی ؟ ئەوانیش دەیانوت مرۆڤەکان خۆ خۆرن لەناو زەویدا ، هەروەها جوانترین ئاژەڵن لە هەموو ڕوویەکەوە ، هەروەها مرۆڤ جوانترین ئاژەڵە لە دڕندەییدا ، خوشکەکانیش دەیانوت نا ئەمە تەنیا بیرۆکەی ئێوەیە ئەگینا مرۆڤ گۆشتی مرۆڤ ناخوات .
مرۆڤەکان ڕووەکەکانیان لە ڕەگەوە هەڵدەکەند بەڵام ڕووەکەکان مرۆڤیان دەپاراست لە هەوای پیس ، هەروەها ژینگەیان پیس دەکرد و زیندەوەرەکانی تریان تاوانبار دەکرد .
هونەرمەندەکان تازە فێری موزیك ژەنی ببوون ، بەڵام ڕووەکەکان بێزار ببوون لە بێئاگایی ئاوازەکان و پساندنی تەلەکانی سەر ئامێرە موزیکیەکان ، ناچار ماسیەکان بەبێ پرسیار هاتنە ناو باسەکەوە و دەستیانکرد بە هەڵپەڕین ، تەیرەکانیش بە میوانی هاتبوون بۆ ئاهەنگەکە .
پەرتووکەکان تۆزی گەردەلوولەکەی مانگی ڕابردوویان لەسەر نیشتبوو ، بەڵام مرۆڤەکان نەیاندەوێرا دەستیان بۆ بەرن ، چونکە دەستیان تۆزی پێوەدەنیشت ، کەلاوەکانی سەردەمی هەژاریش کەوتبوونە کڕینی یەکە بە یەکەی پەرتووکەکان و دەیانخستنە ناو دیوارە بەردینەکانەوە و لە بارانی بە خوڕی مانگی داهاتوو دەیانپاراستن .
مرۆڤەکانی سەردەمی نوێگەری دەستیانکردبوو بە کۆکردنەوەی مادە ، لە ئەنجامی خراپ بەکارهێنانی مادە تووشی بێڕەوشتی نوێگەری بوون ، نەك ئەدەبی نوێگەری .
مرۆڤ لە کۆتاییی تەمەنیدا دەستیکرد بە هەرای گەورە ، ئەمەش وایکرد کە گەز لە لاشەی خۆی بگرێت و لەبری شەڕابی چیا خوێنی مرۆڤەکانی تر بخواتەوە ، دواتر مەست بوون سەراپای جڤاکی گرتەوە ، لە کۆتاییشدا هەموو ژینگەی مرۆڤی پیس کرد . چونکە لە خاکی ژێر چەور و سەر شەڕاب ، مرۆڤ هەستا خوری پەزەکانی کرد بە بەرگ و داری چیاکانی لەسەر دیواری ماڵەکەی دانا ، بەڵام ئاژەڵەکان لەم ناوەدا زیانیان بەرکەوت و نارەزایەتی خۆیان بۆ سروشت دەربڕی ، گەڵا سەوزەکانیش کەوتبوونە سەر زەوی و بەردەوام لە گریاندا بوون ، لەپڕ باران باری و تۆفانیش سەراپای ناوچەکانی گرتەوە . لەبەرئەوەی مرۆڤەکان رکیان لە لاشەی خۆیان دەبۆوە ، بۆ ئارەزووە کاتیەکان کەوتبوونە دوای چەوری ئاژەڵەکان و جار جارەش بە

نیوه چاوێك له داهاتوویان دەڕوانی ، داهاتووش لێڵ ببوو لەبەر چاوەکانیان ، چونکه لەزەتیان له ڕابردوو وەرگرتبوو ، بۆیه چاویان به داهاتوو هەڵنەدەهات . ژیان بۆ مرۆڤ هاواری دەکرد ، مرۆڤیش بۆ ژیان ئەسرینی دەڕشت .

مرۆڤەکان بێزار ببون ، چونکه ژیانی تایبەتی سەرکەوتبوو بەسەر ژیانی گشتیدا ، نان خوسێنەرەکان به چواردەوریەوە وەستابوون و فەرمووی دیوەخانیان دەکرد . بۆ ئەمەش هەژارەکان دەمردن و ناوه ناوەش زیندوو دەبوونەوە ، خاکیش بێزاری خۆی دەردەبڕی .

گوڵەکان لەم هەڵسوکەوته بێزار ببوون و دەیانەویست یەکسانی لەنێوان میوەکان درووستبکەن ، بەڵام دڕك هاتبۆوه نێوان میوەکان و ڕەوشتی یەکه به یەکەیانی تێکدابوو . وەك چۆن کێوەکان سینگیان بۆ مرۆڤەکان ڕاگرتبوو ، بەڵام مرۆڤەکان نەیاندەهێشت برینەکانیان سارێژ ببێت ، بەردەوام دژایەتیان دەکردن لەپێناو سەفره و سەردانه کاتیەکانی خۆیان .

له شەوه تاریکەکاندا مردن سەردانی هەژارانی ناو جڤاکەکانی دەکرد ، بەڵام هەژاران به مەردی بۆ لای دەچوون و فەرمووی کەلاوه کۆنەکانی خۆیان دەکرد .

له ڕۆژهەڵاتی زەریا زەردەخەنەی نان خوسێنەرەکان دەهات . له ڕۆژئاوای زەریا دەنگی گریان بەری ئاسمانی گرتبوو . باکوری زەریا ببۆوه سەرچاوەی ڕەوشت و خاك پەرستی . باشووری زەریا له هەلێك دەگەڕا بۆ بەرەنگار بوونەوەی خونچه تازه و پیرۆزەکانی سەر زەریاکه ، خونچەکانیش که ئەو هەواڵەیان بیست له داخا به تیشکی ڕۆژ پێناسەیەکیان بۆخۆیان کرد .

مرۆڤەکان به پیاده کەوتبوونه ڕێ بۆ بەرەنگاربوونەوەی توندوتیژیەکان . توتیەکانی فێرگەی گەورەش بەردەوام تاوانیان بەرامبەر به جڤاك دەکرد ، تووتیه بچوکەکانیش لەناو خاکدا بڵاوبوونەوە ، بەره بەره جڤاکیش پشتی بەو جۆره مرۆڤانه دەبەست ، بۆیه لەکۆتایی بوون به دڕك و چوونه پێی منداڵه هەژارەکانەوە .

خۆشەویستی له گەشەکردندا بوو بۆ سامان و ئەستێرەی زێڕین ، بەڵام تووتیه گەورەکان ئەمەیان ڕەخساندبوو ، جڤاکیش بەرەو وێرانه دەڕۆیشت . سەرمایه پەرستەکانیش ببوون به ڕەشماری سینگ سوور ، شەمشەمەکوێرەش له شەودا دەنگی گریانی منداڵه هەژارەکانی دەگواستەوه لەم کێو بۆ ئەو کێو .

ئافرەتەکان ببوونه کۆیلەی بکوژەکان ، هەزاران بکوژ لەبەرامبەریان وەستابوون و داوای

خوێنیان دەکرد بۆ کرانەوەی بەختی هەواو ئارەزووەکانیان .    دایکیش بە منداڵەکانی دەووت تاوانکردن بلاَوبۆتەوە و سەراپای شار و دێهاتەکانی گرتۆتەوە .

مرۆڤەکان تەنیا لەکاتی مردندا گریانیان دەهات ، قاقای پێکەنینیش هێشتا تەڕ بوو لە گەروویاندا ،  لە کۆتاییدا گریان و پێکەنین بوون بە دووژمنی یەکتر .

وەرزی زستان هات و لوتکەی کێوە پیرۆزەکانی پڕکرد لە بەفر ، کێوەکان هێشتا داوای زیاتریان دەکرد بۆ ژیاننەوەی کانیاو و کاریزەکان . خونچەکان لەبەر بەفر نەبوون بە گوڵ و سەرمای زستان هەموویانی لەناوبرد ، دواتر قەدەکانیش ڕەشهەڵگەڕان و کۆلکەکانیان بەپێی داواکاری ئاسمان ماڵئاواییانکرد .

دایك لەو ناوەدا ئامۆژگاری منداڵەکانی دەکرد و دەیوت : لە هەموو کاتێکدا خۆ لە پەرش و بلاَوی بپارێزن ، چونکە شتەکان بە پەرش و بلاَوی نابن بە هیچ و ئەنجامیان نیە ، چونکە مرۆڤ ئارەزووەکانی تێر نەدەبوون ، هەربۆیە سنووری خۆی لەدەستدا . سەر زەوی وایلێهاتبوو کە هەموو کەسێك دەیتوانی ببێتە شازادە ، بەلاَم هەموو کەسێك نەیدەتوانی ببێتە پادشا ، چونکە پادشایەتی پێویستی بە بوونی توانای ڕەوشت و دادپەروەری و خۆ بەکەمزانیەوە هەبوو ، ئەمانەش لە هەموو مرۆڤەکاندا بوونی نەبوو .

منداڵێك لەولاوە ئامۆژگاری پیاوێکی نەخوێندەواری دەکرد و دەیوت : زانینی هەستەکانی مرۆڤ تەواوکەری زانینەکانی هۆشیەتی ، چونکە هۆشی مرۆڤ وەك پادشایەك وایە و هەستەکانیش وەك ڕاوێژکارن بۆی ، هەروەها هۆش بۆتە پایتەختی هزرینەکانی مرۆڤ . هەربۆیە ئەوە ڕوونبۆوە ، کە میهرەبانی مرۆڤەکان پەیووەندی بە ئایینەوە نەبوو ، بەڵکو میهرەبانی پەیووەندی بە دڵی مرۆڤەکان خۆیانەوە هەبوو ، بەلاَم مرۆڤەکان هیچ تایبەتمەندیەکیان بۆ دڵ نەهێشتبۆوە . بۆیە نەفامەکان هۆکارەکەیان بۆ نەبوونی پەروەردە دەگەڕایەوە ، هەربۆیە لە کۆتاییدا لە هیچ شتێك تێنەدەگەیشتن و نکۆڵیشیان لە بیرۆکە هەڵەکان دەکرد .

فرووزە ، لە سەردەمی لاویمدا و لە شەوێکی هاویندا ، هەستام و لە ماڵەوە چوومە دەرەوە . چووم بۆ لای داپیرەم . لەگەڵ داپیرەم دانیشتین هەتا نزیك سپێدەی بەیان . هێشتا خۆر سەری وەدەر نەنابوو ، یەکێك لە کۆیلەکانی کۆشکی پادشا هەڵسابوو لە خەو ، لەو کاتەشدا بایەکی بە

**هێز بەناو کۆڵانەکاندا دەهات و دەنگی کۆیلەکەی دەگواستەوە بۆ ناو پەنجەرەی ماڵی داپیرەم .**
**لەو دەنگەشدا وا دەردەکەوت کە ئامۆژگاری منداڵێك دەکات کە ئەو منداڵەش کچە پادشایەکە ، دەنگەکەش جار جارە نەدەما و جار جارەش دەهاتەوە بەر گوێیەکان ، بەڵام داپیرە لە دەنگەکە دەگەیشت .**
**داپیرەم دەیوت ، کۆیلەکە بەو منداڵە دەبێژێت ؛ مرۆڤەکان پێش ئەوەی دەسەڵات وەرگرن پێویستە پەروەردە ببینن لەناو هەژارەکاندا ، چونکە تەنیا هەژارەکان دەتوانن نەهامەتیەکانی جڤاك ڕوونبکەنەوە .**
**هەروەها دەبێژێ ؛ مرۆڤ بۆ هەموو هەنگاوێك پێویستە پەروەردەیەك ببینێت ، تاوەکو سەرکەوتن بەدەستبێنێ .**
**هەروەها دەبێژێ ؛ بێچووە گورگ پێشتر لەلایەن دایك و باوکەوە ڕاهێنانی پێکراوە هەربۆیە دواتر دەتوانێت هاوشانی ئەوان هەنگاو بنێت . هەروەها دەبێژێت ؛ مرۆڤ گەر پەروەردە نەبینێت ئەوا لە دواڕۆژدا دەبێتە دڕندەترین کەس لە دەسەڵاتدا .**
**دواتر وتم داپیرە ئەو کۆیلەیە چیتر بەو منداڵە دەبێژێ .**
**هەروەها دەبێژێ ؛ سیاسەت و ئایین دووژمنی یەکترن ، هەریەکەیان دەیەوێت ئەویتر بۆ خۆی بەکاربهێنێ ، چونکە سیاسەت لە ولاتێکدا تەنها تایبەتە بە جڤاکی ئەو لاتە خۆی ، بەلام ئایین لە ولاتێکدا تەنها تایبەت نیە بە جڤاکی ئەو لاتە خۆی ، بەلکو بۆ ولاتانی تریشە . لەگەڵ ئەوەشدا ئایین سنووری بۆ هۆشی مرۆڤەکان داناوە ، بەلام سیاسەت سنوور بۆ هۆشی مرۆڤ دانانێت ، هۆشی مرۆڤیش بەردەوام ڕۆژانە شتی تازە بەرهەم دێنێت و چارەسەری کێشەکانی ژیانیش تەنها لە هۆشدایە ، نەك لە یاساکانی ڕابردووی مرۆڤ .**

**– فرووزە تۆش کەمێك گوێیەکانت ڕادێرە با وەك منداڵە پادشایەك ئامۆژگاریت بکەم .**
**– هێشتا گوێم بۆ ئامۆژگاریەکانی تۆ ڕاگرتوون . فەرموو ئامۆژگاریم بکە .**
**– گەر لە ڕووناکیدا گۆرانی بۆ تاریکی بلێی ئەوا ژیان ئەوکاتە هەم بێواتایە و هەم پیری بەرۆکی گرتووی ، واباشترە تەنها کەمێك فکری لێبکەیتەوە نەك زۆر ، چونکە لەوانەیە شێتت بکات . تاونباری ڕاستەقینەش ئەو کەسەیە کە گریانی نایەت و هەوڵدەدات لە بەردەمی جڤاکدا**

فرمێسك هەڵڕێژێت ، خۆی بهێنێتە گریان ، چونكە مرۆڤی ڕاستەقینە هەموو كات لێواری مەرگ دەهێنێتە بەرچاوی خۆی و هەموو شتەكان بەتەنیا بۆ خۆی قۆرخ ناكات .

– ئەمە مانای چیە ؟

– واتا مرۆڤی باش هەموو كات لە خەمی مرۆڤەكانی تریش دایە و تەنیا خۆی بە مرۆڤ نازانێت ، بەڵكو كەسەكانی تریش بە مرۆڤ دەزانێت و هەوڵدەدات دادپەروەری جێگیر بكات لەناو جڤاكدا . ئەوەشت لەفكر نەچێت ، كە هەژارەكان بەزۆری تووشی ژێرپەنجەی هۆش دەبن ، بەڵام دەوڵەمەندەكان بەزۆری تووشی ژێر پەنجەی گەدە دەبن ، چونكە هەژارەكان هۆشیان ماندووە نەك گەدە ، بەڵام دەوڵەمەندەكان گەدەیان ماندووە ئەویش بەهۆی خواردن و خواردنەوەوە كە مافی كەسانی ترە .

ئەگەر مەڕەكان ترسنۆك نەبوونایە ، هەرگیز شوانەكان بێبەری نەدەبوون لە وەنەوز .

– لە مەبەستت تێناگەم ، ئایا مەبەستت چیە لەم وتەیە ؟

– گەر هاوڵاتیانی ناو جڤاك خۆیان ترسنۆك نەبن و هۆكاری ئەوە نەبن كە خاكەكەی خۆیان بفرۆشن ، ئەوا بێگانە ناتوانێت تەنیا بەسەردانیش بێە ناو وڵاتەكەیەوە . ئەوە خۆیانن زۆردار لە ناو جڤاكەكەی خۆیان بنیاددەنێن ، بەتایبەتی مرۆڤە بەرژەوەندی خوازەكان و دووڕووەكان و سەرمایە پەرستەكان .

– ئایا ئاوارەكان چ تاوانێكیان هەیە لە هاتنی دووژمن ؟

– ئاوارەكان زۆربەی كات لە ترسی كەسانی وڵاتەكەی خۆیان تووشی ئەمە دەبن ، زۆر بەكەمی لەبەر دووژمن ئاوارە دەبن ، بەڵام هەوڵمەدە بە ئاوارەكان پێبكەنی ، چونكە لەوانەیە ڕۆژێك دابێ تۆش تووشی ئەم ڕۆژەبی و كەس سەیرت نەكات تا داوای نانی لێبكەی ، چونكە زەوی لە سوڕاندایە و جڤاكەكانیش دەگۆڕێت ، ئەمەش ئەمرۆ ڕووی بۆ ئەو گۆڕاوە ، بەڵام لەوانەیە سبەی ڕووبكاتە تۆ .لەبەرئەوەی هەرگیز لاشەی مرۆڤ ناتوانێت بڕست و بژوون دیاری بكات ، بەڵكو ئەوە هۆشیانە دەبێتە پێوەری ئەم دوو ئاستە . لەوانەیە چاو زۆر شت ببینێت ، بەڵام هۆش زیاتر لەو دەتوانێت هەموو شتێك درك بكات . هەر لەبەر ئەمەشە چاونژێرەكان ناتوانن ببنە هەڵگری بیرۆكەی چاك وێژەكان .

ئەوەی نەتزانی و ویستت فێری ببیت ، بچۆ بۆ چۆڵەوانی و ئاگات لە هۆشت بێت تا خۆی

ئاشکرای دەکات ، چونکە هزرین لە چۆلەوانیەوە دەست بە کارەکانی خۆیدەکات . بۆ شتێکیش مەگری کە ڕوویداوە ، هەوڵدە بۆ شتێك بگری کە لە داهاتوودا ڕوودەدات ، واتە دوێنێ هەرچۆنێك بووبێت تازە ڕۆیشت ، بەلأم تۆ وانەی لێوەرگرە بۆ سبەی .
هەموو هەژارێك خاوەن خەونە ، چونکە بە هۆشیان پێی دەگەن . تەنها دەوڵەمەندەکان نەبن ، چونکە ئەوان بە چاو چێژ وەردەگرن . گەر ڕێگەیەکیشت بڕی ، هەوڵمەدە بەو ڕێگەیەدا بگەڕێیتەوە ، هەوڵدە ڕێگەیەکی نوێ بدۆزیتەوە بۆ گەڕانەوە ، چونکە لەوانەیە لە هەمان ڕێگە بۆسەت بۆ دانرابێت ، گەر واشنەبێت ئەوا شارەزای ڕێگەیەکی تر دەبیت لەسەر زەوی .
وا باشە لە پێش ماڵە هاوسێکەت بۆ براکەت بگری ، لە پێش شارەکەت بۆ هاوسێکەت بگری ، لە پێش وڵاتەکەت بۆ شارەکەت بگری ، چونکە چاکەکردن سەرەتا بچوکە و دواتر نەشونمادەکات .
بەپێی ئەو تەمەنەی کە هەمە و ژیانم زۆر بینی ، هاتوومە سەر ئەوەی کە بڵێم ؛ لەناو کەڵەکە بەردێکدا بژی زۆر باشترە لە کۆشکی پادشایەکی زۆردار . هەروەها کەسی چاڵ هەڵکەن هەم دویرە و هەم دەبەنگە ، هۆشی هەم شەکەتە و هەم بێژینکە .
هەموو کاتێ وەك برایەکانی خۆت چاو لە باخەڵی خەڵك بکە ، نەك وەك دوژمنەکانت .
هەروەها کە ئەرکێکت پێ سپێردرا ، لە بارەیەوە بهزرێ و ئەوکات بڕیاری بوون و نەبوونی لەسەر بدە ، چونکە بڕیاری ڕاستەوخۆ تاوانە دژ بە مرۆڤ و دژ بە شتەکانی تر .
لەهەر شوێنێکیش بووی ، ئەوەندە ڕێز لەو شوێنە بگرە کە هاوتای نەبێت .
– ئەی ئەمە واتاکەی چیە ؟
– لە هەر شوێنێك نانت لێخوارد و لەو شوێنە خەوتی ئەوا ئەو شوێنە ماڵی تۆیە ، بەلأم بەشێوەیەکی کاتیە ئەو ماڵە ، بەلأم ئەوەندەی لەو شوێنە دەمێنیتەوە هەوڵدە ڕێز و میهرەبانیەکەت بۆ ئەو شوێنە دیاربێت تا ئەو شوێنەش ڕێزت بۆ دابنێت .
هەندێك چارەسەر بە ئارامی دەکرێت ، هەندێکیش بە مەی و هەندێکیش بە گفتوگۆ ، هەروەها چاکەکردنیش هەر ئەوە نیە کە تۆ هەڵویستت هەیە بە زمان ، بەڵکو بریتییە لەوەی کە کردەوە و ئەنجامدانت دیاربێ بە بەرچاوی خەڵکەوە ، زۆرێك لە مرۆڤەکان هەوڵدەدەن خۆیان چاکەی خۆیان دەربخەن ، بەلأم پێوەری چاکە هەرگیز لەلای مرۆڤەکە خۆی نیە ، بەڵکو پێوەرەکەی لەلای مرۆڤەکانی ترە و لەلای ئەوان بڕیاری بۆ دەدرێت و دەستنیشاندەکرێت .

– چۆن هەژار بوونی مرۆڤ سەرهەڵدەدات ؟

– هەژار بۆیە هەژارە ، چونکە ڕەوشتی پێ باشترە لە سامان و ناوبانگی سپڵەیی ، لەوانەیە هەژارەکان بتوانن کۆمەڵێك کار ئەنجام بدەن کە سوودی گەورەی هەبێت بۆ ئەوان ، بەڵام دەزانن کە بەو جۆرە کارانە ڕەوشتیان لەکەدار دەبێت ، هەربۆیە خۆیانی لێ دوور دەخەنەوە .

هەردەم مرۆڤێکن دەیانەوێت لەگەڵ مرۆڤەکانی تر یەکسان بن ، نەك بەرزتر ، چونکە خۆ بە بەرز زانین ڕیسوایان دەکات لەناو جڤاك و کەسە نزیکەکانیان ، هەروەها ئەوە لووت بەرزەکانن کە تەنیا ڕۆژێك هاوڕێکانیان دەناسن و لە دووەم ڕۆژدا نەیانبینیوون .

زانست لە زۆر گەڕاوان وەرگرە ، نەك لە زۆر نووستوان ، چونکە ژیان بۆ ئەو کەسانە ئەزموونە کە گەڕیدەن و سروشتیان زۆر بینیووە ، ئەوانەش زیاتر پەروەردە و ئامۆژگاریان لایە کە زۆر گەڕیدەن نەك ئەوانەی کە نووستووی ناو دیوەخانن و تەنیا بۆ نان خواردن بەخەبەردێن .

هەر لەبەر ئەوەش هاوڕێیەتی کەسێك مەکە کە توانای ئەوەی نەبێت نهێنیەکانت بپارێزێ ، چونکە ژیان خۆی نهێنیەکی کاتیە بۆ مرۆڤەکان .

تاوانبار ناتوانێ ڕۆژی تاوانەکانی تاسەر بشارێتەوە ، چونکە تاوان ئەگەری ئاشکرا بوونی زۆر نزیکە و لە کاتدا هاوشانی درۆیە ، لەبەر ئەمەشە کە تاوانباران هەموو کات سەرشۆڕن ، چونکە ئەو کەسانە نین و دەڵێن هەین ، نەزانن و دەڵێن زانااین ، کۆیلەن و دەڵێن ئازادین ، هەروەها کار ناکەن و بەخشش وەردەگرن لە کەسانی تر ، مرۆڤ پێویستە خۆی بپارێزێت لە بڕیاری ناڕەوا و بێ مانا ، پێویستە ڕەچاوی شتەکان بکات و ئەوکاتە خۆی یەکلایی بکاتەوە بۆ بڕیاردانەکانی ، کاتێکیش کە دەتەوێت لە شتەکان بکۆڵیتەوە ئەوا بزانە کە وشەی - چۆن - لە تێڕامانێکەوە سەر هەڵدەدات ، - چی - ش لە هۆکارەکانەوە دێتە بەرچاو ، - بۆچی - ش لە دوای پەشیمانی و چاوەڕوانی دەردەبڕدرێت .

– ئەمە زیاتر پەیووەندی بە سیاسەتەوە نیە ؟

– تەواو پەیووەندی پێوە هەیە . گەر سیاسەت لە وڵاتێکدا لە پێناو هەژاراندا نەبوو خۆی لێ دوورخەوە ، چونکە دواتر دەوڵەمەندەکان خۆ دەکەنە خاوەنی ، چونکە هەموو کاتێك سەرمایەدارەکان جێگەی ڕێزن و خاوەن نێشتگەن ، هەروەها ئەوانەشی کە سەرمایەدار نین تەنیا دەبنە خاوەنی وتەی فەرموو ، بەڵام تۆ گرنگی بە کەسانێك مەدە کە خۆیان گرنگی بە

خۆیان نادەن ، چونکە ئەوانە خۆیان هۆکارن بۆ نەزانین ، هەربۆیە دواتر گرفتیان بۆ درووست دەبێت . هەموو کاتێکیش سیاسەت دوورە لە ڕاستی ، مرۆڤەکانیش بەردەوام بەبێ ئاگا سەرچۆپی بۆ دەگرن و هەرای لەپێناودا دەکەن ، ئەمەش دەبێتە هەلێك بۆ ئەو کەسانەی کە جڤاك بە گەمژە لەقەڵەم دەدەن و دەیانەوێت بەم جۆرە مرۆڤانە نیشتگەیەك بنیاد بنێن .

– من تەنها کەمێك لە مەبەستەکانی تۆ تێدەگەم ، چونکە تۆ ئەزم هەیە و منیش تەنیا کەمێك ئەزموونم هەیە لەو شتانەی کە تۆ باسیان لێوەدەکەی .

– ڕاستە ، بەڵام منیش سەرەتا وەك تۆ بووم ، بەڵام دواتر ئاشنایەتیم لەگەڵ ئەزموونی زۆر پەیداکرد ، هەروەها هەتا ئێستا کە سەر و ڕیشم سپی بووە کەسێکم نەبینی بۆ مرۆڤ بوون هەوڵبدات ، بەڵکو ئەوەی بینیم بۆ بەرژەوەندی خۆی و سك تێرکردنی خۆی هەوڵی دەدا ، بەتایبەتی ئەمەش لە کەسانێکدا بە ڕوونی دیارە کە دەیانەوێت بەزۆر خۆیان بەسەر کەسانیتردا بسەپێنن ، ئەمانەش خۆیان بێ ئەزموونن و تەنیا ئەزموونی لووت بەرزیان هەیە .

– ئێستا کەمێك دەتوانم لە مەبەستەکانت تێبگەم ؟

– زەردەخەنەی منداڵە هەژارەکان زۆر جوانتر بوو لە قاقای پێکەنینی منداڵە دەوڵەمەندەکان . مرۆڤەکان زوو دەچوونە ژێر باری وتەی کەسێك ، بەڵام فکریان لەوە نەدەکردەوە کە لەوانەیە ئەو وتەیە بۆ ناپاکی بێت و جوانی ڕەوشتیان نەهێڵێ . هیچ ترین مرۆڤیش ئەو کەسانە بوون کە توانای هیچ شتێکیان نەبوو و هەوڵیاندەدا شتەکان بکەن بە هی خۆیان ، هەروەها بەبێ داواکردنیشیان دەهاتنە ناو باس و خواستەکانەوە .  هەژارەکانیش خۆیان هۆکار بوون بۆ دروستکردنی نیشتگەی زۆردار ، چونکە بەبێ فکرکردنەوە پێی نیشتگەکەیان لە پۆلاً بنیاد دەنا .

دەسەڵات تەنیا بۆ ئەوانە لە کولێندا بوو کە خاوەنی سەرمایەی زۆر بوون لەسەر زەوی  نەك ئەوانەی کە خاوەن ئەزموونی زۆر بوون لەسەر زەوی ، بۆیە خاك هەردەم لەگریان بوو ، چونکە چاکسازی لەلایەن کەسێکەوە پێویست بوو بکرێت کە لە هەژارەکان هەژارتر بێت ، نەك لە دەوڵەمەندەکان دەوڵەمەندتر . بۆ ئەمەش بوو کە مرۆڤ لاشەی بەند دەکرا و سوکایەتیشی پێدەکرا ، بەڵام گەر خۆی هۆکار نەبوایە ئەوا نەدەتوانرا هۆشی بەند بکرێ و سوکایەتی پێبکرێت .

**خوێن شتێك بوو لە لاشەی هەموو زیندەوەران دەهاتەدەر ، بەڵام ئەزموون شتێك نەبوو لە لاشەی هەموو زیندەوەران بێتەدەر ، تەنیا لە هۆشی مرۆڤدا بوونی هەبوو . بەڵام مرۆڤ لە بنەڕەتدا ئازاد بوو ، بەڵام خۆی ئازادی لە خۆی زەوتکردبوو ، هەموو کاتێکیش کەسە لاوازەکان خۆیان بە بەرز دەزانی ، بەڵام لای خەڵکی هەموو کاتێ گەمژە بوون .**

**هەژار مردنی لەلا باشتر بوو لەوەی کە دەستی پانبکەنەوە لە دەروون نزمەکان . دڵی مەیخۆرەکانیش بەردەوام لە فڕیندا بوو بۆ میهرەبانی ، ژیانیش هەوڵیدەدا زوو لەناوییبەرێت.**

**مرۆڤەکان وەك مێروولەکان لە داکردنی ساماندا چاویان پڕ نەدەبۆوە ، بەڵام لەپڕ باران بەسەریاندا دەباری و خۆیان و سامانەکەشیانی لەناو دەبرد .**

**– ئایا تۆ چ هەڵوێستێکت بۆ درووستبووە لەو ماوە زۆرەی کە ژیان مەودای پێداوی و بەپێی ئەو ئەزموونە زۆرەی کە هەتە ؟**

**– لە منداڵیەوە دژە سەرمایەم لە پێناو هەژارەکاندا ، بەڵام نازانم دوورکەومەوە لەو بیرۆکەیەم یان خۆم بکوژم ، چونکە ژیانی ناو جڤاکێکم ناوێت کە مرۆڤەکان تێیدا بە یەکسانی لەدایك بن ، بەڵام بە نایەکسانی تێیدا بژین و بمرن .**

**هەموو کاتێکیش لە دوو کەس دەترسام : یەکێك کە تەواو بەرگری لە ئایین دەکرد . یەکێکیش کە تەواو دژایەتی ئایینی دەکرد ، چونکە هەردووکیان لە کۆتاییدا هەڵدەگەڕانەوە و بیرۆکەکانی خۆیان ڕیسوا دەکرد لەبەرچاوی کەسانی تر ، بەڵام ترسم لە مامناوەندیەکە نەبوو ، چونکە هیچیانی بە توندی وەرنەدەگرت و خۆشی لە هەردووکیان دەپاراست ، دواتریش کەسێکی سزاوار و کەرپەککاری لێ دەردەچوو .**

**فرووزە تا دەهات نائارامی دایدەگرت ، لەگەڵ نائارامیەکەی ئەویشدا ژێر زەویەکان زیاتر نهێنیەکانیان دەدرکاند ، لە دەمەو ئێوارەدا زەوی بەرە بەرە مۆمەکەی دەتوایەوە و تۆزی بیابانیش بەری هەناسەی فرووزەی گرتبوو ، بۆ فرووزەی داماو گۆڕێکی چەند بستی باشتر بوو لە کۆشکێکی سەر زەوی و ژێر دەستەی سوارچاکی ئەفسووناوی .**

فرووزە لەگەڵ وەدیارکەوتنی خۆر ، بەرەو پیدەشتەکانی دەوروبەری خۆی کەوتە ڕێ ، لاوێکی پۆشاك دڕاوی گوڵ بەدەست بەرەو ڕووی هەنگاوی دەنا ، ئەم بەڕێوە و ئەویش بەڕێوە تا نزیکی یەکتر بوونەوە ، بەشێوەیەك سەیری یەکتریان دەکرد کە دەتووت هیچ کامێکیان مرۆڤیان نەبینیووە .

فرووزە لە شوێنی خۆی دانیش ، ئەویش هاتە تەنیشی و ماوەیەك دانیشت .

پاش چەند چرکەیەك سڵاوکردن لەنێوانیان دەستپێکرد .

– سڵاو .

– سڵاو .

– ناوی بەڕێزت ؟

– فرووزە .

– منیش ڕەشەن .

– ڕەشەن ، بۆچی ئەم ڕێگا چۆڵەت گرتۆتەبەر و داماوی سەرتاپای گیانی داگیر کردووی ؟ هەروەها بۆچی پۆشاکەکەی بەرت دڕاوە ؟

– لەو کاتەدا کە ڕێژنەیەك باران باری و پەڕەی گوڵەکانی هەموو هەڵوەراندن ، منیش لەبەر خاوەن باخەکە نەمتوانی بچم بەرەو پیریان و پەڕەکانیان هەڵگرمەوە ، چونکە دواتر تاوانبار دەکرام بە هێرشکردنە سەر گوڵەکان ، هەورەکانیش بە تووڕەییەوە بەرەو ڕۆژئاوا دەڕۆیشتن ، بەڵام هێشتا رك و کینەیان بەرامبەر بە گوڵەکان مابوو . ئەوەندەی پێنەچوو ئاگاهی هات بۆ ماڵە هاوسێکانم کە هەرچی زووە خۆیان کۆبکەنەوە و بەرەو بناری چیاکان وەڕێکەون ، چونکە بە خەڵکەکەیان وت کە لە شەودا تۆفان هەڵدەستێ و ناوچەکە دادەپۆشێ .

منیش کەمێك پێکەنین دایگرتم و وتم ؛ خۆ هێندەی تۆفانەکەی نوح نابێت . من لێرە ناڕۆم و چاوەڕێی ئەو تۆفانە دەکەم کە لە شەودا بەرەو ناوچەکەمان دێت . یەکێك لە ژنەکانی دەوروپشتمان دەستیکرد بە پاڕانەوە و وتی ؛ هەرچی زووە تۆفانەکە بگاتە ئێرە و ناوچەکەمان دابپۆشێ ، منیش هۆشسام بووم لەو جۆرە پاڕانەوەیە . وتم ئاخۆ بۆچی دەبێت بەم شێوەیە ڕووبکاتە ئاسمانەکان و ئەم داواکاریە هەڵبژێرێت . دواتر بۆم دەرکەوت کە هیچی نیە لەماڵەوە تاوەکو بیبات لەگەڵ خۆیدا ، خەڵکەکەش سەرقاڵی ڕۆیشتن بوون و ماڵەکانیان چۆڵدەکرد .

منیش بەبێ ئەوەی خۆم بشڵەژێنم چووم بەرەو ژوورەوە و سەبیلەکەی باوکم هێنا و دامگیرساند . دواتر چوومە بەردەمی دەروازەیماڵەوە و ڕاوەستام ، لەگەڵ ئەوەشدا کە پێکەنینم دەهات بە ئاگاهیەکە کەمێکیش دەترسام کە ئاگاهیەکە وەڕاست بگەڕێ ، هەربۆیە خۆم ئامادەکردبوو کە هەر لەگەڵ بینینی تۆفانەکە بەرەو لای خەڵکەکە ڕابکەم ، بەڵام تا دەهات زیاتر پێکەنین دایدەگرتم ، چونکە وا فکرم دەکردەوە کە لەوانەیە پلان بێت و بیانەوێت ماڵەکان تالأن بکەن ، منیش بۆیە زیاتر سووربووم کە بمێنمەوە . کات گەیشتە نیوەی شەو و تۆفانەکە هەر نەگەیشت ، ماوەیەك بەبێ دەنگی لە پەنا دێوارێکەوە دانیشتم و سەبیلەکەشم کوژاندەوە ، پاش چەند دەقیقەیەك گوێم لە دەنگە دەنگی خەڵك بوو ، وامزانی ئەوە خەڵکەکەن بەرەو ماڵەوە دێنەوە ، بەڵام کە هەستام بینیم کە چەند کەسێکن ماڵ بە ماڵ دەگەڕێن و خەریکی تالأنکردنن ، هەرچی زوو بوو خۆم گەیاندە لایان .

وتم ؛ بووەستن . ئەوانیش هەر لەگەڵ بیستنی دەنگی من هەموو شتەکانیان بەجێهێشت بێجگە لە پەنجەی مرۆڤەکان ، چونکە پەنجەکان ئاسان بوون بۆ هەڵگرتن و خستبوویاننە ناو گیرفانەکانیانەوە ، دواتر بۆم دەرکەوت کە ئەو ئاگاهیە هی جەردەکانە و هی کەشناسی نیە .

دواتر چووم لە ناوەڕاستی کۆڵأنەکە ئاگرێکم کردەوە و چوومەوە ماڵەوە ، ئەو شەوە بە ئارامی لێی خەوتم و گوێم بە هیچ شتێك نەدا ، جەردەکانیش لەبەر بینینی ئاگرەکە نەیانتوانی بێنەوە بۆ ئەو شوێنە . بەیانی بۆم دەرکەوت کە ، مرۆڤ نابێت باوەڕ بە ئاگاهی بەپەلە بکات ، چونکە لەوانەیە مردنی بەپەلە بەدوای خۆیدا بهێنێت و چرا ڕەشکەی سەر پەنجەرەکەی هانبدات بۆ گڕتێبەردانی ماڵەکەی ، چونکە هەموو ئاگاهیەك هۆکارێکی لەپشتەوەیە ، درووستکردنی ئاگاهیش پێویستی بە پلانی تۆکمە و ئەزموونی تەواو هەیە ، دواتریش پێویستی بە کەسێکی تۆکمە و لێزان هەیە تاوەکو ئاگاهیەکە بە تەواوەتی بە مرۆڤەکان بگەیەنێت . من ئەو کاتە فکرم لەوە نەکردەوە کە چرا ڕەشکەکەم بکوژێنمەوە ، بۆیە ئاگر کەوتە ناو ماڵەکەم و جل و بەرگەکانی منیشی لەگەڵ خۆیدا برد .

دواتر پۆل پۆل خەڵکی گەڕانەوە بۆ ماڵەکەی خۆیان ، لەکاتی گەڕانەوەدا کچە شۆخەکانی ناو شار خۆیان پۆشتە کردبوو و دەم و چاوی خۆیان داپۆشیبوو تاوەکو خەڵك نەیانبینێ ، ئەمەش کلتوورێك بوو هەرچەندە کە هی خۆمان نەبوو بەڵکو بە زۆر و زۆرداری بۆمان مابۆوە ، بەڵام

سەد کەس لەوان نەدەگەیشتن بە کەسێکی قژ زەرد لە دوپریدا ، بەردەوام فکرم لە کەنار دەریاکان دەکردەوە . لەپڕ فکرەیەکم بۆ هات و تەواو دڵنیا بووم کە ، تێگەی ئازادی تەنیا لە نووسراوەکانی ئایینداا نیە ، بەڵکو هۆشی هەموو مرۆڤێك خاوەنی تێگەیەکی ئازادیە و تایبەتە بە ئەزموونی هۆشی خۆی . زیاتریش فکرم لەوە دەکردەوە گەر مرۆڤ خاوەنی کۆمەڵێك شت نەبێت کە تایبەتە بە خۆی ، هەروەها گەر هەموو ئەو شتانەی کە دەیانزانێت بەهۆی هۆشی خۆی پێیان نەگەیشتبێت و نەیکردبن بە ئەزموون ، ئەوا هیچ جیاوازیەکی نیە لەگەڵ ئاژەڵەکانی تردا ، من و تۆ قەبارەی هۆشمان جیاوازە ، هەروەها سندووقی زانیاریەکانیشمان لە ڕووی شێوەوە و قەبارەوە جیاوازە ، کەواتە من و تۆ ئاژەڵێکی هۆشمەندین و هەریەکەمان خاوەنی جۆرە ئەزموونێکین کە تایبەتە بە خۆمان ، گەر هەموو مرۆڤەکان خاوەنی یەك جۆرە ئەزموون بوونایە و جیاوازیان نەبووایە ، ئەوا هەموو مرۆڤەکانیش دەبوو لەناو ئاودا مەلەوان بوونایە و هیچیان لەناو دەریاکاندا نەخنکابان ، من و تۆ لەناو لیتەی کەنار دەریاکان پیاسەیەك دەکەین ، دواتر ئاوڕ دەدەینەوە بۆ دواوەی خۆمان ، لەوکاتەدا دەبینین کە شوێنەواری پێیەکانمان جیاوازە ، ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت کە هەریەك لە ئێمە خاوەنی جۆرە ڕۆیشتنێکین ، من پێیەکانم ڕاست داناوە و بەڕاستی بەڕێگادا ڕۆیشتووم ، بەلاّم تۆ پێیەکانت بە هەڵە داناوە و بەهەڵە بە ڕێگاکەدا ڕۆیشتووی ، ئەمەش وادەکات کە هەریەك لە من و تۆ شوێنەواری پێیەکانی خۆمان بدۆزینەوە بەهۆی هەستی بینینەوە .

– کەواتە هەریەك لە ئێمە خاوەنی بینینی تایبەت بە خۆیەتی و هەریەك لە ئێمە خاوەنی وێنایەکی تایبەت بە خۆیەتی .

– ئیدی فرووزە ، گەر مرۆڤی چاو شین ناپەسەند بووایە ، هەروەها هەموو مرۆڤەکانیش چاویان شین بوویایە ، ئەوا زەوی دەبوو بە ئاوەردگا و نەفرەتی لێدەکرا . گەر مرۆڤی چاو ڕەشیش پاك و پیرۆز بووایە ، هەروەها هەموو مرۆڤەکانیش چاویان ڕەش بووایە ئەوا زەوی دەبوو بە بەهەشت و هیچ پێویستی بە بەهەشتێکی تر نەدەکرد تاوەکو لێپرسینەوە لەگەڵ مرۆڤەکاندا بکرێت . لەناو هەردووکیشیاندا خۆشبەختترین کەس ئەوەیە کە خۆی ئاشکرا بکات پێش ئەوەی ئاشکرای بکەن . هەر کاتێ کە لە چیاکانم دەڕوانی بۆم دەردەکەوت کە چیاکان هەندێك لە مرۆڤی کوڵکن دەچن و هەندێکیشیان لە مرۆڤی کۆسە دەچن ، هەندێکیشیان لە

**مرۆڤی سپی پێست دەچن و هەندێکیشیان لە مرۆڤی ڕەش پێست دەچن ، دواتر هەندێکیان وەك ئافرەت خۆیان دەنواند و هەندێکیشیان وەك پیاو ، چونکە ئەوەی کە وەك ئافرەت خۆی دەنواند کانیاوی زۆری تێدا بوو ، بەردەوام چواردەوریشی سەوز بوو . ئەوەشی کە وەك پیاو خۆی دەنواند ، هیچ کانیاوێکی تێدا نەبوو ، بەردەوامیش چواردەوری وەك بەردەلآن وابوو ، تەنانەت ئاژەڵەکانیش پێی ڕازینەبوون کە بەسەریدا تێپەڕ ببن ، لەو ناوەشدا لەناو هۆشمدا فکرەیەك سەریهەڵدەدا .**

**– چ فکرەیەك ، ڕەشەن ؟**

**– ئەو فکرەیەی کە پێیوابوو ، مردن باشترە لەوەی کە بە شەرمەزاری بژیت و هەموو ڕۆژێکیش بەم ئازارەوە سەربنێیتەوە . دواتر ئارەزووەکانی لاشەم لەگەڵ هۆشمدا مامەڵەیان دەکرد و زانیاریەکی گشتیان بنیاد دەنا کە دوور بوو لە زانیاری تایبەتی ، بەلآم جێبەجێکردنی کارەکە دەکەوتەوە سەر لاشە و نەخشەکەش لەلایەن هۆشەوە دادەڕێژرا ، هۆشم دەبوو بە فێرعەون و ئەندامەکانی لاشەشم دەبوون بە کۆیلەکانی فێرعەون ، لەمەشەوە بۆم دەرکەوت کە ، زانینی هەستەکانی مرۆڤ تەواوکەری زانینەکانی هۆشیەتی ، چونکە هۆشی مرۆڤ وەك پادشایەکی زۆردار وایە و هەستەکانیش دابەش دەبن بەسەر دوو بەرەدا ، بەرەیەکیان دەبن بە ڕاوێژکار بۆی و بەرەیەکیشیان دەبن بە کۆیلە بۆی . لەگەڵ ئەوەشدا فکرم لەوە دەکردەوە کە ئەگەر بێت و هەستەکان نەبن ئەوا هۆش بەتەنیا ناتوانێ شورای کۆشکی خۆی بنیاد بنێت ، ناشتوانێ فەرمان بەسەر لاشەی کەسێکی تردا بکات ، چونکە هۆشی مرۆڤ بەهۆی لاشەی تایبەت بەخۆیەوە دەتوانێ کارەکانی خۆی بگەیەنێت بە ئامانج . پادشاش بەهەمان شێوەی هۆش وایە و جگە لە جڤاکەکەی خۆی ناتوانێ ببێتە پادشای هیچ شوێنێکی تر .**

**– هەموو کەسێك دەتوانێت زانین پەیدا بکات . بەلآم هەموو کەسێك دەتوانێت ببێتە پادشا ؟**

**– هەموو کەسێك دەتوانێت ببێتە شازادە ، بەلآم هەموو کەسێك ناتوانێ ببێتە پادشا ، چونکە پادشایەتی پێویستی بە بوونی توانای هۆشی کەسێك هەیە کە زانینەکانی هۆشی ئەو کەسە لەگەڵ زانینی هۆشی کەسەکانی تردا گونجاو بێت ، هۆشی ئەو کەسەش خاوەنی کۆمەڵێك تایبەتمەندی وەك ڕەوشت و دادپەروەری و ئازادی بێت و خۆی بەکەم بزانێت لە ئاستی زانیاریەکاندا .**

– کەواتە ژیانیش دابەشکراوە .

– ژیان وەك بایەك وابوو لەبەرچاوانم و لەپڕ دەهات و دەڕۆی ، هەر ڕۆژەو خۆی دەگەیاندە ماڵی مرۆڤێك ، یان تووشی گریانی دەکرد یان دەیهێنایە پێکەنین ، بەڵام ئەوە مرۆڤە هۆشمەندەکان بوون کە دەیانتوانی ئارامبگرن و خۆیان وەك کەسێکی ژیان نەدیوو نیشانی کەسەکانی تر نیشانبدەن ، خۆ منیش هەمان فکرەی ئەوانم هەبوو سەبارەت بەم ڕۆژگارە ڤێزەونەی کە لە وڵاتەکەماندا بەرۆکی گرتبووین ، تەنیا سك تێرەکانی چواردەوری پادشا لەخەمی ئەمڕۆدا بوون و هەرگیز نەیاندەتوانی وێنای داهاتوو بکەن ، ئەمەش بارگرانیەك بوو کە کەوتبۆوە سەرشانی پیرەژنە شەکەتەکانی لادێ . لەمەشەوە توانیم پنتێك لەو دۆخە کاتیە فێرببم کە بە هۆشمی دەوت ، مرۆڤ لەگەڵ ئەوەی پێویستە بزانێت کە دەژی ، ئەوا پێویستە کە بشزانێت کە هەر دەبێت بمرێت . ئێ خۆ ئەمە وتەی ژیان خۆی بوو کە بە منی وت ، ویستی ئاگادارم بکاتەوە لەو شتانەی کە بەبێ ئەوەی ئاگاداربن لەدایك دەبن ، هەروەها دەمرن بەبێ ئەوەی کاتی ماڵئاوایيیان بزانن ، بەڵام بێچووە ڤرژاڵەکانی ناو سکی دایك هەر سوور بوون لەسەر ئەوەی کە بێنە ناو دنیاوە ، دواتریش پۆل پۆل ڕووبکەنە بەردەم چۆمەکانی باخی وشك بوو ، ئێ خۆ سنۆبەرەکان پێویستیان بە ئاوی دەریا نەبوو ، چونکە لەگەڵ ئاوی باران خۆیان ڕاهێنابوو ، بەڵام سپینداره ناخ پووشووەکان چاویان پڕ نەدەبۆوە بە هەموو ئاوی چۆمەکان . بۆیە دواتر دەیانفەرموو هیچ ئاوێك نەبینراوە و خۆشمان تینوومانە ، گەر ئەوان داوای ئاو بکەن دەبێت سنۆبەرە هەش بەسەرەکان چ ئارەزوویەکیان بۆ ژیان هەبێت ؟ ئەمەش بەهانەیەك بوو تاوەکو بەشی خودی خۆیان و خودەکانی تریش بەتەواوی ببەنە ناو چاڵە تاریك و بێبنەکانی ناو سێگۆشەی بەرمۆدەوە . بەڵام سنۆبەرەکان زانیاریان نەبوو ، چونکە خۆیان نزیك نەدەکردەوە بۆ دۆستایەتیکردنی سپیندارەکان ، هەر لە دوورەوە دەیان خوێند و لاشەی یەکتریان بریندار دەکرد ، بۆ ئەمەش پەیامێکم بۆ سنۆبەرەکان نارد .

– چ پەیامێك ؟

– تێیدا نووسرابوو ، هەرگیز شتێك مەبێژە کە زانیاریت دەربارەی نیە ، چونکە ئەوکاتە وەك سەرۆکی تیپی مۆسیقات لێدێت بەبێ ئەوەی کە هیچ مۆسیقاژەنێکت لە چواردەور بێت . کوندەکان پێش ئەوەی زستان دابێت خۆیان کۆکردەوە و بەرەو ناو ئەشکەوتە سامناکەکان

وەرپێکەوتن ، بەهێوای کاتێکی خۆش بۆ دارکونکەرەکان ، دارکونکەرەکان گەمەیان دەکرد بە وشەی ماڵئاوایی ، کوندەکانیش ئەم وشەیان کردبۆوە سەری زمان و بنی زمانیان ، ئەمانە لە تیرەیەك بوون هەردەم بەدوای خۆراکدا دەگەڕان و تەنانەت نەیاندەتوانی لانەیەك بۆخۆیان دروستبکەن ، بەلاّم دارکونکەرەکان لە هەموو شوێنێك دەیانتوانی لانە بۆخۆیان دروستبکەن ، ئەو وشەیەش کە کوندەکان فێری ببوون هی خۆیان نەبوو ، بەڵکو بەرپێکەوت هاتبۆوە بەر گوێیەکانیان و بەردەوام دووبارەیان دەکردەوە ، لە وتنی ئەو وشەیەدا پێش چرکە ژمێر دەکەوتنەوە ، چونکە خۆشیان هەروا بزۆز بوون و ڕاوەستانیان نەبوو ، منیش وەك بەناو مرۆڤێك کێشەیەکم بۆ یەکلایی بۆوە کە کێشەیەکی فکری بوو ، بەلاّم هیچ سوودێکی بۆ سەرۆك هۆزەکان نەبوو ، سێ هەنگاو هەبوون بۆ ئەم کێشەیە ، ئەمانەش هەنگاوێك بوون لەناو هۆشی هەموو مرۆڤێکدا سەریانهەڵدەدا .

– هەنگاوەکانی هۆشت چی بوون ؟

– فرووزە هەنگاوەکان ئەمە بوون ؛

لە هەنگاوی یەکەمدا (وەرگرتن): بەهۆی هەستەکانەوە شتەکان وەردەگرین و بەش بەشیان دەکەین ، دواتر لەیەکتریان جیادەکەینەوە و ڕەوانەی هۆشیان دەکەین ، ئەمە سەرەتای ژیانە .

لە هەنگاوی دووەمدا (گومانکردن و جیاوازی): هۆش گومان لەو شتانە دەکات و دواتر پرسیار دەربارەی چۆنیەتی و چەندێتی ڕوودانی شتەکان دەکات ، ئەمەش ناوەڕاستی ژیانە .

لە هەنگاوی سێیەمدا (ئامانج): دەگات بە زانیاریەکان و ڕاست و هەڵەی شتەکانی بۆ ڕووندەبێتەوە ، ئەمەش کەمێك پێش ماڵئاوایی کردن لە ژیانە .

زیندەوەرانێك هاتبوون دەیانووت ئێمە مرۆڤین ، هۆشمان لەکاردایە و هەستیش بە شتەکان دەکەین ، بەلاّم نەیاندەتوانی بیرۆکەیەك دەرببڕن کە هی خۆیان بێت ، بەڵکو وەریاندەگرت و دەیانگەیاند ، ئەم شتانەشیان بە بیرۆکەی خۆیان لەقەڵەم دەدا ، لەگەڵ ئەوەشدا گاڵتەیان بە ئەوانە دەهات کە بیرۆکەیەکی تازەیان دەردەبڕی ، بەلاّم لەڕاستیدا ئەوانە ڕاست بوون کە بیرۆکەی تازەیان دەردەبڕی نەك ئەوانەی شتەکانی کەسێکی تریان دەگوازتەوە بۆ مرۆڤەکان و بە بیرۆکەی خۆیان دەزانی . مرۆڤەکانی تریش زانیاریان نەبوو تا بزانن ئەوانە ڕاستگۆن یان نا ، بۆیە کەللەی سەریان دەلەقاند و دەیانووت بەڵێ .

بەلاَم چ بەلَيَيەك ؟ ئەو بەلَيَيانەی مرۆڤەكان بەبێ زانیاری تاوانی گەورەی بۆ داهاتوو دەئافراند و هزری لاوەكانیان دەهێنایە سەر شێوەی هزرینی ئاژەڵەكانی تر ، خۆ من ئەوانەم دەزانی ، بەلاَم بە ڕەنگ لەلایان بووم هۆشیشم لەلای بیرۆكەیەكی تازە ئافرێنراو بوو ، هەروەها ئەوەشم دەزانی كە ، ژیان كورتە بۆ ئەوانەی دەیانەوێت تەنها بخۆن و لەسەر هزرینی كۆن بەردەوام بن ، بەلاَم ژیان بۆ ئەوانە درێژە كە دەیانەوێت بەشێوەیەكی تازەتر بهزرێن و لەو تازە هزرینەوە بگەن بە ئامانجی تازەتر ، هەروەها ژیانێكی تازە بهێننە ناو ئاوەردگای هۆشەوە . ئەمەش خۆی دەگەڕایەوە بۆ بێ پەروەردەیی ، چونكە هیچ لە مرۆڤەكان ناوی پەروەردەیان لێنەنرابوو ، بەڵكو تەنیا تۆزی پەروەردەیان بینیبوو لە دوورەوە ، ئەویش ڕەشەبای زۆردار لەگەڵ خۆیدا ڕایماڵیبوو ، كاتێك باس و خواستی پەروەردە دەهاتە ناو باسی كۆمەڵەی پیاو چاكانەوە دەیانووت ئەوە دارگۆچانەكەی بابە گەورەمانە و بە دەستكەوت بۆمان بەجێماوە ، ئێ خۆ پەروەردە دارگۆچانی بابە گەورە نەبوو . دەستكەوتی پێشینانیش نەبوو ، كاتێكیش كە دەمانەویست باسی بابەتێكی هزری بكەین ، هۆشمان دەیووت گەر پەروەردەتان بینی با تاوێك بێتە لام و دوو چاوە ڕەشە ونبووەكانی بۆ جارێكی تر ببینمەوە ، بەلاَم ئەملا بۆ ئەولا دەگەڕاین و نەماندەبینی ، دواتر خۆم هەوڵمدا فكربكەمەوە كە ئەو پەروەردەیە دەبێ چۆن بێت ؟ دەبێ بالآی چەندە بێت ؟ دەبێ ئاخاوتنەكانی چۆن بن ؟ دەبێ من بتوانم بیدۆزمەوە و خەبەر بدەم بە هۆش تاوەكو مزگێنی لێوەربگرم ؟ پەروەردە ببۆوە خۆشەویسترین هاوڕێی هۆش ، بەلاَم هۆش چەند جارێك هەوڵیدا پێم بناسێنێ ، بەلاَم داخەكەم خۆم ئامادە نەبووم تا لەرێگەی هۆشەوە بیناسم و جار جارە ڕاوێژە گورگانەی پێبكەم .

ڕۆژگارم هەنگاوی دەنا بەرەو پێشەوە و منیش هێشتا هەستم بەوە دەكرد كە پێویستیم بە پەروەردە هەیە ، بەلاَم لەكۆتاییدا توانیم بیناسم و هەردوو ڕوومەتەكانی ماچ بكەم . بەلاَم ئەوەی كە من فكرم لێكردبۆوە هەڵە بوو ، پەروەردە نە بالآی هەبوو وەك مرۆڤ ، نە ڕەنگی هەبوو وەك مرۆڤ ، هەروەها دووریش نەبوو لە هیچ مرۆڤێك تاوەكو نەتوانێت بیناسێ ، بەڵكو هەموو كاتێك ئامادەبوو لە نزیك هۆشی مرۆڤدا ، بەلاَم لەشێوەی سێبەرێك كە هەرگیز مرۆڤ نەیدەتوانی بیگاتەوە ، تا مرۆڤ هەنگاوێكی دەنا ئەو دوو هەنگاوی بەرەو پێشەوە دەنا ، بەلاَم خۆشبەختانە لەكۆتاییدا توانیم بیناسم و سەرجەم شتەكانی لێوە فێرببم ، لەمەشەوە بۆم

**دەرکەوت کە ، پەروەردە گەورەترین بنەمایە بۆ ژیانی زیندەوەرێك کە خۆی بە مرۆڤ بزانێت .**

**– پەروەردەکردن شتێکی زەرووریە ، ڕەشەن .**

**– پەروەردە پەیووەندی بە سەرجەم شتەکانی ناو گەردوونەوە هەبوو ، بەڵام سەرجەم شتەکانی ناو گەردوون کەمتەرخەم بوون بەرامبەری .**

**هەموو ڕۆژێك دۆستە نزیکەکانی پەروەردەم بانگهێشتی ماڵەوە دەکرد و تا درەنگانێکی شەو گفتوگۆم لەگەڵدا دەکردن ، بەیانیەکی زوو لەخەو هەڵسام و چەند نامەیەکم نووسی .**

**نامەی یەکەمم بۆ زیندەوەرەکانی کەنار دەریا نووسی ، کە تێیدا نووسیبووم ، بەسە .**

**نامەی دووەمم بۆ زیندەرەکانی ناو فێرگەی دەریا نووسی ، کە تێیدا نووسیبووم ، درووستیبکەن .**

**نامەی سێیەمم بۆ درووستکەرەکانی  کەشتی دەریا نووسی ، کە تێیدا نووسیبووم ، وێناگەری با نەمێنێت و تازەگەری سەراپای دەریا بتەنێت .**

**نامەی چوارەمم بۆ بەرپرسی دەریا نووسی ، کە تێیدا نووسیبووم ، ئاگاداربە چوار پای نیشتگەکەت لەبەردەستی ماسیەکانە و ئەگەری ئەوە هەیە هەر زوو هەڵبخلیسکێت .**

**نامەی پێنجەمم بۆ کڕیارەکانی ماسی نووسی ، کە تێیدا نووسیبووم ، ئەوە مافی خۆتانە .**

**نامەی شەشەمم بۆ فرۆشیارەکانی ماسی نووسی ، کە تێیدا نووسیبووم ، مافی ئەو مەفرۆشن بە ئەو ، هەروەها هی ئەمیش بە ئەم .**

**نامەی حەوتەمم بۆ سەوڵ لێدەرەکانی ناو کەشتی نووسی ، کە تێیدا نووسیبووم ، ڕەوشتتان کاریگەری لەدوای خۆی بەجێدەهێڵێت بۆ سەر نەوەکانی داهاتوو .**

**نامەی هەشتەمم بۆ شەپۆلەکانی دەریا نووسی ، کە تێیدا نووسیبووم ، تەنیا خۆتان نیشانی کەسانێکی تایبەتی مەدەن ، بەڵکو با هەموو کەسێك بە گشتی بتوانێ بتانبینێ .**

**نامەی نۆیەمم بۆ جێگری سەرۆکی دەریا نووسی ، کە تێیدا نووسیبووم ، ئەمشەو خەونم بینیووە کە تەمەنت بە تەمەنی چوارپای نیشتگەی سەرۆکی دەریاوە بەستراوەتەوە .**

**نامەی دەیەمم بۆ چارۆکەکانی کەشتیەکە نووسی ، کە تێیدا نووسیبووم ، ڕەشەبایەك لە بیابانەوە هەڵیکردووە و بەنیازە هێرشتان بکاتە سەر .**

**بەنیازبووم نامەی یازدەیەم بنووسم ، بەڵام خەو بەسەر چاوەکانم داهات و نەیهێشت تەواوی**

بکەم ، چونکە ئەو شەوە تا تارێك و ڕوونی بەیانی لەگەڵ پەروەردەدا گفتوگۆمان دەکرد و باسی چۆنیەتی و چەندێتی دەریاکانمان دەکرد . هەروەها باسی ڕابردوومان دەکرد . دواتریش دووربینەکەمان دەهێناو سەیری دەریامان کرد ، بەئاشکرا ئەوەمان دەبینی کە دەریا لەگەڵ مرۆڤدا ڕوویان لەیەکتر وەرگێڕاوە ، پەروەردە مرۆڤ نەبوو ، بەڵکو مرۆڤی دەناساند و درووستیدەکرد ، تێگەی ڕەوشت و دادپەروەری دەخستە ناو هۆشی مرۆڤەکانەوە ، دواتر فێری دەکردن کە چۆن لە ژیاندا کار بەو شتانە بکەن کە پەیووەندیان بە مرۆڤ بوونەوە هەیە .

مرۆڤ بوون لەسەر بوونی ڕەوشت و دادپەروەری و زانین و زانایی مرۆڤ وەستاوە ، نەك ڕووخسار و سەرمایەی مرۆڤ ، ڕەوشت دژی سەرمایەیە ، سەرمایەش دژی مرۆڤ بوونە ، پەروەردەش شارەزابوونە لە ڕەوشت و سەرمایە ، پەروەردە مرۆڤ گەورە دەکات وەك چۆن دایك شیر بە منداڵەکەی دەدات و خوازیارە کەسێکی پتەوی لێدەربچێت ، ئەو مرۆڤانەی کە بەبێ پەروەردە هەنگاو دەنێن بەرەو پێشەوە هەر زوو ڕێگاکەیان بەرەو کۆتاییەکی بێ ئەنجام تەواو دەبێت ، بەڵام ئەو مرۆڤانەی کە پێشتر پەروەردەیان بینیووە و دواتر هەنگاو دەنێن ، هەرچەند ڕێگەکەشیان دژوار بێت ئەوا دەگەن بە ئەنجام و دەگەن بە داهاتوویەکی ڕوون . ژیان مەودای بەو مرۆڤانە نەدەدا کە بەبێ پەروەردە دەیانوویست ببنە چاوکراوەی جڤاك ، ئەمەش تاوانی من و تۆ نەبوو ، بەڵکو تاوانی ئەوانە بوو کە بەبێ زانیاری قسەیان لەسەر داهاتووی جڤاك دەکرد . ڕابەری پەروەردە خۆشی پێویستی بە پەروەردە هەبوو تاوەکو مرۆڤەکان بەلای خۆیدا کێشبکات و ڕێگایەك بۆ زانینەکانیان دابنێت ، بەڵام پەروەردە خۆی ڕازی نیە بەوەی کە ئەو ڕێگایانەی پێویستن بۆ درووستکردنی پێگەی مرۆڤ سنووردار بکرێن ، پەروەردە سنووری بۆ نیە لەناو مرۆڤدا ، بەڵکو ئەوە یاسای چەند کەسانێکە سنووری بۆ داناوە ، هەرکاتێك من پەروەردەیەك دەبینم دواتر ژیانێکی نوێتر دەبینم ، ژیانێکی نوێتریش واتا مرۆڤێکی تازەتر و پڕ ئەزموونتر ، ژیانێکی پڕ هۆشمەندانە تر . ئەمەش وا دەکات مرۆڤ جیابکاتەوە لە زیندەوەرەکانی تر ، چونکە مرۆڤی نەزان واتا ئاژەڵێك بەناوی مرۆڤەوە ، گەر ئاژەڵەکان هۆشیان لەکاردابووایە و ئەزموونیان هەبایە وەك مرۆڤ ئەوا جیهانێکی تر لەناو گشت زیندەوەرەکاندا سەریهەڵدەدا ، ئەو جیهانەش دەبوو بە جیهانێکی پڕ لە ململانێتر و پڕ لە تاوانی زۆرتر لەناو گشت زیندەوەرەکان .

– کەواتە پەروەردە گۆڕانکاری گەورەی بەدواوەیە .

– بەڵێ فرووزە ، پەروەردە گۆڕانکاری بەسەر مرۆڤدا دەهێنێت . پەروەردە مرۆڤ لە بێئاگاییەوە بەرەو ئاگایی دەبات ، کەواتە پێویستە من و تۆ هەموو کاتێك پەروەردە بکرێین تاوەکو چەپەڵەکانی بەردەم جڤاك شەرمەزار بکەین ، چونکە بەهۆی ئەو پەروەردەیەی کە من و تۆ بینیومانە دەتوانین جیهانێکی پڕ لە ڕۆشن و چاو کراوەیی پێ بئافرێنین ، هەرکاتێك شتێکی باشمان ئەنجامدا ، ئەوا دیارە کە پەروەردەیەکی باشمان بینیووە ، پەروەردە هۆکارە بۆ گۆڕانکاریەکان ، ئەو گۆڕانکاریانەی کە مرۆڤ دەیکات بەهۆی پەروەردەوە بە ئەنجامێکی باش دەگەن و گۆڕانکاریەکانیش هەرچەندە لە پێناو ئامانجی تایبەتی بێت ئەوا هێشتا بەرژەوەندی گشتیشی لەگەڵدایە ، چونکە ئەو تایبەتیەتە بەپێی کات لەناو مرۆڤەکاندا گۆڕانکاری بەسەردادێت ، لەدوا کاتدا هەنگاوێك دەنێ و پەیووەندی بە گشتیەتیەوە هەیە ، ئەوکاتەش ڕوودەکاتە گشتیەتی . هەرچەندە مرۆڤەکان هەنگاو بنێن بەرەو تایبەتی ، ئەوا لە کۆتاییدا ئاراستەکەی بەرەو گشتیەتی دەڕوات ، جا مەبەستی بێت یان مەبەستی نەبێت .

– ڕەشەن ، ژیان هەروا هاتووە و هەرواش هەنگاو دەنێت .

– نا فرووزە . ئەوێ ڕۆژێ کابرایەك هاتبۆوە لام و دەیووت ژیان پڕیەتی لە مەینەتی سیاسی ، هەروەها پڕیەتی لە جەردەی سیاسی ، بەلاّم من پێمووت نا . ئەوانە من و تۆین . ئێمەش جەردە نین و ژیانیشمان پڕ نیە لە مەینەتی ، بەڵکو بە هۆشی خۆمان خۆمان دەکەین بە جەردە و ژیانێکی پڕ لە مەینەتی بۆ خۆمان دەئافرێنین ، چونکە من و تۆ کڕنووش بۆ کەسێکی نەفام دەبەین و دواتر دێوێکی سیاسی درووست دەبێت .

– پێموایە ئەو کاتەش لەناو دەروونی ئەو مرۆڤەدا خۆ بەرزی سەرهەڵدەدات ، بەلاّم گەر خۆڕاگر بین و کڕنووش نەبەین بۆ نەفامەکان ئەوا دێو تەنیا بە دەنگ بوونی دەبێت نەك بە ڕەنگ .

– فرووزە ، من و تۆ ئەو کەشە دەئافرێنین . من و تۆ هۆکارین بۆ درووستکردنی دێوێکی بۆر و زۆر خۆر ، کە بە هەموو ئاوی کانیەکانمان تینوویەتی ناشکێت ، ئەو سیاسەتەی ئێمەش ئاوەردگایەك بۆ داهاتوو جێدەهێڵێت و نەفامیەکەمان لە مێژوودا تۆمار دەکرێت .

ئاخ دونیا .

– چیتە ؟ خۆ تووشی داوی خۆشەویستی نەبوویت ؟

– نا فرووزە ، تووشی داماوێك بووم كە سیاسیەكان برسیان كردبوو ، منیش چووم كەمێك نانی سەر سێڵم بۆ هێنا ، بەڵام نەمزانی كە مشكەكان دزەیانكردۆتە ژوورەوە و هێرشیان كردۆتە سەر نانەكان ، لەوە دەترسم تووشی ژێرپەنجەی گەدە ببێت ، چونكە ئازارەكانی ئەم دنیایە تەنیا بۆ داماوەكان ڕێدەكەوێت و سەرمایەدارەكان گەر بێت و ژەهریش بنۆشن ئەوا بۆیان دەبێتە دۆشاوی ترێی دێمەكارەكان ، دواتریش لەلایەن سیاسیەكانەوە باس لەو داهێنانەیان دەكرێت كە چۆن ژەهریان كردۆتە دۆشاو .

– بەڵام ئەوانە نە ترێ دەشێلن و نە ئاردیش بە ئاوی ترێیەكە دادەكەن ، هەروەها نە ئاگریان پێدەكرێتەوە بۆ بنی مەنجەڵەكە و نە داریشیان پێدێت .

– بەڵێ فرووزە ، بەڵكو نەزانێكن و سیاسیەكان بۆ خواردنی باسووق و سجووق بانگهێشتیان دەكەن ، ئەو كاتەی كە دەگەنە شوێنی داوەتەكە دەچنە لای سەرەوە و چەند ڕۆژنامە نووسێكیش بۆ بینینیان بانگهێشت دەكەن ، دواتر نوكتە خۆشەكانیان دەنووسرێنەوە و كاری سیاسیان لەسەر ئەنجام دەدرێن و دەیانكەن بە یاسا دانەری وڵات ، ئاگر كەرەوەكانیش هەڵدەستن بە پاككردنەوەی پێڵاوەكانیان ، ئەو پێڵاوانەش لە پێڵاوەكانی ئەژدیهای دەم بە ئاگرین دەچن و ناوەوەی پێڵاوەكانیش وەك كیسەڵێك بۆنی خۆیان لەناو كۆ بوونەوە گرنگەكان بڵاو دەكەنەوە ، دواتر دەڵێن ئەوانە شایەنی ئەوەن كە بە خوری پەزەكان پێڵاوەكانیان بۆ پاكبكرێنەوە .

– ژیان بۆتە میدانی سیاسەت ، سیاسەتێك كە ئامانجی مرۆڤ لەناوبردنە ، نەك مرۆڤ پاراستن .

– سیاسەتێك كە لەپێناو چارەنووسی مرۆڤدا بێت ، هەمیشە شوێنی لەناو بەندینخانە تاریكەكانە و تەینا گریان دەچێت بۆ چاوپێكەوتن لەگەڵیدا . وەك چۆن ئەوكاتەی كە ڕۆژ هەڵدێت جیاوازە لەوكاتەی كە ڕۆژئاوا دەبێت ، ئاوهاش سیاسەت لەناو مرۆڤەكاندا بەپێی كات جیاوازە ، لەوانەیە سیاسەت وڵات بپارێزێ ، لەوانەشە وڵات وێرانبكات ، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ هۆكاری جیاوازی نێوان مرۆڤەكان .

لەبیرمە ئەو كاتەی كە وەرزی زستان هات و بە لێزمە باران بەسەرماندا دەباری ، سیاسیەكانیش هەستان بە گفتوگۆكردن لەسەر چۆنیەتی و چەندێتی بارانەكە ، بەڵام هەزاران

لادێی تریان لە فکر خۆیان بردەوە بەهۆی لادێیەکەی ئێمە ، ئێ خۆ لادێیەکەی ئێمە زۆریش گرنگ نەبوو بەلای ئەوانەوە ، بەلاّم خۆ دەبوو ماوەیەك هاولاّتیان سەرقاڵ بکەن بە وێنەکانی باپیرم کە چۆن کاتی خۆی برنۆی بەیەك دەست دەقاندووە و دەستەکانی نەلەرزیوون ، ئەمەش جوانمێریەك بوو بۆ داهاتوو سوودی بۆ ژێرەوەی کۆشکەکان هەبوو ، بەردەوام سەیری نامیلکە کۆنەکانی ناو سندووقە کۆنەکانم دەکرد ، جار جارەش ئاخێکم هەڵدەکێشا و دەمووت بۆچی ئەم نامیلکانە تا ئێستا نەسووتێنراون ؟

– ڕەشەن ، بۆچی ئارەزووت لەوە بوو کە نامیلکە کۆنەکانی باپیرەت بسوتێنرێن ؟

– ئەو نامانە ماوەیەك ولاّتیان سەرقاڵ دەکرد بە داستان و بەسەرهاتەکانی پێشوو ، کە هیچ کام لەم نامانە سوودێکی ئەوتۆیان بۆ داهاتوو نەبوو ، بەڵکو ماڵ وێرانیان بەدوای خۆیاندا دەهێنا و دەستکەوتەکانی ناو نامەکە ئاراستەکەیان بەرەو دەستکەوتی سەرمایە و بازرگانی دەگۆڕی .

ماوەیەك تێپەڕی ، بینیم کە سوارچاکە نان خۆرە باشەکان هاتنەوە بەرەو ولاّتی خۆیان ، داخۆ دەبێت چیان کردبێت ؟ ئاوها دەم بەخەندەن و دەستەکانیان بۆ هاولاّتیان بەرز کردۆتەوە و سەرقاڵی سلاّوکردنن ، ئەمەش خۆی لەخۆیدا فریودانێکی بە ئەدەب بوو تاوەکو هاولاّتیان دڵیان بەو بارودۆخە بێئاگاییە خۆشبێت ، سیاسەت لە هەموو کاتەکاندا ببۆوە وشەیەك کە بەردەوام لەسەر زاری ئەمەوە دەچوو بەرەو زاری ئەو ، بەلاّم نە ئەم و نە ئەو نەیاندەتوانی ببنە سیاسەتمەدارێکی سەرکەوتوو ، چونکە ئەوەی کە هەبوو پێشتر وترابوو ، تەنیا دووبارە دەوترایەوە ، شتی دووبارەش شەرمەزاریە بۆ مرۆڤەکان ، بەتایبەتی سیاسەتی دووبارە ، سیاسەتی ڕابردوو تایبەتە بە سەردەمی ڕابردوو خۆی ، چونکە کاتەکەی وایخواستووە ، بەلاّم بۆچی دەبێت لەم کاتەشدا هەمان ئەو سیاسەتە پەیڕەو بکرێت ، ئەم دووبارەبوونەوەش تەنها ببۆوە پیشەی کەم ئەزموونەکان کە تەنیا ڕووەکەکانیش ئەمەیان نەدەکرد ، وەك چۆن لەکاتی پاییزدا گەلاّی ڕووەکەکان دەوەرێت ، بەلاّم لەکاتی بەهاردا ڕووەکەکان لق و پۆپی بەرزتر دەهاون و بەرووبوومی باشتر دەدەن ، هەزار خۆزگە مرۆڤیش ئاوها بووایە و بەردەوام لەهەوڵداندابووایە بۆ باشتر بوون لە پێشووتر و هێنانە کایەی سیاسەتێکی تۆکمەتر .

– ئەوەی باسی ڕابردوو بکات سیاسەتمەدار نیە ؟

– نەخێر ، کەسێکە مێژوو دەگێڕێتەوە ، وەك داپیرەم چۆن چیرۆکەکانی بۆ من دەگێڕایەوە ، تاوەکو خەو بەسەر چاوەکانمدا بێت . بە هەما شێوەش فرووزە ، گەر کەسێك بێت و باسی ڕووداوێك بکات و ئەو باسەشی لە کەسێکی تر وەرگرتبێت ، دواتریش پێی بوترێت سیاسەتمەدار ، ئەوا وەك ئەوە وایە کە هەرچی سمێڵی گەورە بوو پێی بڵێن پیاو ، یان گەر چەکێکی لەژێر پشتێنە بریقەدارەکەی بوو پێی بڵێن شۆڕشگێڕی ڕاستەقینەی وڵات . گەر هەموو کەسێك سیاسەتمەدار بووایە ئەوا وڵات پێویستی بە کەسێك نەبوو تاوەکو خۆی بکاتە پاڵەوانی سیاسی ، یان گەر هەموو کەسێك شۆڕشگێڕ بووایە ئەوا هیچ وڵاتێك پێویستی بە کردنەوەی بنکە و بارەگا نەدەبوو تا شۆڕشگێڕەکان جیابکاتەوە لە کەسانی تر ، ژیانی مرۆڤەکان وا گوزەر دەکات کە هەر شتێك بووترێت یان باوەڕی پێدەکات یان باوەڕی پێناکات ، بەڵام گەر شتەکە درۆ یان هەڵە بێت زیاتر باوەڕی پێدەکات ، بەڵام گەر شتەکە ڕاست بێت ئەوا کەمتر باوەڕی پێدەکات ، ئەمەش بەدرێژایی مێژووی مرۆڤ بەمشێوەیە هاتووە و زۆر گرانە هەڵوگێر بکرێتەوە .

فرووزە ، کاتێك کە توێژینەوە دەربارەی سیاسەتمەداران بکەین ئەوا بۆماندەرکەوت کە لە کەمێك کاری باش و خراپەکاریەکی زۆر هیچی تریان نەکردووە ، ئەوەشمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە سیاسەتمەداران زۆرتر هەوڵی ئەوەدەدەن کە دڵی هاوڵاتیان بەدەستبێنن بۆ بەرژەوەندیەکانی خۆیان ، ئەوەش گرنگ نیە بۆ ئەوان کە چەندین هاوڵاتی دەبنە قوربانی ، بەڵکو ئەوە گرنگە کە مەبەستەکەی ئەوان بێتە دی ، زۆرجاریش ئەوە دەبینین کە ساڵانە باسی هەندێك لە پاڵەوانە کۆچکردووەکان دەکەن ، بە درۆ و هەڵوەراندنی ئەسرینی درۆینەوە ، ئەگینا هیچ کاتێك ئەوانە لەناو هۆشی ئەواندا بوونیان نەبووە و بوونیشیان نابێت ، هەروەها لە دڵی خۆیاندا وا هەستدەکەن کە ئاژەڵێك بوونە و تۆپیوون نەك مردوون ، لەبەر ئەوەی ئەو شتەی کە ئەوان دەیڵێن درۆینەیە ئەوا زۆرترین کەس لەو کاتەدا باوەڕیان پێدەکات .
زۆرجاریش نەمانی پاڵەوانەکان دەکەنە بابەتێك و دەیانەوێت بەکاری بهێنن بۆ دەستکەوتنی زۆرترین لایەنی مادی و کەمترین لایەنی مەعنەوی . گەر سیاسەتمەداران لە هەوڵی ئەوەدا نەبن وڵات بەرەو پێشەوە بەرن و شەهیدەکانی وڵات بە کەسانی پاك و پیرۆز لەقەڵەم بدەن ،

**ئەوا ناپاكترین كەس سیاسەتمەدارەكانن ، هەرچەندێك ئەسرینیش هەڵبڕێژن بۆ هاولاّتیان ، ئەسرین هیچ پەیووەندیەكی بە دڵسۆزیەوە نیە ، بەڵكو كردەوەی بێ كەموكوڕی و خزمەتی گەورە ، دڵسۆزی دەردەخات . وەك دەبینین زۆرێك لە مرۆڤەكان هەوڵدەدەن زۆرترین دڵسۆزی خۆیان بە قسەكردن دەربڕن ، بەلاّم ئەو دڵسۆزیەی ئەوان تەنیا بۆ بەرژەوەندی خودیە یان بۆ بنەماڵەییە یان بۆ بەرژەوەندی كەسانی دۆست دووژمنە ، یەكێك لە تایبەتمەندیەكانی سیاسەتمەداری دواكەوتوو ئەوەیە كە دۆست و دووژمنی خۆی ناناسێت و هەوڵدەدات خۆشی وەك سیاسەتمەدارێكی پڕ ئەزموون خۆی دەربخات ، لەگەڵ ئەوەشدا خۆی بە كەسێكی خانەدانی خاوەن ویژدان دەردەخات . سیاسەتمەداری سەركەوتووش ئەو كەسەیە كە هەموو شتێك دەزانێ و خۆی بە كەسێكی سادە و نەزان دەردەخات .**

**گەر سیاسەتێك ماڵەكەی خۆی پێنەپارێزرێت ئەوا هەرگیز ناتوانێ ولاّتێك بپارێزێت .**

**– هەموو مرۆڤێك دەتوانێت ببێتە سیاسەتمەدار ؟**

**– هەموو مرۆڤێك توانای ئەوەی هەیە ببێتە سیاسەتمەدار ، بەلاّم هەموو مرۆڤێك ناتوانێ ببێتە سیاسەتمەداری دڵسۆز و سەركەوتوو ، گەرەكە هەر مرۆڤێكی سیاسەتمەدار زۆرترین پەروەردەی سیاسی ببینێت و خۆشی توانای سیاسی تێدا هەبێت ، چونكە سیاسەتمەداری بەهرەیەك نیە بە مرۆڤ درابێت ، بەڵكو ئەزموونێكە مرۆڤ بەهۆی ناخۆشی و نەهامەتیەكانی ژیان و دووبارەبوونەوەی ڕۆژانەی خۆی لەناو ئەم ژیانەدا پێیدەگات ، واتە سیاسەت بریتییە لە ئەزموونی مرۆڤ و لەسەر توانای ئەزموونی مرۆڤ وەستاوە ، سیاسەتیش پێویستی بە ڕاوێژ و ئارامگری هەیە و ئینجا هەڵسەنگاندن و شرۆڤەكردن لەلایەن كەسانی شارەزا و دنیا دیتە ، دواتریش بڕیاری لەسەر بدرێت ، چونكە سیاسەتمەدار گەر بەبێ شرۆڤەكردن و ئارامگری بڕیار بدات ئەوا لەوانەیە ولاّت بەرەو نەهامەتی و وێرانی بەرێت .**

**– كەواتە سیاسەتمەدار كەسێكە هەڵسەنگاندن بۆ بارودۆخەكان دەكات و دواتر ڕاوێژ بەكەسانی تری شارەزا دەكات و ئینجا بڕیار بەسەر شتێك یان پڕۆژەیەكدا دەدات كە بە ئەنجام بگات .**

**– بێگومان هەڵسەنگاندن بۆ ئەو كەسانەش دەكات كە پڕۆژەكە ئەنجام دەدەن ، هەموو شتێك پێویستی بە سیاسەتە ، سیاسەتیش پێویستی بە كەسی شارەزا و خاوەن ئەزموون هەیە ، گەر كەسێك ئەزموونی وەرنەگرتبێت دەربارەی ڕابردوو ، ئەوا ئەزموونیشی نابێت بۆ داهاتوو ،**

**ئەوا ناتوانێت ببێتە کەسێکی سیاسی تاوەکو پلان بۆ داهاتوو دابنێت .**

**– زۆرێکیش هەن کە سیاسەت و ئایینیان تێکەڵ بە یەکتر کردووە ، ئایا ئایین و سیاسەت چ پەیووەندیەکیان بە یەکەوە هەیە ؟**

**– ئایین واتە ئایین و سیاسەتیش واتە سیاسەت .**

**– ئەمە مانای چیە ؟**

**– ئایین بریتییە لە بیروباوەڕێك کە هەرگیز پەیووەندی بە سیاسەتەوە نیە ، چونکە ئایین شتێکە پەیووەندی بە دەروونی مرۆڤەوە هەیە ، هەروەها سیاسەتیش بریتییە لە ئەزموونێك کە هەرگیز پەیووەندی بە ئایینەوە نیە ، واتە سیاسەت بەرهەمی هۆشی مرۆڤە ، ئایین واتایەکی تایبەت بەخۆی هەیە و هەرگیز یاسایەکی تێدا نیە باسی سیاسەت بکات ، تەنها سیاسەتی تاکە کەسی لەخۆ دەگرێت . ئەوانەشی بەناوی ئایینەوە سیاسەت دەکەن تەنها بازرگانێکن و هیچی تر نین ، گەر ڕەوشت و ئیرادەی مرۆڤی سیاسەتمەدار بە ئایینەوە بەسترابێتەوە ، ئەوا ئایین شەرمەزار دەبێت ، چونکە هەموو سیاسەتمەدارێك خاوەنی ئیرادە و ڕەوشت نیە ، چونکە زۆرترین سیاسەتمەدار باوەڕیان بە ئایین نیە و لە هەمانکاتیشدا لەوانە دڵسۆزترن بۆ وڵاتەکەیان کە باوەڕیان بە ئایین هەیە ، هەروەها ئەوانەشی کە دەیانەوێت بەناوی ئایینەوە سیاسەت بکەن ئەوا سەرپێچی ئایینەکەی خۆیان کردووە ، چونکە ئایین بۆ ئەو مرۆڤانەیە کە دەیانەوێت بە پاکی بە دنیایەکی تر بگەن . ئایین تەنها پەیووەندی بە نزیکبوونەوەی مرۆڤەوە هەیە لە گەڵ خودادا ، سیاسەتیش پەیووەندی بە داهاتووی وڵات و چارەسەرکردنی بارودۆخە ئاڵۆزەکانەوە هەیە ، چونکە تێکەڵبوونی ئایین بە سیاسەت ئەوا ئایین لەکەدار دەکات و نرخ و بەهای ئایین ناهێڵێت ، هەروەها ئەو شتانەی کە سیاسەتمەدار خۆیان پێوە خەریکدەکات دوورن لە ئایین و لە هیچ شوێنێکدا یەکتر ناگرنەوە ، تەنها لە ڕەوشتدا نەبێت ، بەڵام ڕەوشتی مرۆڤیش تەنها بە ئایینەوە نەبەستراوەتەوە ، بەڵکو هەموو مرۆڤێك بەبێ ئایین دەتوانێ ببێتە خاوەن ڕەوشتی بەرز .**

**– کەواتە ئایین و سیاسەت دوورن لەیەکتر .**

**– گەر خۆمان فریونەدەین ، بەڵێ . سیاسەت و ئایین دووژمنی یەکترن ، چونکە سیاسەت لە وڵاتێکدا تەنها بۆ جڤاکەکەی خۆیەتی و تایبەتە بە داهاتووی هاولاتیانی ئەو ولاتە ، بەلام**

ئایین لە ولاٌتێکدا تەنها بۆ جڤاکەکەی خۆی نیە و بۆ جڤاکی ولاٌتانی تریشە ، کەواتە نابێت سیاسەت و ئایین تێکەڵ بەیەکتری بکرێن ، چونکە ئایین تەنها بۆ دوورکەوتنەوە لە بت پەرستی و ئەو شتانەیە کە زیانبەخشن بۆ لاشەی مرۆڤ ، بەلاٌم سیاسەت بۆ داڕشتنی یاسایەکی تۆکمەیە بۆ داهاتووی ولاٌت و بۆ بەرژەوەندی ولاٌت .

ئایین گۆڕانی بەسەردا نایەت بەلاٌم سیاسەت بەپێی سەردەمەکان گۆڕانی بەسەردا دێت ، گەر ئایین پەیووەندی بە سیاسەتەوە هەبێت ئەوا دەبێت وەك سیاسەت لەگەڵ هاتنی هەموو سەردەمێکدا گۆڕانکاری بەسەردا بێت ، چونکە لەوانەیە ئەو سەردەمەی کە دێت پێویستی بە هەندێك گۆڕانکاری بێت تاوەکو لەگەڵ ئەو سەردەمەدا بگونجێت .

– بەلاٌم ڕەوشت بۆ هەردوو لایان گرنگە .

– بێگومان ، مرۆڤ پێویستە لە هەموو بارودۆخێکی سیاسیدا ڕەچاوی ڕەوشت بکات و بەداهاتووی ولاٌت گەشبین بێت ، لەهەمانکاتیشدا پێویستە لە هەموو بیروبۆچوونەکانیدا خۆی لەوە بپارێزێت کە بازرگانی بە ئایین بکات ، چونکە ئەو شتەی کە ئەو دەیەوێت بەئەنجامی بگەیەنێت لەوانەیە لەکاتی سەرنەکەوتنیدا بە خۆیەوە ئایینیش لەکەدار بکات و نرخ و بەهای ئەو ئایینە لەناو خەڵکدا لاواز بکات .

– سیاسەتمەدار پێویستە بەهۆی ئایینەوە هزرینەکان خۆی بەهێز بکات ؟

– نەخێر ، سیاسەتمەدار پێویستە بەهۆی هزرین و تێفکرینەکانی ڕابردوو و سەردەمی خۆی ، خۆی بەهێز بکات لەبەردەم کەسانی تردا ، نابێت هەوڵی ئەوە بدات کە ئایین بکاتە بنەمای کارەکانی ، چونکە سیاسەت گۆڕانکاری بەسەردا دێت و مرۆڤەکانیش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ شتی تازەتر دادەهێنن کە هیچ پەیووەندیەکی بە ئایینەوە نیە .

گەر ئایینیش نەبوو ، پێویستە مرۆڤ خۆی ئایین درووستبکات بۆ ئەوەی دەروونی خۆی پێ ئارام بکاتەوە . مرۆڤ کۆمەڵێك یاسا و ڕێسای سیاسی داناوە . مرۆڤ هەر خۆی وادەکات کە زیاتر لەشتەکان نزیك بێتەوە و ئینجا بڕیار بەسەر شتەکاندا بدات . ئەو شتەی کە ئەو دەیکات دەبێت بۆ بەرژەوەندی گشتی بێت نەك تایبەتی ، چونکە لەوانەیە زۆرێك لە هاولاٌتیان باوەڕیان بە ئایین نەبێت ، ئەمەش وادەکات کە بڕیارەکە تەنها بۆ چینێك دەربچێت و چینەکەی تریش پشتگوێ بخرێت ، کەواتە سیاسەتمەدار هەرچەندە باوەڕداریش بێت نابێت

بڕیارەکانی ئایینی بن ، بەڵکو دەبێت بڕیارەکانی دوور لە بڕیاری ئایینی بن تاوەکو بۆ هەموو چینەکان وەك یەك بێت . یەکێك لەو شتانەی کە ئایین هەیەتی سنوور دانانە بۆ هۆشی مرۆڤ دەربارەی بوونی خوا و ڕاستی و نا ڕاستی بابەتەکانی ، ئەمەش لەگەڵ سیاسەتدا هەرگیز یەکتر ناگرێتەوە ، ئەوانەی سیاسەت بە ئایینەوە دەکەن پێویستە ئەوە بزانن کە سیاسەت سنووری بۆ هۆشی مرۆڤ دانەناوە ، گەر سیاسەت بە ئایین بکەن دەبێت ئەو یاسایەش بگۆڕن لە ئاییندا کە سنووری بۆ هۆش داناوە وەك فکرکردنەوە لە بوونی خودا و گومانکردن لە دنیای تر و گومانکردن سەبارەت بە بوونی جند و فریشتەکان ، چونکە سیاسەت خۆی پێویستی بە گومانکردن و لێکۆڵینەوە و گریمانەکردنە ، هەروەها هۆشی مرۆڤیش لە سیاسەتدا هیچ سنوورێکی بۆ نیە ، گریمانە و گومانکردنیش لە ئاییندا نابێت هەبێت ، چونکە ئەو شتانە سنووری بۆ دانراوە .

گەر سیاسەت بە ئایین بکرێت ، ئەوا ئایین نابێت سنوور بۆ هۆشی مرۆڤ دابنێت ، چونکە هۆشی مرۆڤ ڕۆژانە شتی تازە بەرهەم دەهێنێت و زۆرجاریش پێویستی بە لە سنوور دەرچوون هەیە تاوەکو بە ئامانجێکی ڕوون بگات . یەکێك لەو تایبەتمەندیانەی کە سیاسەت هەیەتی بریتییە لە پێشبینیکردنی داهاتوویەکی گەش ، ئەمەش لە ئاییندا نابێت هەبێت ، چونکە لە ئاییندا هەر خودا خۆی دەزانێ سبەی چی بەسەر وڵات و مرۆڤەکاندا دێت .

سروشت یان ئایین سیاسەتیان نەئافراندووە ، بەڵکو مرۆڤ بە هۆشی خۆی و بۆ مانەوەی خۆی لەژیاندا سیاسەتی ئافراندووە ، مرۆڤ هەموو کاتێکیش خۆی دانی بەوە داناوە کە درووستبوونی ئایین هیچ دەستێکی مرۆڤی تێدا نیە و بەڵکو لەلایەن خوداوە دانراوە ، مرۆڤ نەیئافراندووە ، بەڵکو بۆ مرۆڤ ئافرێنراوە ، کەواتە هیچ پێویست ناکات سیاسەتکردن بە ئایینەوە بکرێت ، چونکە گەر سیاسەتی ئایینی هەبێت ئەوا ئەو ئافراندنەش پێویستە لەهەمان کاتدا دەستی مرۆڤی تێدا بێت ، چونکە بەرژەوەندیەکانی مرۆڤ وا دەخوازێ زۆر جار دەستکاری هەندێ بنەما بکرێت ، بۆ ئەمەش دەستکاری کردنی ئایین دەستکاریکردنی بەرنامەکانی خودایە ، بۆ ئەمەش گەر ئایین نەتوانرێ دەستکاری بکرێ ئەوا پێویستە لە سیاسەت دوور بکەوێتەوە .

– ئەوەی باوەڕی تەواوی بە ئایین هەیە گەرەکە چۆن بێت ؟

– باوەڕداری ئایین ، گەرەکە پێش سیاسەتکردن بە ئایین ، ئاگاداری ئایین و باوەڕەکەی خۆی

بێت ، چونکە ئایین و سیاسەت دوو شتی لێکجیاوازن و لە هیچ کارێکدا یەکتر ناگرنەوە ، ئایین شتێکە پەیووەندی بە دەروونی مرۆڤەوە هەیە و گۆڕانکاری بەسەردا نایەت ، بەڵام سیاسەت بەرهەمی هۆشی مرۆڤە و لە هۆشی مرۆڤەوە هەڵدەقوڵێ و گۆڕانی بەسەردا دێت ، لەگەڵ ئەوەشدا لەوانەیە هەندێك شت هەبێت هەردووکیان بگرێتەوە ، وەك ڕەوشت ، بەڵام ئەم ڕەوشتەش لەنێوان سیاسەت و ئاییندا جیاوازە ، چونکە ئایین لە سیاسەت زیاتر هەوڵدەدات ڕەچاوی ڕەوشت بکات .

گەر هەموو سیاسەتمەدارێك خاوەن ڕەوشت بووایە ئەوا ژیانی مرۆڤ هیچ لەنگیەکی تێنەدەکەوت و یەکسانی بە شێوەیەکی هەمیشەیی دەمایەوە ، هیچ پێویستیشی بە هاواری مرۆڤ نەبوو بۆ ئازادی و دادپەروەری و یەکسانی .

– ڕەشەن ، هێشتا پرسیارەکانم تینووی وەڵامی ڕاستەقینەن .

– کام ڕاستەقینەیە ؟

– دەمەوێت ئەوەم بۆ ڕوونبێتەوە کە بۆچی سیاسەت سنووری بۆ دانەنراوە ؟ ئایین سنووری بۆ دانراوە ؟ لەناو ئەم دوو پرسیارەشدا هۆشم پرسیارێکی تری درووستکردووە ، پرسیارەکەش ئەوەیە ، بۆچی سیاسەتمەدار زۆرێك لە کاتەکان دوورە لە بنەمای ڕەوشتی و هەمیشە زۆربەی کات خۆی لێ بەدوور دەگرێت ؟

– پرسیارەکانت پێویستیان بە وەڵامێکە کە هەر وەڵامە و خۆی پرسیارێك درووستبکات .

بە باشی بە وورییی گوێیەکانت ڕادێرە بۆئەوەی هەوڵبدەم ئەوەی دەیزانم دەربارەی ئەم پرسیارانەت بۆتی ڕوونبکەمەوە .

– ئادەی بفەرموو . ئەوە گوێیەکانم تەنها قسەکانی تۆ وەردەگرن و هیچی تر .

– سنوور دانان لە ئاییندا واتە کەلەپچەکردنی هۆش ، ئەمەش مانای ئەوەیە کە ئەوەی هەیە هەر ئەوەیە و پێویست ناکات گومان لە هیچ شتێك بکەی ، ناتوانی گومان درووستبکەیت دەربارەی بوون و نەبوون ئافرێنەر و زیندووبوونەوە ، هەروەها ناتوانی لەدەرەوەی ئایین شتەکان بناسی ، چونکە پێیانووایە کە هەرچی هەیە باسکراوە و هیچ شتێکیش نەماوە تا یاسای بۆ دانەنرابێت ، هەموو ئەمانەش وا دەکەن کە ئایین لەناو مرۆڤەکاندا لاواز بێت و بە بابەتێکی نا زانستی لە قەڵەم بدرێت ، ئەوانەی خۆیان دەکەنە سەرداری ئایین دەڵێن هەرچی

**زانسته لەلای ئێمە هەیە ، بەڵام دیسانەوە زانستیش سنووری بۆ دانەنراوە و بەردەوام بە داهێنانی تازەتر خۆی سەرقاڵکردووە ، کەواتە گەر زانست سنووری هەبێت ئەوا ئێمە ناتوانین بگەین بە هیچ تازەگەریەك و مرۆڤ لە کارەکانیدا لە دۆخی خۆی دەوەستێ .**

**– بەڵام ئایین سنووری بۆ زانست دانەناوە .**

**– هەموو زانستێك نا ، بەڵکو هەندێك زانست .**

**– نمونەت بۆ ئەمە چیە ؟**

**– کاتێك مرۆڤ شتێك درووستدەکات ، لەوانەیە لەسنووری ئایین دەربچێت . ئەو کاتە ئەمەش دەبێتە دژی ئایین . بەڵام بۆ ئەوەی ئایین جوان بێت پێوویستە سنوورەکانی لەبەردەم هۆشدا بکاتەوە و خۆی بکات بە ماڵی بێ دەروازە و هەموو کەسێك بچێتە ناوی و بێتە دەرەوە ، مرۆڤەکانیش بۆیە زیاتر پابەندی بنەما ئایینیەکان دەبن تاوەکو لە هەندێك کاری قێزەون خۆیان بپارێزن ، ئەمەش پەیووەندی بە سیاسەتەوە نیە ، بەڵکو پەیووەندی بە ڕەوشتەوە هەیە .**

**پێویستە مرۆڤ ئازاد بێت لە هەموو هزرین و لێکۆڵینەوەیەکدا ، هەروەها هزرینەکانیشی پێویستە لەناو ئاییندا ئازاد بێت ، چونکە سنوور دانان لەبەرامبەر هزراندن بۆ شتەکان ، ئەوا زانین هەر ئەو زانینە دەبێت کە پێشتر هەبووە و هزرین و زانینی تازە بوونی نابێت . لەناو ئایینیشدا سنوور دانان بۆ هزرین و هۆشی مرۆڤ پابەندبوون بە ئایین کەمدەکاتەوە و زیاتر بەرەو لەکەدارکردنی دەبات . پێویستە ئەوانەی سیاسەت بە ئایینەوە دەکەن پێشتر ئەوە بزانن کە ئایین هیچ پێویستیەکی بە سیاسەت نیە تاوەکو سەربکەوێت ، چونکە سیاسەت تەنها بۆ ئایینێکە کە لاواز بێت و نەتوانێت مرۆڤەکان بەلای خۆیدا پەلکێش بکات ، سیاسەتکردن بە ئایین ئاستی لاوازی ئایین دەردەخات ، نەك بەهێزی ئایین .**

**– ئایینە لاوازەکان پێویستیان بە سیاسەت هەیە ؟**

**– ئایینی لاواز بەبێ سیاسەت کەمتر کاریگەری لەسەر مرۆڤەکان دەنوێنێ ، بۆئەوەی بناسێنرێت ئەوا پیویستە سیاسەتی پێوەبکرێت ، بەڵام ئەو کاتەی کە ناسرا لەناو مرۆڤەکان پێویستە خۆی لە سیاسەت بەدوور بگرێ ، چونکە هیچ بنەمایەکی ئایین پەیووەندی بە سیاسەتەوە نیە ، سیاسەتی ئەمڕۆ جیاوازە لە سیاسەتی سبەی ، بەڵام ئایینی ئەمڕۆ جیاواز**

نیە لە ئایینی سبەی و ئایین ئەمڕۆ یان سبەی هەر ئەو ئایینەیە و ناتوانرێت یاسا و ڕێساکانی کەمبکرێنەوە یان زیاد بکرێن ، بەلأم بنەماکان لەناو سیاسەتدا بەپێی بەرژەوەندی ولأت دەستکاری دەکرێن و وەکو خۆیان نامێننەوە . گەر ئایین ڕازیبێ بە سیاسەت ، ئەوا پێویستە بە دەستکاریکردنیش ڕازیبێ .

سنوور دانان واتە هیچ شتێکی تر نەماوە تا تۆ بتوانی فکری لێبکەیتەوە ، ئەوەی هەیە وتراوە و هیچ شتێك نەماوە قسەی لەسەر نەکرابێ ، بەلأم بە پێچەوانەوە زۆر شتی تر ماوە بزانرێ هەتا لەناو ئایینیشدا شتی تر ماوە بزانرێت .

سیاسەت ناتوانێ سنوور بۆ مرۆڤ دابنێ ، چونکە سروشتی هەموو ولأتێك وا دەخوازێ کە سیاسەت و ڕۆژگار بەیەکەوە گرێبدات ، گەر ئەمەش سنووری بۆ دابنرێ ، هەموو ولأتێك شارەزای سیاسەتی یەکتر دەبن و لە هەنگاوەکانی یەکتر شارەزا دەبن ، ئەمەش زیانێکی گەورەی لێدەکەوێتەوە ، بۆ ئەوەشە کە سیاسەت نابێت هەمان ئەو سیاسەتەی پێشووتر بێت ، پێویستە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ سیاسەتمەدار و کەسانی سیاسی بەتواناتر دەربکەون لەپێناو داهاتووی ولأت و بەرژەوەندی هاولأتیانی ناو جڤاك ، ئەمەش لە ئاییندا جێبەجێ ناکرێت ، چونکە مرۆڤەکان لەگەڵ ئەوەدا نین کە ئایینێکی تر دەربکەوێت ، پێیانووایە کە ئایینی باشتر لەم ئایینەی ئێستا درووست نابێت .

مرۆڤی سیاسی زۆربەی کات ڕەوشتی خۆی لەدەستدەدات ، چونکە گەر ئەمە نەکات ئەوا لەوانەیە زۆربەی کاتەکان سەرکەوتن بەدەست نەهێنێ ، مرۆڤە سیاسیەکان چەند جۆرێکن .

ئەوانەی کە لەپێناو خودی خۆیاندا سیاسەت دەکەن و سیاسەتەکەیان بۆ تایبەتیە و بۆ گشتی نیە ، ئەوانە ئەو سیاسەتمەدارانەن کە هیچ کات لە ڕەوشت نزیك نین و دووژمنایەتیان لەگەڵ ڕەوشتدا هەیە .

ئەوانەشی لەپێناو چینێکدا هەوڵدەدەن و چەند چینێکی تر وەلادەنێن ، ئەمەش هەر سیاسەتێکی تایبەتیە و گشتی نیە ، چونکە سیاسەت بۆ ولأتە بە گشتی نەك بۆ چینێکی ولأت بە تایبەتی ، ئەمەش بە هەمان شێوە دووژمانیەتی لەگەڵ ڕەوشتدا هەیە .

ئەوانەی کە لەپێناو گشتیدا سیاسەت دەکەن ، بەلأم لە ژێرەوە بۆ تایبەتی هەوڵدەدەن ، کەواتە ئەوانە هەم بێڕەوشتن و هەم دووڕوون .

ئەوانەی کە سیاسەت بۆ وڵات دەکەن و لەپێناو گشتێتی هەوڵدەدەن و دڵسۆزن ، ئەوانە سیاسەتمەدارێکی ڕەوشت بەرزن ، بەڵام زۆربەی کاتەکان لەناو بەندیخانەدان یان هەژارن ، یان دەکوژرێن یان زوو لەتاو خاکەکەیان مووی سەریان سپی دەبێت .

فرووزە ن چیایەکی بەرز هەبوو لەناو لادێیەکەی ئێمەدا ، ڕۆژێك هەستام بەرەو سەر لوتکەی چیایەکە بەڕێکەوتم ، سێ هەنگاوم نا بۆ سەرەوە و لەپڕ پێیەکانم سڕ بوون ، ناچار لە شوێنی خۆم دانیشتم ، لەو شوێنەوە سەیری خوار چیایەکەم کرد .

بینیم مرۆڤێك چەند نەمامێکی دەناشت ، هەورەکانیش تاو تاو دەهاتن و هەڕەشەیەکیان لە زەوی دەکرد و دەڕۆیشتن ، پەپوولەکانیش لە ترسان خۆیان خستبۆوە ژێر گەڵای دارەکان و لەناو خۆیاندا کێشەیان بۆ درووست ببوو ، خونچەکانیش چاوەڕێی ئەوەبوون کە کێشەکە کۆتاییی پێبێت و بە میوانی بچنە لایان ، چونکە زستانی زۆردار ماوەیەکی زۆر لەیەکتری دابڕیبوون و نەیدەهێشت تەنانەت شوێنی یەکتریش بزانن ، هەروەها تەواوی سنوورەکانی لەنێوان داخستبوون ، هەموو ئەمانەش مانایەکیان دەدا بەدەستەوە ، کە تاو تاو لەناو هۆشی مندا دەنگی دەدایەوە و دەیوت ؛ ئەوەی گاڵتە بە پیربوون بکات ئەوا لەسەرەنجامدا خۆشی بەو پیریە دەگات و ئاخ بۆ کاتی لاوی هەڵدەکێشێ ، دووڕوو و درۆزنەکانیش هەروەها لوت بەرزەکانیش بە هەمان شێوە بەو ڕۆژە دەگەن ، ئەوانەشی کە بەڵێنەکانیان نابەنە سەر لە ئەمان خراپتریان لێدێت . هەموو ئەمانەش گۆشەیەکی هۆشمیان بۆ خۆیان داگیرکردبوو ، ناوە ناوەش دەهاتنە سەر ڕێگەم و دیمەنەکانیان لە فکر دەبردمەوە ، چونکە بێدەنگ بوون لە شتە ڤێزەونەکان ببۆوە تاوانێك کە نەدەبوو باسکردنی خەفە بکرێت ، ئەوانەشی پیشە و کاریان ببۆوە ئەمە ئەوا ببوونە کۆسپ وەك چەپەری باخ و نەیاندەهێشت جگە لە خاوەنەکەی کەسی تر بێتە ناو باخ و بۆنی گوڵە بەیبوونەکان بکات ، لەکاتێکدا ڕۆژگار ئەم گوڵە بەیبوونانەی بۆ هەموو کەسێك ئافراندبوون ، گوڵەکان خۆشیان لە تاکە کەسێك بێزار بوون و چاوەڕێی زیاتریان دەکرد بۆ ناسین و ئاشنابوون ، بەڵام چ ئاشنایەتیەك ، لەکاتێدا تەواوی چواردەوری باخ بە دڕك گیراوە و تەنانەت مێشوولەیەك ناتوانێ لەناویدا ویزەویز بکات ، چونکە دەگەنە سەری و تاکە پێڵاوێکی بە بنی گوێ دەکەوێ ، بەبێ ئەوەی کاتی مردنی خۆی هاتبێ ماڵئاوایی پێ لە ژیانی سپڵە دەکەن .

یەکسانی لەنێوان ژن و پیاودا ببۆوە بنێشتێك لەناو دەمی مرۆڤەکاندا کە نە بنێشتەکە بەسەردەچوو نە دەمیش لە جونی ماندوو دەبوو ، هەر مرۆڤە و خۆی یاسایەکی بۆ ئەم یەکسانیە دادەنا ، ئەمانەش یان مرۆڤە ئایینیەکان بوون یان پیاو ماقوڵەکان بوون ، ئەم جۆرە یەکسانیەی ئەوان باسیان لێوە دەکرد تەنها بەپێی ئارەزووە جەستەییەکانی خۆیان بوو .

گەر ژن لە سیاسەتدا یەکسان بێت لەگەڵ پیاودا ، ئەوا ژنیش مافی خۆیەتی ببێتە سەرۆك .

گەر ژن و پیاو یەکسان بن لە ئایینیشدا ، ئەوا ژنیش مافی خۆیەتی ببێتە پێشەوای ئایینی .

ئەوانەی کە باسی یەکسانیان دەکرد خۆیان لە هەموو کەس نا یەکسانتر بوون .

هێشتا پێیەکانم بەتەواوەتی نەهاتبوونەوە سەر باری پێشووی خۆیان ، ناوە ناوە فکرم لە یەکسانی نێوان پێیەکانی خۆم دەکردەوە ، هەستمدەکرد کە پێیەکانم لە سڕبووندا جیاوازن ، یەکێکیان زیاتر سڕ بووە لەوی تر ، هەربۆیە بۆ ئەم جۆرە یەکسانیەی پێیەکانم لەگەڵ یەکسانی نێوان ژن و پیاودا بەراورد دەکرد ، چونکە ژن و پیاویش لەلای من ببوونە دوو قاچ و بەردەوام بەیەکەوە بوون ، بەڵام لەیەکتر دوور بوون . تەنها بۆ ئارامی لە یەکتر نزیك دەبوونەوە . بۆ ئەمەش بە ڕوونی بۆم دەرکەوت  کە لە نێوان ژن و پیاودا یەکسانی تەنها بە زمان هەیە ، بەڵام یەکسانی نێوانیان بە کردەوە لەژێر گڵدا خۆی مەڵاس داوە ، دنیای مرۆڤ ئا بەم شێوەیە درێژەی هەبوو ، هەرچەندە ژن کردەوەی سیاسی باشتر بوو لە پیاو ، چونکە بڕیارەکانی ژن لە دڵەوە بوون ، بەڵام بڕیارەکانی پیاو لە ئارەزووەکانی جەستەییەوە بوون ، هەروەها لە ئاییندا باوەڕی ژن باشتر بوو لە باوەڕی پیاو چونکە پیاو هەوڵیدەدا لە دەرەوە باوەڕەکەی بۆ جڤاك دەربخات ، بەڵام ژن هەوڵیدەدا بە شاراوەیی و دوور لە چاوی جڤاك باوەڕەکەی بۆ خودا دەربخات ، مانەوەی سیاسەت و سەرکەوتنی شۆڕشیش هەموو کاتێك پێویستی بە توانا و هاندانەکانی مێینە هەبوو ، چونکە نێرینەکان بەردەوام ترس و لەرزیان کەوتبۆوە ناو لاشەوە .

هەربۆیە ژن وەك ئەو مێرووولەیەی لێهاتوبوو ، کە بارێکی گرانی هەڵگرتبوو ، گەر لەگەڵ خۆیدا بەراوردت بکردبایە ، ئەوا سێ ئەوەندەی خۆی دەبوو ، لەولاشەوە مێرووولەیەکی تر هات کە سەر بەهەمان شاری خۆی بوو ، بارەکەی لەگەڵ هەڵگرت تا گەیاندیەوە ناو شار ، لەمەشەوە بۆم دەرکەوت کە میهرەبانی مرۆڤ هیچ پەیووەندیەکی بە ئایینەوە نیە ، بەڵکو میهرەبانی

**مرۆڤەکان پەیووەندی بە دڵ و دەروونی مرۆڤەکان خۆیانەوە هەیە .**

**ڕۆژێکیش گوێم لێبوو کە دایکێك ئامۆژگاری منداڵەکەی دەکرد و دەیووت ؛ کۆرپەکەم لە هەموو کارێکدا خۆت لە پەرش و بلاّوی بپارێزە ، چونکە شتەکان بە پەرش و بلاّوی نابن بە هیچ . نە بڕیاری خراپە و نە بڕیاری چاکە بەسەر هیچ کەسێکدا مەدە تاوەکو بە ڕوونی چاکە و خراپەکان نەبینی .**

**منیش لەوکاتەدا وتەیەکی دایکم بە فکر هاتەوە کە دەربارەی چاکە و خراپە پێیووتم .**

**– دایکت چی پێوتی دەربارەی چاکە و خراپە ؟**

**– دایکم پێی وتم ؛ گەر هەموو مرۆڤێك پاك بووایە ئەوا دۆزەخ بەبێ بەرهەم دەمایەوە . گەر هەموو مرۆڤیش خراپ و ناپاك بووایە ئەوا بەهەشتیش بەبێ داواکاری دەمایەوە .**

**فرووزە ، ئەوانەی کە پێیانوایە تەنیا ئەوان دەزانن ئایین شیبکەنەوە ئەوا لەژێرەوەی دەریادان و هێشتا ماویانە ماسی سەیروسەمەرەتر ببینن ، چونکە ئەوەی ئایینی ئافراند و لەسەرتاپای زەوی بلاّویکردەوە گەورەترین هونەرمەند بوو ، تا ئێستاش سەدای شمشاڵەکەی هەر دێت ، هۆشی مرۆڤیش هەر لەسەرەتاوە جێگەیەکی هەبووە بۆ میوانداری خودا ، بەلاّم نەیتوانیووە بەباشی بیناسێت و هەردەم ترسی لێی هەبووە ، ئەم ترسەش وایکردووە کە هەرگیز نەتوانێ بەباشی لێی تێبگات و بتوانێت بنەماکانی شیبکاتەوە .**

**شتێکی تریشی پێووتم ؛ کە هەرگیز ئایینزانەکان خۆشیان ئەو ترسەیان هەیە ، هەربۆیە ئەوانیش تەنها ئەوەندە دەزانن کە بیستوویانە ، ئەوەشی نەیانبیستووە ئەوا نایزانن . هەروەها پێیووتم ؛ کە ڕێگە نەدەم هەرگیز کەسانی ئایینی ئامۆژگاریم بکەن ، چونکە ئەو پێیوابوو بەرەو گەمژەیی و ماڵ وێرانیم دەبەن ، ئایین بۆ ئەوەی جوانی و پیرۆزی خۆی دەربخات ئەوا پێویستە ئافرەت وەك مرۆڤێکی تەواو و خاوەن ئەزموون سەیر بکات .**

**– بۆچی مرۆڤەکان هەموو کاتێك بەدوای شتێکدا خۆیان وێڵ دەکەن و ناشتوانن لە شتەکەش تێبگەن ؟**

**– ئەمە ئاشتی و ئازادیە کە تۆ دەتەوێت باسی لێوە بکەی ، ئەوانەی بەدوای ئاشتیدا وێڵن سەرەتا ناخۆشیەکی زۆر دەچێژن ، بەلاّم کاتێك کە پێی دەگەن ئەوا وەك ئەوە وایە کە لەسەر زەوی نەمابن و گەیشتبن بە هەسارەیەکی نوێ ، چونکە ئەوکاتە ئەسرینی هیچ کۆیلەیەك**

**نابینن و ماسیەکانیش لەسەر تەختەی کەشتیەکان دەخلیسکێنە ناو ئاوی دەریاوە و بە ئازادی خۆیان دەگەن ، ئەو کاتەش بۆ مرۆڤەکان دەردەکەوێت کە ڕەوشتی دەسەلأت و ئازادی ئافرەت گەورەترین پێوەرن بۆ بوونی ولأتێکی یەکسان و سەرۆکێکی دادپەروەر .**

